تشرينی یەکەم
2004
ســــــاڵی شەشەم

# سەردەم

35

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی

- سەردەم گۆڤارێکە بە دوو مانگ جارێك دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانی کەلتووری بیانی لە بواری فەلسەفە و فیکر و ڕەخنە و لێکۆڵینەوە و داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا.
- تکایە ئەو بەرهەمانەی بۆ سەردەمی دەنێرن، ناوی نووسەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتارە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێت، لەسەر دیوێکی پەڕەکە نووسرابێتەوە یان کۆمپیوتەر کرابێت. پەراوێز و سەرنجەکانیش لە کۆتایی وتارەکەدا هەبن. ئەگەر یەکێك لەو مەرجانە نەهاتنە دی دەستەی نووسەران مافی بڵاونەکردنەوەی هەیە و پێشەکی داوای لێبوردن لە وەرگێڕی بەڕێز دەکات.
- بەرهەمەکان بڵاوبکرێنەوە یان نەکرێنەوە نادرێنەوە بە خاوەنەکەی.
- هەموو پەیوەندییەك لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت.

خاوەنی ئیمتیاز: **شێرکۆ بێکەس**

سەرنووسەر: **ڕەووف بێگەرد**

بەڕێوەبەری نووسین: **هەڵکەوت عەبدوڵلا**

دەستەی نووسین

**ڕێبین هەردی**

**شوان ئەحمەد**

**شاهۆ سەعید**

دەرهێنانی هونەری: **قادر میرخان**

مۆنتاژی کۆمپیوتەری: **تاڤگە فائق**

## ناونیشان

سلێمانی – فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن/ سەرنووسەر 3130347

دەزگای سەردەم 3129609

**بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە**

Tel - Fax: 0044 7543129839

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی

ژمارە ( 14665/615و 14665/616) تاران

**لە ڕێگەی ( ئیمەیل )ەوە:**

www.sardam.info

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە

# ناوەڕۆك

## فیكر و فەلسەفە



## ڕەخنە و لێكۆڵینەوە



## گفتوگۆ



## لە ئەدەبی گەلانەوە



## فایلی ژمارە (مۆدێرنە)

## □ وێستگەكانی سەردەم



**نرخی (1200) دینارە**

# فیکر و فەلسەفە

- بۆچی من مەسیحی نیم

بێرتراند ڕوسێل

لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد

- جان بودان (1530-1596)

د. موسا ئیبراهیم

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

- سەرەتاکانی فەلسەفەی مێژووی بۆرجوازیی

ماکس هۆرکهایمەر

لە عەرەبییەوە: سامان عەلی

- پاشەکشەی مرۆڤی عاقڵ

عەلی حەرب

لە عەرەبییەوە: عەدالەت عەبدوڵڵا

# بۆچی من مەسیحی نیم

**بیرتراند روسێل**

لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد

هەروەك بەڕێوەبەرەكەتان پێی ڕاگەیاندن، ئەمشەو لەسەر ئەم بابەتە دەدوێم: "بۆچی من مەسیحی نیم". لەوانەیە باشتر وابێت، پێش هەموو شتێك هەوڵبدەم مانای زاراوەی مەسیحی روون بكەمەوە. چونكە زۆر كەس بە مانایەكی یەكجار نادروست بەكاری دەهێنن. بەلای هەندێك كەسەوە، تەنها ئەو كەسە دەگرێتەوە كە هەوڵ دەدات ژیانێكی چاك بگوزەرێنێت. بە بڕوای من، ئەگەر ئەم مانایە ڕاست بێت، ئەوا مەسیحییەت لە هەموو پێڕەو و باوەڕێكدا هەیە، وەلێ بە بۆچوونی من ئەمە مانای گونجاوی وشەكە نییە، چونكە مانای ئەوەش دەگەیەنێت كە هەموو ئەو خەڵكانەی مەسیحی نین.. هەموو بوداییەكان[1]، كۆنفۆشیۆسییەكان[2]، موحەمەدییەكان، هتد.. ئەوانە هیچ كامێكیان هەوڵ نادەن ژیانێكی چاك بگوزەرێنن. بۆیە مەبەستی من لە مەسیحی كەسێك نییە كە هەوڵبدات بە پێی دیدی خۆی ژیانێكی شكۆدار و بەڕێز بگوزەرێنێت. پێموایە بەرلەوەی مافی ئەوەتان هەبێت بڵێن ئێمە مەسیحین، پێویستە چەند باوەڕێكی دیاریكراوتان هەبێت. ئێستا وشەكە ئەو مانا دیاریكراو و كامڵەی نەماوە كە لە سەردەمی سانت ئۆگەستین[3] و سانت تۆماسی ئەكوینیدا[4] هەیبووە. لەو سەردەمانەدا، ئەگەر پیاوێك بیوتایە من مەسیحیم، یەكسەر دەزانرا مەبەستی چیە. پێیان دەووت دیارە تۆ كۆمەڵێك باوەڕت بەسەر یەكەوە پەسەندكردووە، هەموویان بە تۆكمەیی داڕێژراون، تۆش بەوپەڕی قەناعەتی خۆتەوە یەكە یەكەی باوەڕەكانی ئەو ئایینەت پەسەندكردووە كە بڕوات پێ هێناوە.

### مەسیحییەت چیە؟

بەڵام لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا، مەسەلەكە بەو جۆرە نیە. ئێستا وشەی مەسیحی كەمێك تەژمی و لێڵی لێنیشتووە.. بە بۆچوونی من، هەموو ئەو كەسانەی بە خۆیان دەڵێن مەسیحی، دوو بۆچوونی زۆر بنەڕەتییان هەیە. یەكەمیان بۆچوونێكی دۆگماییانەیە[5]. پێویستە لەسەرت باوەڕت بە یەزدان و نەمری هەبێت. ئەگەر باوەڕت بەم دووانە

نەبێت, بڕوا ناكەم بتوانیت بە دروستی خۆت بە مەسیحی لە قەڵەم بدەیت. سەرباری ئەوەش, وەك ناوەكە ئاماژەی بۆ دەكات, پێویستە جۆرە باوەڕێكیشت بە مەسیح هەبێت. چونكە موحەمەدییەكانیش[6], بۆ نمونە, باوەڕیان بە خوداو نەمری هەیە, بەڵام ئەوان هەرگیز بە خۆیان ناڵێن مەسیحی. پێویستە لانیكەم دان بەوەدا بنێیت كە مەسیح, ئەگەر خۆی یەزدان نەبێت, ئەوا لانیكەم باشترین و داناترین مرۆڤە. ئەگەر باوەڕت بەمەندە نەبێت دەربارەی مەسیح, ئەوا بڕوا ناكەم بە هیچ جۆرێك مافی ئەوەت هەبێت بە خۆت بڵێیت مەسیحی. مەسیحییەت, مانایەكی تریشی هەیە كە دەتوانیت لە ئۆلماناكەكانی[7] وایتكەر و لەناو وانەكانی جوگرافیاشدا بیدۆزیتەوە, لەوێدا دەوترێت خەڵكی سەر زەوی دابەشدەبن بۆ مەسیحی، موحەمەدی، بوداییەكان، فێتشییەكان[8] و هی تر. ئا بەو مانایە ئێمە هەر هەموومان مەسیحین، چونكە كتێبە جوگرافییەكان وامان لە قەڵەم دەدەن, بەڵام ئەمە تا رادەیەك مانایەكی جوگرافییە, بۆیە دەتوانین پشتگوێی بخەین. كاتێك دەڵێم بۆچی من مەسیحی نیم, دەبێت دوو شتی جیاوازتان بۆ روون بكەمەوە: یەكەم, بۆچی باوەڕم بە خوداو نەمری[9] نییە. ئینجا دووهەم, بۆچی پێموانییە مەسیح باشترین و داناترین ئادەمیزاد بووبێت, گەرچی لای من پلەیەكی بەرزی ئاكارچاكیشی هەیە.

من نەمتوانیوە پێناسەیەكی جیڕ و قابیلی كشانی وەك ئەوەی سەرەوە بۆ مەسیحییەت هەڵبگرمەوە. هەر وەكو پێشتر وتم, لە رۆژانی دێریندا مانایەكی زۆر پڕاوپڕی هەبووە. بۆ نمونە, مەسیحییەت باوەڕبوون بە دۆزەخیش دەگرێتەوە. هەتا ئەم نزیكانە, باوەڕبوون بە ئاگری ئەبەدی و هەتاهەتایی دۆزەخ یەكێك بووە لە بنەما سەرەكییەكانی مەسیحییەت. وەك خۆشتان دەزانن, لەم سەدەیەدا, بە هۆی بڕیارێكی ئەنجومەنی پرایڤییەوە[10], چیتر باوەڕبوون بە دۆزەخ بنەمایەكی سەرەكی نییە, هەر لەو بڕیارەشەوە سەرئەسقەفی كانتەربێری[11] و یۆرك جیابوونەوە، بەڵام لەم سەدەیەدا ئایینەكەمان بە هۆی یاسای پەرلەمانەوە سەقامگیركراوە, لەبەر ئەوە ئەنجومەنی پرایڤی توانی بڕیاربدات چیتر پێویست ناكات باوەڕت بە دۆزەخ هەبێت، بۆ ئەوەی بە مەسیحی دابنرێیت. بۆیە منیش جەخت ناكەم لەسەر ئەوەی پێویستە مرۆڤی مەسیحی باوەڕی بە دۆزەخ هەبێت.

### بوونی خودا

با بێینە سەر پرسیاری هەبوونی خودا: ئەمە پرسیارێكی زۆر گەورەو بایەخدارە, ئەگەر بمەوێت بە هەر شێوەیەكی راشكاوانە و راستەوخۆ دەستی بۆ ببەم, ئەوە پێویستە هەتا رۆژی قیامەت لێرەدا بتانهێڵمەوە, كەواتە لێم دەبورن ئەگەر تا رادەیەك بە شێوەیەكی كورت و پوخت بۆی بچم. بێشك ئێوە دەزانن كەنیسەی كاسۆلیكی وەك دۆگمایەك پێیوایە دەتوانرێت بە هۆی عەقڵەوەو بێ یاریدەی هیچ شتێكی تر بوونی خودا بسەلمێنرێت, ئەمە تا رادەیەك دۆگمایەكی پڕووپووچ و بێبایەخە, بەڵام یەكێكە لە دۆگماكانی ئەوان. ئەوان ناچاربوون وا بڵێن, چونكە لە سەردەمێك لە سەردەمەكاندا, بیریارە ئازادەكان دەیانووت عەقڵ لە توانایدا هەیە دژی بوونی خودا ئارگیومێنت بكات, بێشك ئەوان وەكو مەسەلەی باوەڕ پێیانوابووە كە خودا بوونی هەیە، بەڵام ئارگیومێنت و ئاوەزكارییەكان زۆر بە درێژیی سەریان هەڵداو زۆریان خایاند. كەنیسەی كاسۆلیكی هەستی كرد كە پێویستە سنورێكیان بۆ

دابنێت. بۆیە گریمانەی کرد کە عەقڵ خۆی بە بێ یاریدەی هیچی تر دەتوانێت بوونی خودا بسەلمێنێت, دیارە پێویست بوو ئەوان ئەو ئارگیومێنتانە دیاریی بکەن کە بوونی خودا دەسەلمێنن. ژمارەیەك لەو ئارگیومێنتانە لە ئارادا هەن, وەلێ من تەنها هەندێکیان وەردەگرم.

## ئارگیومێنتی دروستکەری یەکەم

رەنگە سادەترین و ئاسانترین ئارگیومێنت, ئارگیومێنتی یەکەمین دروستکەر بێت[12] (زانراوە کە هەموو ئەو شتانەی لە جیهاندا دەیانبینین, هەر یەکەی دروستکەرێکیان هەیە, کاتێك بە زنجیرەی دروستکەرەکاندا زیاتر و زیاتر بەرەو دواوە دەگەڕێینەوە, دەگەینە سەر یەکەمین دروستکەر کە ئیتر پێش ئەو هیچ دروستکەرێکی تر لە ئارادا نییە, ئەو یەکەمین دروستکەرەش ناو دەنێین خودا). پێموایە, ئێستا ئەو ئارگیومێنتە سەنگێکی وەهای نەماوە, چونکە بە پلەی یەکەم زاراوەی دروستکەر بە تەواویی ئەو مانایە ناگەیەنێت کە ئەوان بەکاریان هێناوە. پاشان فەیلەسوفان و پیاوانی زانست, لەم ئارگیومنتەیان کۆڵیوەتەوەو بۆیان دەرکەوتووە کە هێز و تۆکمەیی تێدا نییە. جگە لەمەش, دەتوانن بە سانایی ببینن کە ئارگیومێنتی یەکەمین دروستکەر هیچ ماقوڵییەکی تیا نیە. بیرم ماوە, کاتێك پیاوێکی لاو بووم و لە مێشکی خۆمدا ئەم مشتومڕانەم زۆر لێکدەدایەوە, بۆ ماوەیەکی درێژ ئارگیومێنتی یەکەمین هۆکارم لا پەسەند بوو, هەتا رۆژێکیان لە تەمەنی هەژدە ساڵیمدا, سەربوردەی ژیانی جۆن ستیوارت میلم[13] خوێندەوەو ئەم رستەیەم تێدا بینی: "باوکم فێری کردووم کە پرسیاری "کێ منی دروست کردووە؟" پرسیارێکی بێ وەڵامە, چونکە ئەو پرسیارە یەکسەر پرسیاری "کێ خودای دروستکردووە؟" بە دوای خۆیدا دەهێنێت. ئەو تێڕوانینە زۆر سادەیە پیشانی دام, وەك تا ئێستاش باوەڕم وایە, کە ئارگیومێنتی یەکەمین دروستکەر هەڵەیە. ئەگەر هەموو شتێك دروستکەری هەبێت, ئەوا پێویستە خوداش دروستکەری هەبێت, بۆیە ئەو ئارگیومێنتە بێسودە. رێك وەکو تێڕوانینی پیاوە هیندووەکە[14] وایە, کە دەڵێت جیهان لەسەر پشتی فیلێك راگیر بووەو فیلەکەش لەسەر پشتی کیسەڵێك راوەستاوە, کاتێك لێی دەپرسن "ئەی کیسەڵەکە؟" یەکسەر دەڵێت "با بابەتەکە بگۆڕین". ئەم ئارگیومێنتەش لە راستیدا هیچ لەوە باشتر نییە. هیچ هۆیەك لە گۆڕێ نییە بۆ ئەوەی کە رێی تێ نەچێت جیهان بە بێ هیچ دروستکەرێك بوونی هەبێت, هەروەها بە بارەکەی تریشدا, ئایا هیچ هۆیەك هەیە بۆ ئەوەی نەهێڵێت جیهان هەمیشە هەر هەبووبێت. لە راستیدا هیچ هۆیەك نییە بۆ ئەوەی گریمانە بکەین کە جیهان سەرەتایەکی هەیە. بیرۆکەی ئەوەی کە پێویستە شتەکان سەرەتایان هەبێت, شتێکە پەیوەندیی بە هەژاریی و کورت بڕیی ئەندێشەمانەوە هەیە. بۆیە, رەنگە پێویست نەکات هیچ کاتێکی لەوە زیاتر بە ئارگیومێنتی دروستکەری یەکەمەوە سەرف بکەم.

## ئارگیومێنتی یاسای سروشتی

ئینجا ئارگیومێنتی زۆر باوی یاسای سروشتی دێت. بە درێژایی سەدەی هەژدەیەم ئەمە پەسەندترین ئارگیومێنت بووە, بە تایبەتی لە ژێر کاریگەریی سێر ئیزاك نیوتن[15] و کۆزمۆلۆجیاکەیدا. خەڵك سەرنجیان دا کە بە پێی یاسای کێشکردن, هەسارەکان بە دەوری خۆردا دەسوڕێنەوە, پێیانوابوو کە خودا فەرمانی بەو هەسارانە کردووە تا بەو شێوە دیاریکراوە

بسوڕێنەوە, بۆیە ئەوانیش ئاوا دەکەن. ئەوە لێکدانەوەیەکی سادە بوو, خەڵکی رزگار کرد لە گرفتی ئەوەی زیاتر لە یاسای کێشکردن ورد ببنەوە و روونی بکەنەوە، بەڵام ئیمڕۆ ئێمە بە شێوەیەکی زۆر ئاڵۆز لە یاسای کێشکردن دەکۆڵینەوە, واتە ئەوەی ئاینشتاین[16] دایهێناوە. من نامەوێت وانەیەك دەربارەی یاسای کێشکردن بڵێمەوە, بەو شێوەیەی ئاینشتاین لێکی داوەتەوە, چونکە ئەمەش دیسان کاتێکی زۆری دەوێت, هەرچۆنێك بێت ئێستا ئەو چەشنە یاسا سروشتییە نەماوە کە لە سیستمە نیوتنییەکەدا هەبوو, ئەو پێیوابوو سروشت بە شێوازێکی یەکگرتوو رەفتار دەکات. کەچی بۆمان دەرکەوتووە ژمارەیەکی زۆر لەو شتانەی کە وامانزانیوە یاسای سروشتین, لە راستیدا بۆچوونی ئادەمیزاد خۆی بوون. هەموومان دەزانین کە تەنانەت لە قوڵترین خاڵی ئاسمانی ئەستێرەکاندا, سێ فووت دەکاتە یەك یاردە. گومانی تێدا نییە کە ئەمە سەرنجێکی زۆر گرنگە, بەڵام زەحمەتە پێی بڵێیت یاسای سروشت. زۆر شتی تریش کە وەکو یاسای سروشت لە قەڵەم دراون و هەموویان لەم جۆرەن. لە لایەکی تریشەوە, کاتێك بتوانیت بە ناو گەردیلەدا رۆبچیت و بزانیت بە راستی چی روودەدات, ئەوا بۆت دەردەکەوێت کە گەردیلەکان زۆر لەوە کەمتر پابەندی یاسان کە خەڵکی بۆی دەچن, یاساکانی ناو گەردیلە رێژەیەکی ئاماریی زۆر کەمیان هەیە, لە چەشنی ئەو یاسایانەی بە رێکەوت پەیدا دەبن, وەك هەموومان دەزانین, یاسایەك هەیە کە ئەگەر جار لە دوای جار دوو زار هەڵبدەیت ئەوا نزیکەی هەر سی و شەش جار هەڵدان, جارێك دووشەش دەهێنیت, ئەمەش بەڵگە نییە بۆ ئەوەی کە کەوتنەوەی زارەکان بە هۆی نەخشەیەکەوە رێکخراوە, بە پێچەوانەوە, چونکە ئەگەر هەموو جارێك لە شوێنی خۆیدا, واتە لە جاری سی و شەشەمدا دووشەش بهاتایە, ئەوسا دەمانتوانی بڵێین یاسایەك لە گۆڕێ هەیە. زۆرینەی یاساکانی سروشت لەم جۆرەن. ئەوانە رێژەی ئاماریی وەهان کە لە یاساکانی رێکەوتەوە سەرهەڵدەدەن, ئەمەش وا دەکات کە تەواوی کاروبارەکانی یاسای سروشتی لەوانەی پێشووتر کەمتر سەرنج رادەکێشێت. جیا لەمەش, لەوانە حاڵەتێك کە ئیمڕۆ زۆر زانستییانەیە, سبەینێ بگۆڕێت و وەکو خۆی نەمێنێتەوە, تەواوی ئەو ئایدیایانە، کە سەرجەمی یاساکانی سروشت پیشانی دەدەن, بۆمان دەردەخەن کە هیچ یاسابەخشێك دای نەناون, هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی ناتەبایی لە نێوانی یاسا سروشتییەکان و یاسا مرۆییەکاندا. یاسا مرۆییەکان فەرمانت پێدەکەن بە شێوەیەکی دیاریکراو رەفتار بکەیت, کە بە هۆیانەوە رەفتارکردن یان نەکردنی خۆت هەڵدەبژێریت. بەڵام یاساکانی سروشت پیشانی دەدەن کە شتەکان لە راستیدا چۆن رەفتار دەکەن, ئەو یاسایانە بە باشی ئەوە دیاری دەکەن کە شتەکان دەیکەن, تۆ ناتوانیت پێدابگریت لەسەر ئەوەی کە پێویستە کەسێك هەبێت فەرمانی پێدابن وا بکەن, چونکە تەنانەت ئەگەر گریمانەی ئەوەش بکرێت, ئەوا رووبەڕووی ئەم پرسیارە دەبیتەوە:" بۆچی خودا ئەم یاسا سروشتییانەی داناوەو هی تری دانەناوە؟" ئەگەر بڵێیت ئەو لەبەر خۆشی و چاکەی خۆی وایکردووەو هیچ هۆیەکی تری نیە, ئەوسا بە سانایی دەتوانیت شتێك بدۆزیتەوە کە یاساکانی یەزدان نایگرێتەوە, بەمەش زنجیرەی یاسا سروشتییەکانت دەپچڕێت. ئەگەر وەك زۆرینەی تیۆلۆجیستە ئارسۆدۆکسەکان[17] دەڵێن, تۆش بڵێیت گوایە لەناو هەموو ئەو یاسایانەدا کە

خودا داینـاون, خودا هۆی خۆی هەبووە کە تەنها ئەمانەیان بدات بە سروشت نەك یاساگەلێکی تر.. بێشك هۆیەکەشی ئەوە بووە کە باشترین گەردون دروست بکات, بەڵام تۆ هەرگیز بیر لەوە ناکەیتەوە کە لێی وردببیتەوە.. ئەگەر هۆیەك هەبێت بۆ ئەو یاسایانەی کە خودا داینـاون, ئەوا خودا خۆشی دەبێت بە بابەتی ئەو هۆیە. هەر بۆیە هیچ سودێکت دەست ناکەوێت بەوەی خودا وەك نێوەندێك بناسێنیت. تۆ بە راستی یاسایەکت هەیە لە دەرەوەی فەرمانی یەزدانی, هەروەها خوداش خزمەتی مەبەستەکەت ناکات, چونکە ئەو دوایین یاسادانەر نیە. بە کورتی, ئەم ئارگییومێنتە هەمووی دەربارەی یاسا چیتر هیچ تین و تاوێکی وەك ئەوەی جارانی نەماوە. من لە بەسەرکردنەوەی ئارگیوێمنتەکاندا لە تویێی کاتەوە سەفەر دەکەم. ئەو ئارگیومێنتانەی بەکارهێنراون بۆ سەلماندنی بوونی خودا, بە تێپەڕینی کات, ئەوانیش کاراکتەری خۆیان دەگۆڕن. هەتا بەرەو سەردەمی مۆدێرن بێین, ئەوانە بایەخیان کەمتر دەبێتەوەو زیاتر و زیاتر لە رووی ئاکاریشەوە بەهای خۆیان لە دەست دەدەن.

## ئارگیومێنتی نەخشە

هەنگاوی داهاتوومان لە پرۆسیسەکەدا دەمانهێنێتە لای ئارگیومێنتی نەخشە. هەمووتان دەزانن ئارگیومێنتی نەخشە چیە: گوایە هەموو شتێکی ناو ئەم جیهانە بە شێوەیەکی وەها نەخشە کێشراون کە ئێمەی مرۆڤ بتوانین تێیدا بگوزەرێنین, ئەگەر ئەم جیهانە یەك تۆزقاڵ جیاواز بوایە, نەماندەتوانی تێیدا بژین. ئەمەیە ئارگیومێنتی نەخشەساز و گوایە یەزدانیش ئەو نەخشە تۆکمەیەی داڕشتووە. هەندێجار شێوەیەکی کرێس و قابیلی وردبوونەوە وەردەگرێت. بۆ نمونە, دەڵێن کەروێشك کلکی سپییە بۆ ئەوەی بە باشی بپێکرێت. من نازانم تێڕوانینی کەروێشك بەرامبەری ئەمە چۆنە. گاڵتەکردن بەم ئارگیومێنتە زۆر ئاسانە. ئێوە هەمووتان قسە قۆشمەکەی ڤۆڵتێرتان[18] بیستووە کە دەڵێت لووت بۆ ئەوە دروستکراوە کە چاویلکە پێوەی بوەستێت. ئێستا ئەم جۆرە قسانە ئەو بایەخە فراوانەی سەدەی هەژدەیەمیان نەماوە, چونکە لە کاتی داروینەوە[19], ئێمە زۆر باشتر تێگەیشتووین کە بۆچی بوونەوەرە زیندووەکان لەگەڵ ژینگەکانیاندا گونجاون. ئەوە ژینگە نییە کە خۆی وا لێدەکات بە کەڵکی ئەوان بێت, بەڵکو گیانەوەرەکان خۆیان بە جۆریکی وەها گەشە دەکەن, کە لەگەڵ ژینگەا بگونجێن, ئەمەش بناغەی راهاتنە. هیچ بەڵگەیەك لەسەر نەخشەسازیی لێرەدا نیە.

کاتێك دەگەیتە ئەوەی لەم ئارگیومێنتی نەخشەیە ورد ببیتەوە, ئەوە شتێکی زۆر بێزارکەرانەیە کە خەڵکی بڕوا بکەن ئەم جیهانە, بە هەموو شتەکانی ناوییەوە و بە هەموو ناتەواوییەکانییەوە, دەبێت باشترین شت بێت کە داناترین و بە تواناترین هێز توانیبێتی لە ماوەی ملیۆنەها ساڵدا دروستی کردبێت. بە راستی من ناتوانم باوەڕ بەمە بکەم. ئایا ئێوە پێتان وایە, ئەگەر ئێوە ببونایە بە داناترین و بەتواناترین و ملیۆنەها ساڵیشتان بە دەستەوە بوایە تا لەو ماوەیەدا جیهانی کاملی خۆتان دروستبکەن. شتێکی لە کو کلوس کلان[20], یان فاشیستەکانتان[21] باشتر دروست نەدەکرد؟ لەوەش زیاتر, ئەگەر ئێوە یاسا ئاساییەکانی زانستتان پێ پەسەندبێت, ئەوا دەبێت گریمانەی ئەوە بکەن کە ژیانی مرۆڤ یان ژیان بە

شـێوەیەکی گشـتی، لـە یـەکێك لـەم چەشـنە حاڵەتانەدا پەیدا بووە: حاڵەتێکی ساردبوونەوەی کۆمەڵـەی خـۆر، لـە قوناغێکی دیاریکراوی ساردبوونەوەکەدا، لە پلەیەکی گەرمی دیاریکراودا، ئەوەنـدە گونجـاو بـووە کـە پرۆتـۆپلازم دروسـت ببێـت، ئـیتر بـۆ ماوەیـەکی کـورت لـە نـاو ژیـانی سـەراپای کۆمەڵـەی خـۆردا، بـۆ ماوەیـەکی کـورت ژیـان هـەبوو. دەبیـنن کـە مـانگ جـۆرە شـتێکە زۆر لە زەوی ناچێت. شتێکی مردوو، ساردو سڕ و بێ ژیان. پێیان وتووم کە ئەم جۆرە تێڕوانینانە پەسـت و بێزارکـەرن، هەنـدێجاریش خـەڵکی پێـت دەڵـێن، ئەگـەر بـاوەڕ بـەوە بهێـنن، ئـەوا نـاتوانن بـەردەوام بـبن لەسـەر ژیـان. بـاوەڕی پـێ مەکـەن، هـەمووی شـتی پڕووپووچـە. لـە راسـتیدا کـەس ئەوەنـدە گـوێ ناداتـە ئـەوەی کـە ملیۆنـەها سـاڵ دواتـر چـی روودەدات، تەنانـەت ئەگـەر بیریشـی لێبکەنـەوەو خـەمی بخـۆن، ئـەوا خۆیـان فریـو دەدەن. ئەوانـە خـەمی شـتێکی تـری زۆر ناخۆشـتریانە، کـە زۆر باشتر پێیان هەرسدەکرێت، بەڵام کەس بە راستی بـە بیرکردنـەوە لـە شـتێك کـە ملیـۆن ملیـۆن سـاڵ دواتـر لـەم جیهانـەدا روودەدات، دڵتـەنگ نابێـت. بۆیـە گەرچـی ئـەوە تێڕوانینێکـی بێهیوایانەیـە کـە گریمانـە بکـەین ژیـان لـەناو دەچـێت.. بـەڵام دەڵـێم لانیکـەم هـەر دەشـبێت وا بڵـێین، چـونکە هەنـدێجار کاتێـك ئـەو شـتانە هەڵدەسـەنگێنم کـە خـەڵکی لەگـەڵ ژیـانی خۆیانـدا دەیکـەن، هەسـت دەکەم کە باشتر وایە ئەم ژیانە کۆتاییەکی هـەبێت.. خـۆ شـتێکی یـەکجار ئەوەنـدە خـراپیش نییـە کـە هەست بکەیت ژیانت بێتام بووە، بەڵکو ئەمە زیاتر وات لێـدەکات بایـەخی خـۆت بـەرەو شـتی تـر وەربچەرخێنیت.

**ئارگیومێنتی ئاکارییانە دەربارەی بوونی یەزدان**

ئێسـتا گەیشـتینە قۆنـاغێکی دیکـە لـە رەوتەکەمانـدا کـە مـن پێـی دەڵـێم هەڵکشـانی هزرییانە، چونکە ئەو تێزانەی ئارگیومێنتیان لەسەر کـرا، دەمانگەیەننـە سـەر ئـەوەی کـە پێـی دەڵـێین ئـارگیومێنتی ئاکارییانـە دەربـارەی بـوونی خـودا. بێشـك ئێـوە هـەمووتان دەزانـن لـە رۆژانـی دێرینـدا، سێ ئـارگیومێنتی هزریـی دەربـارەی بـوونی خـودا خراونەتـە روو، هەرسـێکیان لـە لایـەنی ئـەمانوێل کانتەوە(22) دانراون و لە رەخنەگرتنەکەیدا لە هزری پـەتی خراونەتـە روو. بـەڵام زۆری پێنەچـوو کانـت دەسـبەرداری هـەموویان بـوو، هـات ئـارگیومینتێکی(23) تـازەتری خسـتە روو، ئارگیومێنتێکی ئاکاری، ئەوەش بە تەواویی قایلی کـرد و حەوایەوە. ئەویش وەکو زۆر کەسی تر: لە مەسـەلە هزرییەکانـدا گومانگـەرا بـوو، بـەڵام لـە مەسـەلە ئاکارییەکانـدا ناڕاسـتەوخۆ بـاوەڕی بـەو دروشمانە هەبوو کە لە دایکییەوە پێی گەیشتبوون. ئەمـەش ئـەوە پیشـاندەدات کـە دەرونشـیکارەکان جـەختی لەسـەر دەکـەن.. ئـەوەی یـەکجار بـەهێزو بەرپرسیارە لە هەموو ئەو شتانەی ئێستا روودەدەن و ئەوانەش کە لە ئایندەدا دەقەومێن.

من دەڵێم، کانت ئارگیومینتێکی ئاکارییانەی نـوێی داهێنـاوە بـۆ بـوونی خـودا، کـە لـە فۆرمـە جیاجیاکانـدا شـتێکی زۆر بـاو بـووە لـە سـەدەی نۆزدەیەمـدا. هـەموو شـێوەیەکی لـە خـۆ گرتبـوو. فۆرمێکیـان ئەوەیـە ئەگـەر بڵـێین خـودا نـەبێت، ئـەوا راسـت و هەڵـە بوونیـان نیـە. مـن خـۆم لـەم سـاتەدا بایەخ بـەوە نـادەم ئایا جیاوازییـەك هەیـە لـە نێوانی راسـت و هەڵـەدا یـان نـا: ئـەوە پرسـیارێکی تـر. ئـەو خاڵەی بایەخی پێدەدەم، بریتیە لەوەی ئەگەر ئێوە

تەواو دڵنیان لەوەی کە جیاوازییەك هەیە لە نێوانی ڕاست و هەڵەدا، ئەوا ئێوە لەم هەڵویستەدا دەبن: ئایا ئەو جیاوازییە بە پێی فەرمانی خودایە یان نا؟ ئەگەر بە پێی فەرمانی خودا بێت، ئینجا بۆ خودا خۆی جیاوازیی نییە لە نێوانی ڕاست و هەڵەدا، هەروەها چیتر ئەو وتەیە ئاشکرا نییە کە بڵێین خودا خۆی چاکە. ئەگەر بڵێین، وەکو ئاینزاکان دەڵێن، خودا چاکە، ئەوا پێویستە بشڵێین ڕاست و هەڵە مانایەکیان هەیە کە پشت بە فەرمانی خودا دەبەستێت، چونکە فەرمانەکانی خودا چاکن و خراپ نین، ئەویش سەربەخۆ لەو ڕاستییە سەرەکییەی کە ئەو خۆی دروستی کردوون. ئەگەر وا بڵێین، ئەوا پێویستە بڵێین کە تەنیا لە تویی خوداوە نییە کە ڕاست و هەڵە دێنە بوون، بەڵکو بە شێوەیەکی لۆجیکییانە لە جەوهەریاندا لە پێش خوداوە هەن. بێشك دەتوانیت، ئەگەر حەز بکەیت، بڵێیت کە یەزدانێکی باڵا هەیە کە فەرمان دەدات بەو خودایەی جیهانی دروست کردووە، یاخود ئەو هێڵە وەربگریت کە هەندێك لە نازانمگەراکان گرتویانەتە بەر.. ئەو هێڵەی من زۆرجار وای بۆچووم کە فریودەرە..کە وەك ڕاستییەك ئەم جیهانەی تێیدا دەژین لە لایەنی شەیتانێکەوە دروستکراوە لەو ساتەدا کە خودا ئاگای لێ نەبووە. زۆر شت هەیە لەم بارەیەوە بوترێت، من بایەخ بە بەدرۆخستنەوەی نادەم.

### ئارگیومێنتی ڕاستکردنەوەی ناداد پەروەریی

ئینجا فۆرمێکی زۆر کریسانەی ئارگیومێنتی ئاکاریی هەیە، کە ئەمەیە: ئەوانە دەڵێن بوونی خودا پێویستە بۆ ئەوەی دادپەروەریی بۆ جیهان بهێنێت. لەم بەشەی گەردوندا کە ئێمە پێی ئاشناین، نادادپەروەرییەکی زۆر هەیە، زۆرجار چاکەکار تووشی ناڕەحەتی دەبێت، زۆرجار خراپەکاران سەرکەوتن بەدەست دەهێنن، کەسیش نازانێت ئەم دوو ڕەوشە کامیان زیاتر بێزارمان دەکات، بۆیە بۆ ئەوەی دادپەروەریی لە هەموو گەردوندا هەبێت، پێویستە گریمانەی ژیانێکی ئایندە بکەین بۆ ئەوەی ناهاوسەنگییەکەی ژیانی سەر زەوی ڕاست بکاتەوە. بۆیە ئەوانە دەڵێن پێویستە خودایەك هەبێت، پێویستە بەهەشت و جەهەنەم هەبن تا لەوێدا دادپەروەریی هەبێت. ئەمە ئارگیومینتێکی زۆر کرێسە. ئەگەر لە گۆشەنیگایەکی زانستییەوە بڕوانیتە مەسەلەکە، ئەوا دەگەیتەئەوەی بڵێیت: قەیدی چییە، بەڵام سەرباری هەموو شتێك، من تەنها ئەم جیهانە دەناسم؟ هیچ شتێك دەربارەی باقی گەردون نازانم، ئەمەش تا ئەو ڕادەیەی دەتوانین ئارگیومێنت دەربارەی شێمانەکان بکەین. ئەم جیهانە خۆی لە خۆیدا نمونەیەکی باشە، ئەگەر نادادپەروەریی لێرەدا هەبێت، ئەوا دەبێت لە هەموو شوێنێکی تریشدا نادادپەروەریی هەبێت. "گریمان تۆ قەفەزێك پرتەقاڵت هەیە، سەرەکەیت هەڵپچڕی، بۆت دەرکەوت هەموو پرتەقاڵەکانی سەرەوە خراپ بوون، ئیتر تۆ بڕکێشی ناکەیت و ناڵێیت "دەبێت ئەوانەی خوارەوە چاك بن، بۆ ئەوەی پاساوی خراپەکان بدەنەوە". بەڵکو دەڵێیت، " دیارە هەموویان خراپن" ئەمەش بە ڕاستی ئەوەیە کە کەسێکی زانستی دەربارەی گەردون دەیڵێت. ئەو دەڵێت " لێرە لەم جیهانە نادادپەروەرییەکی زۆر دەبینین، ئەمەش هۆیەکە بۆ ئەوەی بڵێین کە دادپەروەریی فەرمانڕەوایی جیهان ناکات، بۆیە ئەوەندەی بڕ بکات، ئەوە ئارگیومێنتێکی ئاکاری دەخاتە ڕوو دژی یەزدان و پەسەندی ناکات. "بێشك من دەزانم ئەو چەشنە ئارگیومێنتە هزرییەی بۆ ئێوەم باس کرد، ئەوانە نین کە بە

ڕاستی خەڵکی دەخەنە جووڵە. ئەوەی بە ڕاستی خەڵکی دەجوڵێنێت بۆ ئەوەی باوەڕ بە یەزدان[24] بێنن، بە هیچ جۆرێك ئارگیومێنتێکی هزریی نییە. زۆرینەی خەڵك باوەڕیان بە یەزدان هەیە چونکە هەر لە سەردەمی ساواییانەوە فێری ئەوە کراون باوەڕیان بە بوونی یەزدانێك هەبێت.

پاشان پێموایە دووهەمین هۆی زۆر بەهێز بریتیە لە هیوای سەلامەتبوون، کە جۆرە هەستێکی وەهایە وەك ئەوەی برایەکی گەورەت هەبێت و ئاگای لێت بێت. ئەمە ڕۆڵێکی زۆر گرنگ دەبینێت لە حەزی خەڵکیدا بۆ ئەوەی باوەڕ بە یەزدان بکەن.

### کاراکتەری مەسیح

ئێستا دەمەوێت چەند وشەیەکی کەم دەربارەی بابەتێك بڵێم کە زۆر جار هەستم کردووە هزرمەندان هەقی خۆیان نەداوەتێ، ئەویش پرسیاری ئەوەیە ئایا مەسیح باشترین و داناترین کەس بووە. بە شێوەیەکی گشتی پێمان وتراوە کە پێویستە هەموومان ڕازی بین بەوەی بەڵێ ئەو باشترین و داناترین کەس بووە. بەڵام من خۆم ڕام وا نییە. پێموایە مەسیح گەلێك خەسڵەتی چاکی تێدایە، بە پێی ئەوانە بێت، منیش لەگەڵ مەسیحدا کۆکم بۆ بەشی زۆری ئەو شتانەی پێویستە مەسیحییەکان بیکەن. بەڵام لەو بڕوایەدا نیم بتوانم بە درێژایی ڕێگا لەگەڵیدا کۆك بم، بەڵام من دەتوانم زۆر لەوە زیاتر لەگەڵیدا تەبا بم کە ئەوانەی بە خۆیان دەڵێن مەسیحی، لەگەڵیدان. بیرتان دێتەوە کە وتویەتی"بەرەنگاریی خراپە مەکە: بەڵکو هەر کەسێك کێشای بە ڕومەتی ڕاستتا، ئەوەی تریشیانی بۆ وەرسوڕێنە". ئەمە بۆچوونێکی نوێ یان پرەنسیپێکی تازە نییە. نزیکەی 500 تا 600 ساڵێك پێش مەسیح، لاوتزو[25] و بووداش بەکاریان هێناوە، بەڵام ئەمە پرەنسیپێك نییە کە مەسیحییەکان بە ڕاستی پەسەندی بکەن. گومانم لەوە نییە کە سەرەك وەزیرانی ئێستامان (ستانلی باڵدوین) بۆ نموونە، مەسیحییەکی زۆر دڵسۆزە، بەڵام من ئامۆژگاری کەس لە ئێوە ناکەم بچێت شەقازللەی لێبدات. چونکە لەو باوەڕەدام دوایی بۆتان دەردەکەوێت کە بە بڕوای ئەو، ئەم تێکستە لە شێوەیەکی هێماییدا دارێژراوە، قابیلی پیادەکردن نییە.

خاڵێکی تریش هەیە دەمەوێت بایەخی پێبدەم. بیرتان ماوە کە مەسیح وتویەتی"دادوەریی کەس مەکەن بۆ ئەوەی خۆشتان دادوەریی نەکرێن" ئەمە پرەنسیپێکە پێموانییە لە یاسای وڵاتە مەسیحییەکاندا شتێکی باوبێت. ژمارەیەکی باش دادوەرم ناسیوە کە هەموویان زۆر مەسیحی بوون، بەڵام هیچیان وایان هەست نەکردووە کە ئەو کارانەی کردوویانە پێچەوانەی پرەنسیپەکانی مەسیحییەت بووبن. مەسیح دەڵێت "ئەوەی لێتان داوا بکات، بیدەنێ و ڕووی لێ وەرمەگێڕن". ئەمە پرەنسیپێکی زۆر باشە. بەڕێوەبەرەکەتان پێی وتن کە ئێمە نەهاتووین بۆ ئێرە بۆ ئەوەی باسی سیاسەت بکەین، بەڵام من ناتوانم سەرنج نەدەم کە دوایین هەڵبژاردنی گشتیمان خۆی لە خۆیدا جەنگێك بوو لەسەر ئەوەی ڕوو لە کەسێك وەربچەرخێنین و ئەوەی نەدەینێ کە داوای کردووە، کەواتە دەتوانین گریمانە بکەین کە لیبراڵەکان و پارێزگارەکانی ئەم وڵاتە، لەو جۆرە خەڵکانەن کە لەگەڵ فێرکردنەکانی مەسیحدا کۆك نین، چونکە لەو بۆنەیەدا زۆر شێلگیرانە ڕوویان لە یەکتریی وەرچەرخاندووە.

پاشان دروشمێکی تری مەسیح هەیە کە بە بڕوای من زۆر شت لەناو خۆیدا هەڵدەگرێت، بەڵام

نـابینم لـەناو هـاوڕی مەسـیحییەكانماندا زۆر بـاو بێت. دەڵێت " ئەگەر دەتەوێت زۆر ناياب بیت، بڕۆ ئەوەی هەتە بیفرۆشەو پارەكەی بدە بە هەژاران". ئەمە دروشمێكی زۆر نایابە، بەلاّم، وەك وتم، پیادە ناكرێت. پێموایە، هەموو ئەمانە، با دروشمی باشن، گەرچی تۆزێك زەحمەتیشە تیایاندا بـژین. مـن بـۆ خۆم لەگەڵیاندا ناژیم، بەلاّم سەرباری هەموو شتێك، نابێت مرۆڤی مەسیحی وا نەبێت.

## چەند ناتەواوییەك لە ئاینداریتی مەسیحدا

دوای ئــەوەی نایــابی ئــەو دروشمانــەمان سـەلماند، دێمـە سـەر چـەند خـاڵێكی تـر كـە بـڕوا ناكـەم بتـوانین دانـایی ژوورمرۆیـی یـان چـاكی ژوورمرۆیی مەسیح بسەلمێنین، بەو شێوەیەی وەكو راستیی حاشاهەڵنەگر باسیان لێوە كراوە. لێرەشدا رەنگـە بڵـێم هۆیەكـەی ئەوەیـە خـەڵكی بایـەخ بـە پرسـیاری مێـژوویی نـادەن. لـە رووی مێژووییـەوە بـوونی مەسـیح زۆر مایـەی گومـان و دڕدۆنگییـە، ئەگـەر هەشـبووبێت، ئێمـە هیچـی وا دەربـارەی نـازانین، بۆیـە مـن گرنگـی دەدەم بـە پرسـیاری مێژوویی، لەگەڵ ئەوەشدا كە زۆر گرانە. من بایەخ دەدەم بە مەسیح وەك ئەوەی لە ئینجیلەكاندا هەیە، گێڕانــەوەكانی ئینجیــل وەك خــۆی وەردەگــرم، لەوێشــدا هەنــدێ شــتی وا دەدۆزینــەوە كــە زۆر دانایانە نایەنە بەرچاو. لەبەر شتێك، باوەڕ وایە كە هاتنەوەی دووەمین جاری[26] بۆ جیهان لە هەورێكی شـكۆدارییەوە دەبێـت، پـێش ئـەوەی هـەموو ئـەو خەڵكانەی لەو سەردەمەدا دەژین، هەموویان بمرن. گەلێك تێكست هەن كە ئەوە دەسەلمێنن. بۆ نمونە دەڵێت "پێش ئەوەی كوڕی مرۆ بگاتە جێ، ئێوە پێ ناخەنە ناو هەموو شارەكانی ئیسرائیلەوە". پاشان دەڵێـت "هەنـدێك هـەن كـە لێـرە وەسـتاون، ئەمانـە پـێش ئـەوەی كـوڕی مـرۆ بێـت بـۆ شانشـینەكەی، هیچیان نامرن"، گەلێك شوێنی تریش هەیە كە زۆر بـە روونـی ئامـاژە دەكـەن بـۆ ئـەوەی هاتنـەوەی دووهـەمینجاری لـە مـاوەی ژیـانی گـەلێك لەوانـەدا دەبێـــت كـــە هێشـــتا زینـــدوون. بـــاوەڕی شــوێنكەوتووەكانی ســەرەتای وابــووە، ئــەوەش بناغـەی زۆرێـك فێركردنـە ئاكارییـەكانی ئـەو بـووە. كاتێك وتی "بیر لە سبەینێ مەكەرەوە" و شتی تری لەو بابەتە، بە زۆری لەبەر ئەوە بووە كە پێی وابووە هاتنــەوەی دووهــەمین جــاری زۆر نزیكــە، بۆیــە كاروبارە دونیاییەكان حیسابیان بۆ نەكراوە. وەك راســتییەك، ئــەوەم زانیــوە كــە هەنــدێك لــە مەسـیحییەكان بـە راسـتی باوەڕیـان وایـە كـە هاتنـەوەی دووهـەمین جـاری نزیـك بـووە. یـەكێكم ناسیوە كە رۆحی گروپێك لە نوێژكەرانی بردبوو، پێـی وتبـوون هاتنـەوەی دووهـەمین جـاری مەسـیح زۆر نزیكـە، بـەلاّم ئـەوان سـەرنجیان دا ئـەو پیـاوە خۆی سەرقاڵی ئەوەیە درەختێك لە ناو باخچەكەیدا بچێنێت، ئەو كارەش بوو بە هۆی ساردبوونەوەیان. مەسیحییەكان سەرەتا بەراستی باوەڕیان وابوو كە هاتنەوەی دووەمین جاری مەسیح هەر زۆر نزیكە، بۆیـە وازیـان لـە كـاری وەك رواندنی درەخـت لـەناو باخچەكانیاندا هێنابوو. لەم بارەیەوە، مەسیحیش لە زۆرینـەی خەڵكی تر داناتر نەبووە، بە دڵنیاییی داناییەكەی ژوورمرۆیی نەبووە.

## گرفتی ئاكاریی

ئینجـا دێینـە سـەر پرسـیارە ئاكارییـەكان. لـە مێشـكمدا ناتەواوییـەكی زۆر جـدیی هەیـە لەمـەڕ كاراكتەری ئاكارییانەی مەسیح، ئەویش ئەوەیە ئەو باوەڕی بە دۆزەخ هەبووە. من خۆم وا هەست ناكەم هیچ كەسێك كە بە راستی و بە قووڵی مرۆڤ بێت

بتوانێت باوەڕ بە سزادانی هەتاهەتایی بکات. مەسیح بە روونی وەك ئەوەی لە ئینجیلەکاندا وێناکراوە باوەڕی بە سزادانی ئەبەدی هەیە, لە چەندان شوێندا تورەیی و تۆڵەستاندنەوە دژی ئەو کەسانە هەیە کە گوێ لە مزگێنییەکانی ئەو ناگرن.. ئەمەش هەڵوێستێکی نائاشنایە بۆ مزگێنیدەران, ئەمەش لە شان و شەوکەتی داناییەکی ژوورمرۆیی کەم دەکاتەوە. بۆ نمونە, هەڵوێستی وا لای سۆکرات نادۆزینەوە. دەبینین سۆکرات بە تەواویی لەگەڵ ئەو خەڵکانەدا نەرم و نیان و بەڕێز بوو کە گوێیان لێنەدەگرت, بە بۆچوونی من, پیاوی دانا زیاتر ئەوەی لێدەوەشێتەوە کە ڕێبەکەی سۆکرات بگرێتە بەر نەك ڕێگەی رق و تۆڵەستاندنەوە. رەنگە هەمووتان بێتەوە بیرتان کە سۆکرات لە ساتی مردنیدا چی دەووت, لەگەڵ ئەو شتانەشدا کە بە شێوەیەکی گشتی بەوانەی وتووە کە لە گەڵیدا کۆك نین.

دەبینن مزگێنییە دڵنیاکان پێیان وتوون "ئێوە ئەژدیهان, ئێوە نەوەی مارە ژەهراوییەکانن, چۆن دەتوانن لە نەفرەتی دۆزەخ خۆتان رزگار بکەن". ئەمە بەو خەڵکانە وتراوە کە حەزیان لە مزگێنییەکانی ئەو نەبووە. بە راستی بە بۆچوونی من ئەمە باشترین تۆنی ئاخاوتن نیە, هەروەها یەکجار زۆر شتی تری لەم بابەتە دەربارەی دۆزەخ هەیە. بێگومان تێکستە باوەکەش دەربارەی گوناهکاریی بەرامبەری تارمایییە پیرۆزەکە هەیە: "هەر کەسێك زەمی تارمایی پیرۆز بکات لێخۆشبوونی بۆ نییە نە لەم جیهانەداو نە لەو جیهانەشدا کە بەڕێوەیە". ئەو تێکستە بووەتە هۆی نارەحەتییەکی لە رادەبەدەر لە جیهاندا, چونکە هەموو جۆرە خەڵکێك ئەندێشەیان کردووە کە بەرامبەری تارمایی پیرۆز گوناهیان کردووە, ئیتر نە لەم جیهانەو نە لەوەشدا کە بەڕێوەیە لێخۆشبوونیان نابێت. بەراستی من پێموایە کەسێك کە ئاستێکی گونجاوی بەزەیی لە دڵیدا هەبێت, ترس و لەرزی لەم جۆرە ناخاتە جیهانەوە.

مەسیح دەڵێت: "کوڕی مرۆ فریشتەکانی خۆی دەنێرێت, ئەوانیش لەناو شانشینەکەیدا هەموو ئەوانە کۆدەکەنەوە کە خراپەیان کردووە, هەروەها ئەوانەش کە نایەکسانییان کردووە, ئینجا هەموویان فڕێ دەدەنە ناو فرنی ئاگرەوە, لەوێدا هاوارو ناڵەیان دێت و دانەکیرە دەکەن" ناڵەو نوزەو دانەکیرە بەردەوام دەبێت. هۆنراوە دوای هۆنراوە باسی ئەمانە دەکەن, ئەوەش تەواو بۆ خوێنەران روون و ئاشکرایە کە چێژێك لە تێرامان و وردبوونەوەی ناڵەو دانەکیرەدا هەیە, چونکە ئەگەر وا نەبوایە ئەو هەموو جارە باس نەدەکرا. پاشان بێگومان هەمووتان مەسەلەی مەڕو بزنەکانتان بیرماوە, چۆن لە هاتنەوەی دووهەم جاریدا مەڕەکان لە بزنەکان جیادەکاتەوە, بە بزنەکانیش دەڵێت"لێم دوورکەونەوە, ئێوە نەفرەتتان لێکراوە, بۆ ناو ئاگری هەتاهەتایی". لەسەری دەڕوات: "ئەمانەش دەچن بۆ ناو ئاگری هەتاهەتایی". پاشان دەڵێتەوە: "ئەگەر دەست خراپەی لەگەڵ کردن, بیبڕن, بۆ ئێوە باشتروایە بێ دەست بێنە ناو ژیانەوە, نەك دوو دەستتان هەبێت و بچن بۆ دۆزەخ, بۆ ناو ئەو ئاگرەی هەرگیز خامۆش نابێت, لەوێ کرم ماندوو نابێت و ئاگریش ناکوژێتەوە". ئەمەش دیسان دووبارەو چەند بارە دەکاتەوە. پێویستە بڵێم، پێموایە ئەو پێڕەوە هەمووی, کە ئاگری دۆزەخ سزای گوناهە, پێڕەوی دڵڕەقییە. پێڕەوێکە کە دڵڕەقی دەخاتە ناو جیهانەوەو دواتر چەندان نەوەی ئەشکەنجەدەری دڵڕەق و بێڕەحم دەدات بە جیهان, مەسیحی مزگێنیدەریش, ئەگەر بەو جۆرە

بێت كە سەرگوزەشتە نوسەكانی وێنایان كردووە، ئەوا بە دڵنیاییی ئەویش تا رادەیەك بەرپرسە.

شتی تریش هەن كە بایەخیان كەمترە. بۆ نموونە بەرازەكانی گادەر، لەوێدا بە دڵنیایی مەسیح بەرامبەری بەرازەكان بەسۆز نەبوو، چونكە رۆحە خراپەكانی خستە ناو ئەوانەوەو وای لێكردن لە گردەكەوە بە راكردن بچنە خوارەوەو خۆیان بخەنە دەریاوە. پێویستە بێتەوە بیرتان كە ئەو خاوەنی هەموو توانایەك بوو، دەیتوانی زۆر بە ئاسانی وا لە رۆحە خراپەكان بكات بڕۆن، بەڵام خۆی رەوانەی كردن بۆ ناو بەرازەكان. پاشان چیرۆكێكی سەیر دەربارەی دارهەنجیرەكە هەیە، ئەم چیرۆكە تا رادەیەك سەرم گێژ دەكات. بیرتان ماوە كە دەربارەی دارهەنجیرەكە روویدا. "ئەو برسی بوو، دارهەنجیرێكی بینی كە دوای گەڵاڕێزان گەڵای لێ رووابوۆوە، هات بەڵكو رێكەوت بكات شتێكی دەستگیر ببێت، كاتێك هات بۆ لای دارەكە، هیچی نەبینی گەڵاكانی نەبێت، چونكە هێشتا كاتی پێگەیشتنی هەنجیر نەهاتبوو. جێسی هاتە قسەو پێیوت: لێرە بەدواوە كەس لە بەری تۆ ناخوات... پیتەریش ... پێیوت: گەورەم، بڕوانە ئەو دارهەنجیرەی تۆ نەفرەتت لێكرد، سیس بوو". ئەمە چیرۆكێكی زۆر دزێوە، وەختی پێگەیشتنی هەنجیر نەبوو، بۆیە ناتوانیت لۆمەی درەختەكە بكەیت. من خۆم ناتوانم هەست بكەم چ لە مەسەلەی داناییدا یان لە مەسەلەی نیكییدا، مەسیح بەقەدەر هەندێك كەسی دیكەی ناسراوی ناو مێژوو بڵند بێت. پێموایە لەو مەسەلانەدا، پێویستە بوداو سۆكرات بخرێنە سەرووی ئەوەوە.

### فاكتەری سۆزداریی

وەك پێشتر وتم، پێموانییە هۆی راستەقینەی ئەوەی بۆچی خەڵكی ئایین پەسەند دەكەن، هیچ پەیوەندییەكی بە ئارگیومێنتكردنەوە هەبێت. ئەوانە لەسەر زەمینەیەكی سۆزداریی ئایین پەسەند دەكەن. زۆرجار وتراوە زۆر هەڵەیە هێرش بكرێتە سەر ئایین، چونكە ئاین وا لە خەڵك دەكات نیك بن. من ئاوام پێوتراوە، خۆم تێبینیم نەكردووە. ئێوە بێشك ئەو ئارگیومێنتە گاڵتەجاڕەتان بیستووە كە لە كتێبەكەی ساموێل بولتەردایەو دواتریش ئێروین پوختەی كردووە. بیرتان دێتەوە كە لەوەی ئێرویندا، كاتێك هیگی لەخۆڕازیی دەگاتە وڵاتێكی دورە دەست، دوای ئەوەی ماوەیەك لەوێ دەمێنێتەوەو بە هۆی باڵۆنێكەوە لە وڵاتەكە هەڵدێت، دوای بیست ساڵ دەچێتەوە بۆ ئەو وڵاتەو دەبینێت ئاینێكی بڵاوبۆتەوە، خەڵكەكە لە ژێر ناوی "مندالی هەتاو" دا هیگ دەپەرستن و پێیان وایە كە هیگ بەرەو ئاسمان هەڵكێشراوەتەوە. ئەویش دەبینێت كاتی فیستیڤاڵی هەڵكێشرانەوە نزیكبۆتەوە، دەبیستێت پرۆفیسۆر هانكی و پانكی بە یەكتریی دەڵێن ئەوان هەرگیز چاویان بە هیگی مرۆڤ نەكەوتووە و بەهیواشن هەرگیز نەیبینن، بەڵام ئەو دوانە ئاینزای بالای ئاینی مندالی هەتاون. هیگ زۆر توورە دەبێت، دەچێتە سەرەوە بۆ لایان، دەڵێت " من هەموو ئەم هەرایە پووچەڵ دەكەمەوە و بە خەڵكی ئێروین دەڵێم كە من تەنیا هیگی مۆڤم و بە باڵۆنێك چووم بۆ ئاسمان. پێیان ووت، نابێت شتی وا بكەیت، چونكە هەموو ئاكارەكانی ناو ئەم وڵاتە لە دەوری ئەم ئەفسانەیە خڕبوونەتەوە. ئەگەر بزانن كە تۆ هەڵنەكیشراویت بۆ ئاسمان، زۆر خراپیان بەسەر دێت" ئەویش بەوەندە قایل دەبێت و بەرێی خۆیەوە دەڕوات.

ئەمەیە بیرۆكەكە. ئەگەر ئاینی مەسیحمان نەبێت، زۆر خراپمان بەسەردێت. بەلای منەوە ئەو

خەڵکانەی کە ئەو ئایینەیان هەڵگرتۆتەوە بەشی زۆریان زۆر خراپیان بەسەر هاتووە. راستییەك هەیە, هەتا ئاینی هەر سەردەمێك توندوتۆڵ و تۆکمەتر بێت, ئەوا باوەڕە دۆگماییەکان زیاتر سەرنجڕاکێش دەبن, هەتا دڵڕەقیی زیاتر بێت, ئەوا رەوشی مەسەلەکان خراپتر دەبێت. لەو سەردەمەدا کە پێی دەوترێت سەردەمی باوەڕ, کاتێك مرۆڤەکان بە راستی باوەڕیان بە هەموو لایەنەکانی ئاینی مەسیحیی هەبوو, لێپرسینەوەو ئازارو ئەشکەنجەدانێکی سەختیش هەبوو, ملیۆنان ئافرەتی بەستەزمان بە تۆمەتی سیحربازیی سوتێنران, بە ناوی ئاینەوە هەموو چەشنەکانی درندەیی لەسەر هەموو جۆرەکانی خەڵك تاقیکرایەوە.

کاتێك سەیری دەوروپشتی خۆتان دەکەن, دەبینن هەموو تۆزقاڵە گەشەکردنێك لە هەستی مرۆڤدا, هەموو چاکسازییەك لە یاسای تاواندا, هەموو هەنگاوێك بەرەو نەهێشتنی جەنگ, هەموو هەنگاوێك بەرەو مامەڵەی باشتری رەچەڵەکە رەنگاو رەنگەکان, هەموو گۆڕانکارییەك لە کۆیلایەتیدا, هەموو گەشەکردنێکی ئاکاریی کە لەسەر زەوی کراوە, ئەوە بەردەوام لە لایەنی کەنیسەکانی جیهانەوە رووبەڕووی وەستاونەتەوە. من زۆر مکومانە دەڵێم کە ئاینی مەسیحی, وەك لە کەنیسەکاندا رێکخراوە, هەتا ئێستاش دوژمنی سەرەکی گەشەکردنی ئاکاریانەیە لە جیهاندا.

### چۆن کەنیسەکان لە پێشکەوتن دواکەوتن

لەوانەیە وا بیر بکەنەوە کە من زۆر دوور دەڕۆم کاتێك دەڵێم ئەمە وایە, بەڵام من خۆم پێموا نییە. راستییەك وەربگرن. ئەگەر ئاماژەی بۆ بکەم, ئێوەش لەگەڵمدا دەبن, راستییەکی خۆش نییە, بەڵام کەنیسە ناچارمان دەکات ئاماژە بۆ ئەو راستییانە بکەین کە دڵخۆشکەر نین. بە گریمانەی ئەوەی لەم جیهانەدا کە ئیمڕۆ ئێمە تییدا دەژین, کچێکی بێ ئەزمون شوی کرد بە پیاوێك کە نەخۆشی سیفلسی هەیە, کەنیسەی کاسۆلیکی[27] لەم حاڵەتەدا دەڵێت" ئەمە نهێنییەکی پیرۆزی بێکۆتاییە. پێویستە یان بەرگەی رەبەنی بگرن یاخود پێکەوە بمێننەوە. ئەگەر پێکیشەوە بمێننەوە, نابێت رێگە لە منداڵبوون بگرن و نەهێڵن منداڵانێك لە دایك ببن کە تووشی نەخۆشی سیفلس بوون" هیچ کەسێك لەوانەی کە هەستیارییان بە هۆی دۆگمایەکەوە رانەماڵراوە یاخود ئەوانەی سروشتە ئاکارییەکانیان بەرامبەری هەموو چەشنەکانی ئازارچەشتن نەمردووە, ناتوانێت بڵێت ئەوە راستە و گونجاویشە کە حاڵەتی شتەکان بەردەوامیی پێبدرێت.

ئەمە تەنیا نمونەیەکە. گەلێك رێگای تر هەیە کە لێیانەوە, حاڵی حازر, کەنیسە بەهۆی ئەوەی کە خۆی پێی دەڵێت ئاکارێتی, ئازاری هەموو ئەو جۆرە خەڵکانە دەدات کە نە شایستەی ئازار دانن و نە پێویستیش دەکات ئازار بدرێن. بێگومانیش, وەك دەزانین, لە بەشی سەرەکیدا هێشتا هەر دژی پیشکوتن و پەرەسەندنە لە هەموو ئەو رێگایانەوە کە مەینەتی لە جیهاندا ناهێڵێت, چونکە ئەو لە رێگای چەند رێسایەکی بەر تەسکەوە کار دەکات کە هیچ پەیوەندییەکیان بە کامەرانی مرۆڤەوە نیە, کاتێکیش تۆ دەڵێیت پێوستە ئەمە یان ئەوە بکرێت چونکە کامەرانی مرۆڤی تێدایە, ئەوان وا بیر دەکەنەوە کە هیچیان نییە بۆ ئەوە بیکەن "کامەرانی مرۆڤەکان چ پەیوەندییەکی بە ئاکارەوە هەیە؟" مەبەستی ئاکار ئەوە نییە

مرۆڤەکان کامەران بکات.

## ترس, دامەزرێنەری ئایین

پێموایە ئایین بە شێوەیەکی بەرایی و سەرەکی لەسەر بنەمای ترس دامەزراوە. لە بەشێکیدا بریتیە لە تۆقین لە نەزانراو, لە بەشێکی تریشیدا, وەك وتم, بریتیە لە خۆزگەی هەستکردن بەوەی تۆ جۆرە برا گەورەیەکت هەیە کە لە هەموو گیروگرفت و لێقەومانەکانتدا فریات دەکەوێت. ترس بناغەی هەوو شتەکەیە.. ترسان لە تەژمی, ترسان لە بەزین, ترس لە مردن. ترس باوکی دڵڕەقییە, بۆیە هیچ سەرسوڕمانێك لەوەدا نییە ئەگەر دڵڕەقی و ئایین دەست لەناو دەست پێکەوە رۆیشتبن. ئەمەش چونکە ترس لەسەر بنەمای ئەو دوو شتە دامەزراوە. ئێستا ئێمە لەم جیهانەدا دەستمان کردووە بەوەی تۆزێك لە شتەکان تێبگەین و بە هۆی زانستەوە کەمێکیش توانیومانە دەستیان بەسەردا بگرین, ئەو زانستەی هەنگاو بە هەنگاو رێگەی خۆی دژی ئاینی مەسیحی کردۆتەوە, دژی کەنیسەکان, هەروەها دژی ناڕەزایی هەموو بۆچوونە کۆنەکان. زانست دەتوانێت یاریدەی ئێمە بدات بەسەر ئەم ترسە تۆقێنەرەدا زاڵ ببین کە گەلێك نەوەی مرۆڤایەتی لە ناویدا ژیاون. زانست دەتوانێت فێرمان بکات, هەروەها من پێشمواپە ناخی خۆمان دەتوانێت فێرمان بکات, کە چیتر سەیری دەوروپشتی خۆمان نەکەین و بە دوای پشتیوانییەکی ئەندێشەییدا نەگەڕێین, چیتر هاوپەیمانانی خۆمان لەناو ئاسماندا نەخولقێنین, بەڵکو لەبری ئەوە لێرە لە خوارەوە خۆمان هەوڵبدەین ئەم جیهانە وا لێبکەین ببێت بە شوێنێك کە ژیان تێیدا باشتر بێت, لە بری ئەو جۆرە شوێنەی کە کەنیسەکان لە هەموو ئەم سەدانەدا دروستیان کردووە.

## پێوستە چی بکەین؟

ئێمە دەمانەوێت لەسەر پێی خۆمان رابوەستین و بە وردی بڕوانینە جیهانی دەوروپشتمان.. راستییە چاکەکانی, راستیە خراپەکانی, جوانییەکانی, دزێوییەکانی. جیهان وەك خۆی ببینین و لێی نەترسین. بە ئاوەزی خۆمان جیهان داگیر بکەین نەك بەوەی وەك کۆیلە لە ترسی ئەو سام و هەیبەتەی لێوەی دێت شوێنی ئایین بکەوین. تەواوی چەمك و مانای خودا بریتیە لە چەمکێك کە لە ستەمکارییە دێرینەکانەوە سەری هەڵداوە. ئەوە چەمکێکە بە هیچ جۆرێك بە کەڵکی پیاوی ئازاد نایەت. کاتێك گوێت لە خەڵکی ناو کەنیسە دەبێت خۆیان سووك دەکەن و دەڵێن ئێمە تاوانکاری زۆر پۆخڵێن, لەگەڵ هەموو شتەکانی تریشیاندا, ئەوە شتێکە شایستەی هیچ رێزێك نییە و مرۆڤێك کە رێز لە مرۆڤێتی خۆی بگرێت, لێی نزیك نابێتەوە. پێویستە هەستینە سەرپێ و راشکاوانەو روبەڕوو بڕوانینە جیهان. پێویستە بەو پەڕی توانای خۆمانەوە باشترین شت بۆ جیهان بکەین. ئەگەر ئەوەندە باشیش نەبێت کە ئێمە ئارەزووی دەکەین, ئەوا دوجار باشترە لەوەی هەموو ئەو شتانەی تر لە هەموو ئەو سەردەمانەدا بۆیان کردووە. جیهانێکی باش پێویستی بە زانین, بەزەیی, ئازایەتی هەیە, دوای ئەو رابردووە پڕ لە سەرکوتکردنی بیری ئازادە لە لایەنی پیاوە نەزانەکانەوە, چیتر پێویستی بە ئارەزووی پڕ ناسۆر نییە. پێویستی بە دیدی نەترسانەو بیری ئازاد هەیە. پێویستی بە بوونی هیوایە بە ئاینده, نەك هەمیش و هەموو کات بڕوانینە ئەو رابردووەی کە تێپەڕیوە و مردووە, پێویستە متمانەمان بەوە بێت کە جیهان بە هۆی بیری ئێمەوە زۆر باشتر و

باشتریش دەبێت.

## پەراوێزەكانی وەرگێڕ

1-بـــودابیزم *Buddhism* یەكێكـــە لـــە ئاینـــە سەرەكییەكانی جیهان, لە باكوری هیندستانەوە سەری هەڵـداوەو لەسـەر بنـەمای ئامۆژگارییـەكانی سـیدهارتا گوتامـا *Siddhartha Gautama* دامـەزراوە كـە بـە بـوودا *Buddha* ناسـراوە, وشـەیەكە مانـای مرۆڤـە رۆشـنەكە دەگەیەنێت. بودابیزم وەكو جوڵانەوەیـەكی سادە لـە نـاو نـەریتی براهمـانی ئـەو رۆژگـارەدا بڵاوبۆتـەوەو هـەرزوو ئاڕاستەیەكی جیاوازی بۆ خۆی دۆزیوەتەوە. بودا چەند سـیمایەكی دیـاری فەلسـەفی هینـدویزمی رەتكـردەوەو كێبڕكێــی ئاینزاكـانی كـردو نكـوڵی لــە رۆحانییەتـە ڤیدابیەكان كرد و ئـەو كەلتورەی رەتكردەوە كە لەسـەر قوربانیـدان بـۆ ئـەو رۆحیانەتانـە دامـەزرابوو. هـەروەها جوڵانەوەكەی خۆی ئـەوەڵاكرد بۆ ئـەوەی هـەموو ئاسـتە كۆمەڵایەتییـەكان بگرێتـەوە, نكولیی لـەو تیڕوانینـە كـرد كە دەیووت مرۆڤ شەرافەتمەندی و رۆحانییەتی بە میرات بــۆ دەمێنێــتەوەو لەگــەڵ لــە دایكبونیــدا ئەوانەشــی لەگەڵدایـە. ئیمـڕۆ بـودابیزم دابەشـبووە بـۆ دوو لقـی سەرەكی و شوێنكەوتووانیان بە ناوی سیرڤادا "رێگای باپیران" و ماهایانا " رەوتی مەزن" ەوە بانگ دەكرێن.

2-كۆنفیۆشـــیانیزم *Confucianism* سیســـتمێكی ســـەرەكی بیركردنەوەیـــە لـــە چـــین, لـــە فێركـــردن و ئامۆژگارییـــــــــــەكانی كۆنفیۆشـــــــــــیۆس و شـــوینكەوتووەكانییەوە پـــەرەی ســـەندووە, بایـــەخ بـــە پرەنســـیپەكانی رەفتـــاری چـــاك و دانـــایی پراكتیكـــی و پەیوەندییــــە كۆمەڵایەتییــــە باشــــەكان دەدات. كۆنفیۆشیۆشـــیانیزم كاریگـــەریی لەســـەر تێڕوانینـــی چـــینییەكان بـــەرەو جیهـــان هـــەبووە, بنـــەماكانی گـــوزەرانكردن و ســـتانداردەكانی ژیـــانی كۆمەڵایـــەتی دامەزراندووەو بووشە بە پێشینەو زەمینەیەك بۆ تیورییە سیاسییەكانی فەرمانڕەوایی و دامو دەزگاكانی ناو چین. لـە چینەوە بـەرەو كۆریـا و یابـان و ڤێتنـام بـڵاو بۆتـەوەو سـەرنجی لێكۆڵیـارە خۆراوایـەكانی راكێشاوە بـۆ ئـەوەی لێی وردببنەوەو لێكۆڵینەوەی لەسەر بكەن.

3-ئۆگەسـتین, سـانت *(Augustine, Saint (354-430*, مــەزنترین قەشــەی لاتینیــە, دیــارترین ســەركردەی كەنیسەی خۆراوایە. سەرەتای ژیانی زۆر بە بەرەڵایی و بێباوەڕی بەسەر بردووە. بەڵام دوایی پەشیمان بۆتـەوەو لـەكتێبی دانپیانانەكانیـدا باسـی ئـەو قۆناغـەی ژیـانی خـۆی كـردووە. بۆمـاوەی دوازدە سـاڵ لەگـەڵ كچـێكدا پەیوەنــدییان هــەبووە, بــێ ئــەوەی مــارەی بكــات, كوڕیكیشی لێی دەبێت.

ئۆگەستین لە 13 ی تشرینی دووهەمدا لە تاگاستا – نومیـدیا ( ئێسـتا پێـی دەوترێـت سـوك ئـەهراس – جەزائیر) لە دایك بووە, باوكی نـاوی پاتریشـۆس بـووەو لە دەوروبەری 371 دا مردووە, پاگان بووە و دواتـر بـوو بە مەسیحی. دیكیشی ئافرەتێكی مەسیحی بـووەو نـاوی مۆنیكا بـووە. ئۆگەسـتین لـە ژێـر كاریگـەری سیسـیرۆندا خـووی داوەتـە گـەڕان بـە دوای راسـتیدا. بەرلـەوەی بـە تـەواویی ببێـت بـە مەسـیحی, شـەش حـەوت شـێوازی فەلسـەفییانەی تـری تـاقی كردۆتـەوە : لـە 373 – 382 مـانی بـووە. لـەو سـاڵەدا رۆمـای جێهێشـتووەو لـە میـلان بـووە بـە مامۆسـتای رەوانبێـژی و لـەوێ كەوتـە ژێـر كاریگەریی ئەفلاتونیزمی نوێوەو ئەسقەفی میلانی بینیوە "سانت ئەمبرۆس" كە نێودارترین ئاینزای ئەو سەردەمە بووە لە ئیتالیا. نێودارترین كتێبی بریتیە لە "سەربردەو دانپیانـەكانم "400", پاشـان شـاری خـودا " 413 – 426" و زۆر نوسینی تریشی هەیە.

4-ئـەكوینی, سـانت تۆمـاس *Aquinas, Saint Thomas (1225-1274)* هەنـدێك جـار بـە نـاوی دكتـۆری ئینگلیزیی یان میری تۆژەرانەوە بانگ كراوە. ئەكوینی لە رۆكاســیكای ئیتالیــا لــە دایكبــووە, راهیبێكــی

دۆمینیكییـــه‌و له‌ســـه‌ر ده‌ســـتی ئـــه‌لبێری گـــه‌وره خوێندوویه‌تی. له‌ ماوه‌ی نێوان ساڵانی 1268 ـ 1272 لـه‌ پـاریس وانـه‌ی وتۆتـه‌وه‌. كاره‌كـانی كاریگه‌رییـه‌كی زۆریـــان له‌ســـه‌ر فه‌لســـه‌فه‌ی سكولاســـتی هـــه‌بووه‌و یه‌كێكیشه‌ له‌ سه‌ركرده‌كانی كه‌نیسه‌ی رۆمـان كاسۆلیك. لـه‌ دیـارترین كاره‌كـانی لێكدانـه‌وه‌كانی بـۆ كاره‌كـانی ئه‌ره‌ستۆ، "هه‌موو یه‌زدانگه‌رایی" كه‌ مردن رێگه‌ی نه‌دا تـه‌واوی بكـات، هـه‌روه‌ها "نیشـانه‌ فریشـته‌ییانه‌كه‌"، كه‌ یه‌كێكه‌ له‌ كاره‌ هه‌ره‌ كاریگه‌ره‌كانی له‌ سه‌ده‌ی سیازده‌، لـــه‌م كـــاره‌دا مه‌ســـه‌له‌ی په‌یوه‌نـــدیی نێـــوان ئـــایین و یه‌زدانگه‌رایی، ئیمان و عه‌قڵ ده‌خاته‌ روو. نوسینه‌كانی زنجـیره‌ وتـاری وشـك و روون و بـێ رووتوشـن، به‌ڵگـه‌ لایـه‌نگیره‌كانی تێزه‌كـه‌ی و به‌ڵگه‌ دژه‌كانی ده‌خاتـه‌ روو، پاشان ده‌كه‌وێته‌ هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه‌ی به‌هانه‌كانی دژه‌كانی. هـه‌موو كاره‌كـانی له‌سـه‌ر دوو بنـه‌ما دامـه‌زراون: ئـاینی مه‌سیحی و فه‌لسه‌فه‌ی ئه‌ره‌ستۆ.

5-دۆگمـا *Dogma* بریتیـه‌ لـه‌ وتـاری بـه‌ هـه‌ژمون و راشكاوی پێڕه‌وێكـی ئاینیی، كه‌ خراوه‌تـه‌ روو نـه‌ك بـۆ گفتوگۆ، به‌ڵكو بۆ بڕوا پێهێنـان بـه‌ دروستیی و دووریـی له‌ گومان، زاراوه‌كه‌ زیاتر تایبـه‌ت بووه‌ به‌ مه‌سیحییه‌ت. بۆ ئه‌وه‌ی چه‌مكێك سیفه‌تی دۆگما وه‌ربگرێت، پێویسته‌ به‌كه‌ڵكی ئه‌و حاڵه‌ته‌ بێت كه‌ تێیدا بـه‌كارده‌هێنرێت. ئـه‌م چـه‌مكه‌ زیـاتر لـه‌ مه‌سـه‌له‌ی سـرووش ــ وه‌حـی ــ یـه‌وه‌ گـه‌ردان كـراوه‌: واتـه‌ سرووش یـان وه‌حی كـه‌ لـه‌ لایـه‌نی كتێبی پیرۆز و داب و نه‌ریتـه‌وه‌ بڕیـاری له‌سـه‌ر درابێـت. هه‌نـدێجار زاراوه‌ی دۆگمـا بـه‌كارهێنراوه‌ بـۆ مشـتومڕو كێشمه‌كێشـی پێڕه‌وییانـه‌، بـه‌ مه‌به‌سـتی روونكردنـه‌وه‌ی دابوده‌ســتوری ئارســۆدۆكس لــه‌ رووی وێڵبوونــه‌ هــه‌ر ته‌قه‌بازییه‌كانـدا. لـه‌ سـه‌ده‌كانی سـه‌ره‌تای كه‌نیسـه‌دا، هه‌نـدێك دۆگمـای جیهـانیی هـه‌بوون كـه‌ تـا ئێسـتاش له‌لایـه‌نی زۆرینـه‌ی كه‌نیسـه‌كانی خـۆره‌لات و خـۆراواوه‌ تاوانبـار ده‌كـرێن، بـۆ نمونـه‌ پێناسـه‌كردنی كه‌سـێتی مه‌سـیح لـه‌ لایـه‌نی ئه‌نجومـه‌نی كالكیدۆنـه‌وه‌ ــ 451، هه‌ندێك دۆگمای تر له‌سه‌رده‌مانێكی دره‌نگتره‌وه‌ هاتوون و تایبـه‌ت بـوون بـه‌ كه‌نیسـه‌ی رۆمـان كاسـۆلیك، وه‌ك دۆگماكانی مارییان له‌مه‌ڕ چه‌مكه‌ پوختـه‌كان ــ 1859، هه‌روه‌ها دۆگمای پاكیزه‌یی پاپا ـ 870.

6-مه‌به‌سـتی لـه‌ ئـاینی ئیسـلامه‌، ئیسـلام *Islam* یه‌كێكه‌ لـه‌ سـێ ئایینـه‌ سـه‌ره‌كییه‌كه‌ی جیهـان، لـه‌ پاڵ جوله‌كه‌و مه‌سـیحییه‌تدا، كه‌ باوه‌ڕیـان بـه‌ یه‌كتاپه‌رسـتی هه‌یه‌، یاخود باوه‌ڕیان به‌ یه‌ك تاكه‌ خودا هه‌یه‌. له‌ زمانی عه‌ره‌بیـــدا، وشـــه‌ی ئیســـلام مانـــای ته‌ســـلیم بـــوون و خۆبه‌ده‌سته‌وه‌دان ده‌گه‌یه‌نێت، واته‌ خۆ ته‌سلیمكردن به‌ یه‌زدان. شوێنكه‌وتوی ئیسلام پێی ده‌وترێت موسلیم "به‌ زمـــانی كـــوردی موســـوڵمان" كـــه‌ مانـــای ئـــه‌و كه‌ســـه‌ ده‌گه‌یـــه‌نێت كـــه‌ خـــۆی ته‌ســـلیمی خوداكـــه‌ی كـــردووه‌. ئیسلامه‌كان هه‌مان ئه‌و خودایه‌ ده‌په‌رستن كه‌ مه‌سیحی و جوله‌كـه‌كانیش ده‌یپه‌رستن. بـاوه‌ڕی سـێنته‌ریی ئیسـلام بریتیه‌ له‌ باوه‌ڕ بوون به‌ یـه‌ك تاكـه‌ خـودای به‌ده‌سـه‌ڵات و دانا كـه‌ نـاوی ئـه‌ڵڵا یـه‌. ئـه‌و خودایـه‌ گـه‌ردونی دروست كـردووه‌. بـه‌ پێـی داب و ده‌سـتوری ئـه‌م ئایینـه‌، هـه‌موو موسوڵمانه‌كان له‌به‌رده‌می خودادا یه‌كسانن، واته‌ هه‌موو جیاوازییـه‌ چینایه‌تی و ره‌گـه‌زی و نه‌تـه‌وه‌یی و ته‌نانـه‌ت جیاوازییه‌ ئاینییه‌كانیش، هه‌موویان له‌بـه‌رده‌می خـودادا یه‌كسـانن. كۆمـه‌ڵگای ئیسـلامی پێـی ده‌وترێـت ئۆمـه‌تی ئیســـلام. ئیســـلام هـــه‌موو ئایینـــه‌كانی پـــێش خـــۆی هه‌ڵده‌وه‌شێنێته‌وه‌و نكولی له‌ دروستیی هـه‌موو ئاینێكی دیكـه‌ش ده‌كـات لـه‌ دوای خـۆی، په‌یامبه‌ره‌كـه‌ی نـاوی موحه‌مـه‌ده‌و ئیسـلامه‌كان بـه‌ دوایین په‌یامبـه‌ر له‌قه‌ڵـه‌می ده‌ده‌ن كه‌ به‌ پێی هه‌ندێك گێڕانه‌وه‌ ژماره‌یان 144 هـه‌زار دانه‌یه‌.

7-ئۆلماناك *almanac* بڵاوكراوه‌یـه‌كی سـاڵانه‌ بـوو، كـه‌ سـاڵنامه‌و پیشـبینی و ئه‌سـتێره‌ناسـی و ئاینـده‌زانی بڵاوده‌كـرده‌وه‌و لێكدانـه‌وه‌ی بـۆ مزگێنییـه‌كانی ئینجیـل

دەکرد.

8-فێتشـــــــیزم *Fetishism* زاراوەیەکــــــە لـــــە ئــەنترۆپۆلۆجیادا بــەکاردێت بۆپێناســەکردنی چــەمکی ئاینــداریی بەرامبــەری شــتێك یــان زینــدەوەرێك، واتــە پەرستنی شتێك، درەختێك، یان گیانەوەرێك، بۆ نمونە بەرانە کێوییەك، وەکو یەزدانێکی تایبەتی یان گشتی. هەروەها لە سایکۆلۆجیاشدا بەکاردێت بۆ پێناسەکردنی پەرستنی ئارەزووەکان، واتە پابەندبوونی لە رادەبەر بە ئارەزووەکانەوە.

9-نەمری *Immortality* بریتیە لە بوون و مانەوەی هەتاهــەتایی رۆح دوای ئــەوەی جەســتە دەمرێــت. لای زۆرێــك لــە ئایینــەکان، کــەلتورە جیاجیاکــان پــەیڕەوی نــــەمریی شــــتێکی بــــاوە. نــــەمریی بــــەپێی گــــۆڕانی تێڕوانینەکان فۆرمی جیاجیا وەردەگرێت، لای هەندێك لە پێڕەوەکان رۆح لە قۆناغێك لە قۆناغەکاندا دەگاتەوە بە جەستە کە جارێکی تر دەبوژێتەوە، بۆ ئەوەی دیسان هـــەمان خـــول دەســـتپێبکاتەوە. لـــە لای هینـــدووەکان، ئەوپەڕی ئاوانی مرۆڤ ئەوەیە کە رۆحی لە ناو رۆحی گەردونیدا بتوێتەوە. بوداییەکان باوەڕیان بە نێرڤانا هەیە و بریتیــە لــە حاڵــەتی ئەوپــەڕی پیرۆزیــی کــە لــە تــوێی فــەنابوونی تــەواوەوە بەدەســت دەهێنرێــت. لــە ئــاینی میســـرییە دێرینەکانـــدا. ژیـــانی مـــرۆڤ تاقیکردنـــەوەی یەزدانەو لـەوێوە بڕیار لەسەر چوونە ژوورەوەی بۆ ناو نەمریی دەدرێت. ئاینەکانی یۆنانییە کۆنەکان باوەڕیان بــە بــوونی جیهــانێکی تــر هــەبووە لــە خــوارەوە، کــە پێــی دەوترێت هادێس. لە مەسیحییەت و ئیسلامدا، نەمریی تەنیا بۆ رۆحە. ئەم دوو ئایینە بەوە لە ئاینی جولەکەکان جیا دەبنەوە کە لە رۆژی زیندوو بوونەوەدا، جەستەش دەژێتــەوەو لێپرســینەوەی گشــتی دەســتپێدەکات، ئــیتر رۆح دەچێتەوە ناو جەستەکەی خۆی و بە پێی چاکەو خراپــەکانیان پاداشــت و ســزا وەردەگــرن. لــە ئــاینی جولەکـــــەدا لەگـــــەڵ هاتنـــــەوەی موســــــادا ژیانـــــەوە دەستپێدەکات.

10-پرایڤـی، ئەنجومـەنی نهێنـی *privy council* کورتکراوەکەی *P.C : 1*. بریتیە لە ئەنجومەنی سەروەریی بەریتانی کە هەتا سەدەی حەڤدەهەم بالاترین دەزگای یاسادانان بووە، هـەروەها ئـەرکێکی گرنگیشـی لەسـەر شـــان بـــووە لـــە مەســـەلەی دانـــانی یاســـا و رێســـا مەسیحییەکاندا، کە لە زۆر حاڵەتدا، وەکو دادگای بالای تێهەڵچـوونەوە لـە کۆمۆنوێلسـدا رەفتـاری کـردووە. 2. ئەنجومـەنی پرایڤـی ئەنجومـەنێکی راوێژکارییـە لـە پـاڵ ئەنجومەنی جێبەجێکردندا.

11-کانتـــەربێری، سەرئەســـقەفی *Canterbury, Archbishop of* ســـــەرۆکی هـــــەموو ئەســـــقەفەکانی ئینگلتەرەیــە، لــە کەنیســـەی ئینگلیزیـــدا، دەســـەڵاتی یاسـایی بەسـەر زیـاتر لـە 29 ئەبرەشـییەدا هەیـە، لـە ناوچـەی کەنیسـەیی کانتەربێریـدا، هـەروەها ئەسـقەفی کەنیسەی کانتربێریشە، کە بۆ بەشی خۆرەڵاتی شاری کێنــت و ناوچـــەی گوندنشـــینی کرۆیـــدێن دامـــەزراوە. سەرئەسـقەفەکە جێگـای تایبـەتی لـە کانتـەرێری و لـە لامبێســی لەنــدەن هەیــە. ســەرکردەی بــاڵاترین گرووپــی کۆبوونەوەی کانتەربێرییە، واتە ئەنجومەنی کەنیسەیی کە نوێنەری هەموو کەنیسەکانی ئینگلتەرەیە، هەروەها سەرۆکی کۆنفرانسی لامبێسیشە، کە ئەنجومەنێکی دە کەسییە لە ئەسقەفەکانی کۆمەڵی ئینگلیزیی پێکهاتووە. هــەروەها بــە پێــی داب و نــەریت ئەنــدامی ئەنجومــەنی لۆردەکانیشە لە پەرلەمانی بەریتانیادا، بە دەستی خۆی تاج دەنێتە سەری پادشایانی ئینگلتەرە. لە ساڵی 597 دا، لەگـــەڵ گەیشـــتنی ســـانت ئۆگەســـتینی خـــەڵکی کانتــەربێری بــۆ کێنــت و شــۆردنەوەو خاوێنکردنــەوەی ئایینیانەی پادشا ئەلبێرت لە کەنیسەی سانت مارتن، کانتــەربێری، ئــەم پلەیــە دەســتی پێکــردووە. لــەماوەی ســەدەکانی ناوەڕاســتدا ململانێیــەکی دورودرێــژ لەســەر پێشەنگێتی لە نێوانی کانتەربێری و یۆرکدا هەبووە، لە

سەدەی چواردەهەمدا بە قازانجی کانتەربێری تەواو بووە. لە سەدەی شازدەیەمدا، تۆماس کرانمێر سەرئەسقەفی کانتەربێری بوو کە بڕیاری سەروەریی (1534) کەنیسەی ئینگلیزیی لە کەنیسەی ڕۆمان کاسۆلیك جیاکردەوە. لە ساڵی 1960 دا، جیۆفێری فرانسیس ی سەرئەسقەف سەردانی پاپا جان پۆڵی سیانزەهەمی کرد لە ڕۆما، بەوەش سەرەتای سەردەمێکی نوێی یەکگرتنەوەی دوو کەنیسەکە دەستی پێکرد. لە ساڵی 597 ەوە تا ئەمڕۆ 104 سەرئەسقەف کانتەربێرییان بەڕێوە بردووە. لە ساڵی 1991 ەوەو رۆبێرت ئەی کەی ریونیسای (1921–2000) لە ساڵی 1980 دا هەڵبژێردرابوو، جێگەی جۆرج لیۆنارد کارەی گرتبۆوە.

12–یەکێك لە هەوڵە گرنگەکانی پێشکەشکردنی پاساوێك بۆ بوونی یەزدان ئەم ئارگیومێنتە کۆزمۆلۆجییەیە، کە پێی دەوترێت ئارگیومێنتی یەکەمین هۆکار یان یەکەمین دروستکەر. دیارترین ئاینزاو بیریار کە بایەخیان بەم ئارگیومێنتە دابێت، تۆماسی ئەکوینی و ساموێل کلارکی فەیلەسوفی ئینگلیزیین و ئەمەی دواییان لە سەدەی هەژدەیەمدا ژیاوە. ئەم ئارگیومێنتە هەوڵیداوە روونی بکاتەوە کە بەپێی زنجیرە پرسیاری دروستکەرەکان، دەگەینە سەر ئەوەی کێ دروستکەری گەردوونە؟ وەڵامەکەشی ئەوەیە کە یەزدان ئەم گەردوونەی دروستکردووەو زنجیرەکەش لەوێدا رادەوەستێت، واتە پرسیاری ئەوەی کێ خودای دروست کردووە مانایەکی نامێنێت، چونکە زنجیرەیەکی نالۆجیکییانەی کێ دروستکەری دروستکەرەکەی دروستکردووە، ئەمە لە کاتێکدا کە بە پێچەوانەی سەرەتای زنجیرەکەوە، ئێمە شتێکی ئەوتۆ لە سروشتی خودا نازانین، تا بیر لە سروشتی دروستکەرێك بۆ ئەو بکەینەوە. بە بۆچوونی ئەم ئارگیومێنتە، بوونی یەکەمین دروستکەر شتێکی پێویستە، ئەو یەکەمین دروستکەرەش خودا (یەزدان) ە. یەکێك لەو رەخنانەی لەم ئارگیومێنتە گیراوە، دەڵێت مەرج نییە بوونی گەردوون سەرەتایەکی هەبێت و پێویستیشی بە دروستکەرێك نییە، چونکە پێویستە هەموو دروستکردنەکان لە شوێندا روودەن، لەگەڵ بوونی شوێنیشدا کات دەستپێدەکات. تەنانەت تێڕوانینە ئاینییەکانیش، کاتی خۆی کێشەی فەلسەفی ئاوا نارەحەتیان نەبووەو باسی بوونی خودا لە شوێندا دەکەن و کردەوەی دروستکردنی گەردونیش بە پێی کات دیاریی دەکەن. واتە لە لای ئەوانیش خودا لە بووندا کاردەکات، نەك لە نەبووندا. تیۆلۆجیستە هاوچەرخەکان ئەم گرفتە بە گەمەیەکی زمانەوانی و تا رادەیەکیش لۆجیکییانە چارەسەر دەکەن و خودا لە هەموو ئەو یاسایانە دەردەهێنن کە بەسەر گەردووندا پیادە دەبن و دەڵێن یاساکانی مرۆۋ بەسەر دروستکەرەکەیدا پەیدا نابێت. هۆی ئەمەش دەبەنەوە بۆ بوونی جیاوازیی جەوهەریی لە نێوانی مرۆۋ ، گەردون (دروستکراو) لەگەڵ یەزدان (دروستکەر) دا. بەڵام رەخنەگرەکانیان پێدادەگرن لەسەر ئەوەی کە مەرج نییە زەرورەتی هەبوونی خودێکی باڵا، بتوانێت بیسەلمێنێت کە خوداش بوونی هەیە. چونکە رەنگە ئەو خودە باڵایە (ئەگەر هەبێت و بەرپرسیار بێت لە بوونی ئەم گەردوونەو یاساکانی) بەپێی دەسکردو کردەوەکانی، کۆمەڵێك خەسڵەتی تێدا دەبێت، کە خەسڵەتی ئەو خودایە نین کە ئایینەکان باسی دەکەن. بە تێڕوانینی ئایین خودا یەکپارچە چاکە، بەڵام لە بوونی گەردوون و روداوەکانی ناویەوە بۆمان دەردەکەوێت کە خراپیش واقیعێکی حاشاهەڵنەگرە، مادام ناشکرێت خراپ بدرێتە پاڵی یەزدان، ئەوا ئەو خودە باڵایە یەزدان نیە، بەمەش ئارگیومێنتەکە ناگاتە سەلماندنی بوونی یەزدان. وەلێ دیسان ئاینزاکان دێنەوەو خراپە دەکەن بە خەسڵەتێکی مرۆیی، یاخود دەیدەنە پاڵی بونەوەرێکی دیکەی

تایبەت بە خراپەكاریی (شەیتان) و لە خودا دایدەبڕن. هەندێك لە ئایینەكانیش پێڕەویی لە بالآیی دوو هێزی بەگژیەكداچوو دەكەن كە یەكێكیان بەرپرسە لە چاكەو ئەوەی تریشیان لە خراپە. بەڵام رەخنەگران وازناهێنن و دەڵێن بەڵگەی ئەوەی كە یەزدان بوونەوەرێكی خراپی دروست كردبێت, خۆی بەڵگەی ئەوەیە كە یەزدان لە سەدا سەد چاك نیە, كەواتە یان ئەوەتا ئەو خودە بالآیە یەزدان نیە, یاخود ئەو یەزدانەی ئایین باسی دەكات بوونی نیە.

13–میلْ, جۆن ستیوارت *Mill, John Stuart (1806-1873)* فەیلەسوف و ئابوریناسێكی بەریتانییە, كوڕی جەیمس میلە, كاریگەرییەكی زۆری لەسەر بیركردنەوەی سەدەی نۆزدەیەمی بەریتانیا هەبووە, نەك تەنیا لە فەلسەفەو ئابوریيدا, بەڵكو لە بوارەكانی زانستە سیاسییەكان و لۆجیك و ئێتیكیشدا. لە رۆژی 20 ی مایسدا لە لەندەن لە دایكبووە, لە تەمەنێكی زۆر زووەوە باوكی دەستی داوەتە فێركردنی, سەرەتا لە تەمەنی سێ ساڵیدا زمانی یۆنانیی پێخوێندووە. لە تەمەنی 17 ساڵیدا بە باشی شارەزای ئەدەبی یۆنانی, فەلسەفە, كیمیا, رووەكزانی, سایكۆلۆجی و یاسا بووە. لە كتێبەكانی پرەنسیپەكانی ئابوری سیاسی ــ 1848, دەربارەی ئازادی ــ 1859, پرەنسیپی سودگەرایی ــ 1863, دەربارەی چەوساندنەوەی ژنان ـــ 1869, هەروەها سێ لێكۆڵینەوە دەربارەی ئایین.

14–هیندویزم *Hinduism* ئاینێكە لە هیندستان سەری هەڵداوەو تا ئێستاش زۆرینەی دانیشتووانەكەی باوەڕیان پێیەتی و ئەو خێزانانەی لەوێشەوە رەویان كردووە بۆ بەشەكانی تری زەوی ( خۆرهەڵات و باشوری ئەفریقیا, باشوری خۆراوای ئاسیا, خۆرهەڵاتی ئەندیز, لەگەڵ ئینگلتەرە). وشەی هیندو لە وشەی سیندوی سانسكریتییەوە وەرگیراوە, مانای رووبار دەگەیەنێت و لە سەدەی پێنجەمی زاینییدا كوڕێكی فارس بەو ناوەوە بانگی كردوون و ئیتر بەسەریاندا دابڕاوە. كتێبی پیرۆزی هیندۆسەكان ناوی ڤیدایە (*Veda*) , ژمارەی باوەڕدارانی نزیكەی 700ملیۆن كەس دەبێت.

15–نیوتن, سێر ئیزاك *Newton, Sir Isaac (1642-1727)* فیزیازان و ماتماتیكزان و فەیلەسوفێكی ئینگلیزە, بەیەكێك لەهەرە مەزنترینەكانی زانستی مرۆڤایەتی لەقەڵەم دەدرێت. نیوتن یاساكانی كێشكردن و جوڵانی گەردوونی دۆزیوەتەوە, ئەویاسایانەی روونی دەكەنەوە كە تەنەكان لەسەر زەوی و لەناو بۆشاییشدا چۆن دەجووڵێن. ئەم زانایە بناغەی زانستی نیگاكاریی ـ بصریات ـ یاخود رەفتاری تیشكی داڕشتووەو, یەكەمین تەلیسكۆپی پەرچكەرەوەشی بیناكردووە.

16–ئاینشتاین, ئەلبێرت *Einstein, Albert (1879-1955)* فیزیازانێكی ئەمریكیی بەڕەگەز ئەڵمانییە, خاوەنی خەلاتی نۆبڵە. بەهۆی هەردو تیوریی رێژەیی تایبەت و رێژەیی گشتییەوە ناسراوە, لەپاڵ گریمانەكەیدا لەمەڕ سروشتیی گەردیلەییانەی تیشك. لەوانەیە نێودارترین زانای سەدەی بیستەم بێت.

17–ئارسۆدۆكسی, كەنیسەی *Orthodox Church* یەكێكە لە سێ لقە سەرەكییەكەی ئاینی مەسیحیی, بەردەوامییەكی مێژوویی هەیە بەو كۆمەڵگایەوە كە قوتابییەكانی مەسیح لەناوچەی دەریای ناوەڕاستدا دایانمەزراندووەو بەئەوروپای خۆرهەڵاتدا بڵاو بۆتەوە. وشەی ئارسۆدۆكس لەوشەی *orthodox* ی یۆنانییەوە هاتووە كەمانای باوەڕی راست دەگەیەنێت. پێڕەوی ئارسۆدۆكسی لەئەوروپای خۆراواشدا كەنیسەی خۆی دامەزراندووەو بەم دواجاریش گەیشتووە بەئاسیاو ئەفریقیاش. ئێستا زیاتر لە 174 ملیۆن باوەڕداری هەیە لەسەراپای جیهاندا. ئەم پێڕەوە بەناوی ئارسۆدۆكسی كاسۆلیك *Orthodox Catholic* هەروەها ئارسۆدۆكسی گریكیی *Greek Orthodox* و ئارسۆدۆكسی خۆرهەڵاتییشەوە *Eastern Orthodox* ناو

دەبرێت.

18-ڤۆڵتێر (1778-1694) *Voltaire* ناوی خواستراوی فرانسیس ماری ئارۆیتە, نوسەرو فەیلەسوفێکی فەرەنسییە, یەکێکیشە لە رابەرانی رۆشنگەریی. یەکێکە لەنوسەرە مەزنەکانی سەدەی هەژدە لەفەرەنسا, دوژمنی سەرسەختی ستەمکاری بوو, نوسینەکانی تاڕادەیەکی زۆر رەخنەئامێز و گاڵتەجاڕ بوون. زۆرجار بۆچونە لیبراڵ و کراوەکانی کێشەیان بۆ دروست کردووە, دیارترین نوسینەکانی مشتومڕە فەلسەفییەکان و کاندیدە, هەروەها ژمارەیەکی زۆریش شانۆنامەی نوسیوە. ژمارەیەك لەنوسینەکانی بریتین لەهەجوویەکی توندی دادوەرێکی فەرەنسیی کەناوی فیلیپی دووەم بووە, لەبەر تاوانە دزێوەکانی, تا سەرەنجام لەبەندیخانەی پاستێلدا بۆ ماوەی یازدە مانگ زیندانیی دەکرێت. لەم ماوەیەدا شانۆنامەی ئۆدیپۆس تەواو دەکات, کە لەئۆدیپۆسی ستەمکاری گریکەوە وەرگیراوە, کە سۆفۆکلیس نوسیویەتی. هەروەها چەند شیعرێکی هەجووی دەربارەی هینری چوارەمیش نوسی. پاش ئازاد بوونی , جارێکی تریش بۆ ماوەی دوو هەفتە دەگیرێتەوە لەبەر ئەوەی لەگەڵ چەند خێزانێکی نێوداری فەرەنسادا بەشەڕدێت, پاشان بەو شەرتەی فەرەنسا جێبهێڵێت و بەرەو ئینگلتەرە بکەوێتە رێ, ئازاد دەکرێت. ماوەی دووساڵ لەلەندەن دەمێنێتەوەو هەرزووفێری زمانی ئینگلیزیی دەبێت و شیعرەکانی خۆی پێ بڵاو دەکاتەوە, هەروەها دوو وتاری زۆر گرنگیش دەنوسێت, یەکێکیان دەربارەی قەسیدەی داستان و ئەوی تریشیان دەربارەی مێژووی جەنگی ناوخۆی بەریتانیا.

19-داروین, چارلس رۆبەرت *Darwin, Charles Robert (1809-1882)* زانایەکی بەریتانییە, کە تیورەی پەرەسەندنی هێنایە ئاراوە, لەمەڕ پەرەسەندنی هەموو چەشنەکانی ژیان لەتوێی پرۆسێسێکی هێواشی هەڵبژاردنی سروشتییەوە. کارە سەرەکییەکەی کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر ژیان و زەمین و زانست و هەروەها لەسەر بیرکردنەوەی مۆدرێن بەگشتی.

20-کوکلۆکس کلان *Ku Klux Klan* رێکخراوێکی نهێنی تیرۆریستانەیە, لەماوەی سەرلەنوێ بیناکردنەوەی دوای شەڕی ناوخۆی ئەمریکادا لە ویلایەتەکانی باشوری ئەمریکادا دامەزرێنراوەو لە سەدەی بیستەمیشدا گەیشتۆتە پانتایی بەرینتر. لە ماوەی نێوان سالانی 1865 –1866 دا کلانی ئەسڵی لە بولاسکی– نتێنێس دامەزرێنراوەو شەش کەسی ئەفسەر لە سوپای کۆنفیدراسیۆنی پێشوودا بوون, ناو کۆمەڵەکەیان لە وشەی یۆنانی کوکلۆس (بازنە) وە خواستۆتەوە. گەرچی کو کلۆس کلان وەك رێکخراوەیەکی کۆمەڵایەتی گاڵتەوگەپ دامەزرێنرابوو, بەڵام زۆری پێنەچوو چالاکییەکانی دژی کۆمارییەکانی ناو حکومەت و سەرکردە حکومییەکان ئاڕاستە کرا, چ رەش بن یان سپی, ئەوانەی لە ساڵی 1867 دا لە ویلایەتەکانی باشوردا دەسەڵاتیان وەردەگرت.

21-فاشیزم *Fascism*, ئایدیۆلۆجیایەکی سیاسیی مۆدرێنە, دەیەوێت ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابوریی و کەلتوریی کۆمەڵگا لەسەر بنەمای قووڵکردنەوەی هەستی نەتەوایەتیی یاخود ناسنامەی ئەتنیکیی رێك بخاتەوە. فاشیزم بیرە ئازادیخواکانی لە وێنەی سەربەستی و مافە تایبەتییەکانی تاکەکەس رەتدەکاتەوەو, گەلێك جار هێز بەکاردەهێنێت بۆ سەرکوتکردنی هەڵبژاردنی ئازاد و ئەنجومەنی یاسادانان و توخمەکانی تری دیموکراسیەت. لەپاڵ ئامانجە ئایدیۆلۆجییەکانیدا, فاشیزم هەوڵ دەدات بۆ بیناکردنی کۆمەڵگای فاشی لەجیهاندا,جا بەشەڕ بێت یان بە چەوساندنەوە. ئەنجامەکەشی کوژرانی ملیۆنەها کەس بوو لەسەدەی رابردوودا. سەرەنجام فاشیزم بەتەواویی لەگەڵ بالی راستی رەگەز پەرستیی,

جیاکاریی ڕەچەڵەك، تۆتالیتاریزم، هەروەها توندوتیژییدا، دا تەبایە.

22–کانت، ئەمانوێل *Kant, Immanuel (1724-1804)* فەیلەسوفێکی ئەڵمانییە، بەڕای زۆر لەبیریاران مەزنترین فەیلەسوفە لەسەردەمی مۆدێرندا. دەرچووی زانکۆی کینگسبورگەو فیزیاو ماتماتیکی خوێندووە، پاشان بۆ ماوەی پازدە ساڵ دەرسی وتۆتەوە. سەرەتا زانست و فیزیای دەوتەوە، پاشان ورده ورده وانەکانی فراوان کردەوەو، زوربەی لقەکانی فەلسەفەشی گرتەوە. لەمیانەی نوسین و وانەکانییەوە شۆڕەتێکی باشی پەیدا کردووە، بەلام هەتا ساڵی 1770 کورسی ئوستادێتیی لەزانکۆ بەدەست نەهێناوە، کە دەبێت بەپرۆفیسۆری لۆجیك و میتافیزیا، ماوەی بیستوحەوت ساڵی دواتر لەسەر وانەوتنەوەی ناو زانکۆ بەردەوام بووە. وانە نا . ئاینییەکانی کانت، کە زیاتر لەسەر عەقلانییەت دامەزرابوون، نەك سروش یان وەحیی ئاینیی، تووشی چەند قەیرانێکیان کرد لەگەڵ حکومەتەکەی پروسیاداو، لەساڵی 1792دا، پادشا فرەدریکی دووەم فەرمانی پێدەکات کە نابێت دەربارەی بابەتە ئاینییەکان وانە بڵێتەوە یان بنوسێت. کانت بۆ ماوەی پێنج ساڵ گوێڕایەڵی ئەم فەرمانە دەبێت، دوای ئەوە پادشا دەمرێت، بۆیە دیسان تێهەڵدەچێتەوە. ساڵێك دوای خانەنشین بوونی ، واتە لەساڵی 1798دا، پۆختەی بۆچوونەکانی خۆی لەمەڕ ئایین بەچاپ دەگەیەنێت.. لەساڵی 1781دا کتێبە ڕەخنەگرتن لەعەقڵی پەتی *Critique of Pure Reason* بەچاپ دەگەیەنێت، کە بەگرنگترین کتێبی ئەو دەژمێردرێت.

23–ئارگیومێنت *argument* گەرچی دەتوانین لە زمانی کوردیدا وشەی مشتومڕ بەرامبەری ئەم زاراوەیە دابنێین و تا ڕادەیەکی زۆریش ماناکە دەپێکێت، لە زۆر شوێنیشدا وامان کردووە. وەلێ ئەم زاراوەیە لە ئاخاوتن و دانوساندنە فەلسەفییەکاندا زۆر دوبارە دەبێتەوە، بۆیە جێی خۆیەتی وشەکە بێتە ناو زمانەکەمانەوەو خوێنەری کورد پێی ئاشنا ببێت، بە تایبەتی لەم دواییەدا کە هەندێك لە نوسەرانیش وەکو خۆی بەکاری دەهێننەوە. لە زمانی فەلسەفەدا زاراوەکە مانایەکی بەرینی هەیە، بەلام دەتوانرێت بوترێت کە لە زمانی فەلسەفەدا زاراوەکە بۆ دەربڕینێك یان تێزێکی لۆجیکییانە بەکاردەهێنرێت کە دەرەنجامێکیشی لەگەڵدایە، واتە بیرکردنەوەو ئاخاوتنێکی عەقلانییانە کە لە پێشەکییەکەوە یان چەند پێشەکییەکەوە دەستپێدەکات و دەگاتە پێشکەشکردنی بەڵگەو دەستاوێژ بۆ دەرەنجامێکی چاوەڕوانکراو یان چاوەڕوان نەکراو.

24–یەزدان *God*، بریتیە لەو سێنتەر یان چەقەی کە باوەڕداران گوێڕایەڵی و دڵسۆزیی خۆیانی ئاراستە دەکەن. یەزدان یاخود خودا بوونێکی پیرۆزە یاخود ئەڵتەرناتیفی بوونی مرۆییە، هەموو پیرۆزیی و نوێژە ئاینییەکان بۆ ئەو ئەنجام دەدرێن، بە تایبەتی لە ئاینە یەکتاپەرستەکاندا. یەزدان بە ئەفرێنەر یاخود سەرچاوەی هەموو ئەو شتانە دادەنرێت کە هەن. یەزدان ڕاستەوخۆ پیوەندیی بە مرۆڤایەتییەوە نیە، بەڵکو لە زمانی پەیامبەرەکانییەوە پەیوەندیی پێوە دەکات. خاوەنی سیفەتەکانی ناکۆتایی و نەمریی و جێگیریی و چاکەو داناییە ( هەموو شتێك دەزانێت)، هەروەها بەتواناییە (خاوەنی هەموو دەسەلاتەکانە). زۆرینەی ئاینەکان چەند سیفەتێکی مرۆیی دەدەنە پاڵ یەزدان جا چ بەشێوەیەکی ئەدەبی بێت یاخود بە شێوەیەکی میتافیزیایی، لە نمونەی ئیرادە، خۆشەویستی، تووڕەبوون و لێبوردن.

25–لاوتزو یان لاوزی *Laozi or Lao-tzu (570?-490? bc)* فەیلەسوفێکی چینییە بە دامەزرێنەری دوایزم دادەنرێت. . لە هەرێمی هێنان لە دایك بووەو دواتر بووە بە دادوەرێکی لیبراڵ. وا بڕوایە کە کتێبی داودیجین ئەو نوسیبێتی، ئەم کتێبە تێزێکی فەلسەفییانەیە. لە ناو

ئەدەبی چینیدا, ئەم کتێبە بچووکە کاریگەرییەکی زۆر زۆری لەسەر شێوازی بیرکردنەوەی چینی هەبووە, لە هەمووشیان زیاتر بۆ زمانەکانی دیکە وەگێڕدراوە. باسی ئەوە دەکات کە ڕێگا (داو یان تاو) لە تویێی ناسینەوەو دەستکردن بە عەدەمەوە دەدۆزرێتەوە. لای ئەو دانایی بریتیە لە تێگەیشتنی ئەوەی کە لاوازیی بە تەواویی یەکسانە بە بەهێزی , کامەرانی لەسەر نەهامەتی ڕاوەستاوە. سستی گەورەترین جوڵەیە.

26–کاسۆلیك, کەنیسەی ڕۆمانیی ***Roman Catholic Church***, بریتیە لەفراوانترین بەشی ئاینی مەسیحی, لەو مەسیحییانە پێکهاتووە کە ملکەچن بۆ دەسەڵاتی پاپای ڕۆما. وشەکە لە وشەی ***katholikos*** ی یۆنانییەوە هاتووە, کە مانای گەردونیی یان جیهانیی دەگەیەنێت و هەر لەسەرەتاکانی ئاینی مەسیحییەوە بەکارهاتووە, ئەوکاتەی کە تاکە کەنیسەی مەسیحیی بووە.

27–هاتنەوەی دووهەم, یان پارۆسیا ***Second Coming, also Parousia*** بریتیە لە گەڕانەوەی مەسیح لە فرۆمێکی مرۆیی بینراودا بۆ زەوی. ئەمەش لەسەر بناغەی چەند قسەیەکی مەسیح خۆی بینا کراوە. لەسەردەمی خۆیدا, هاوەڵ و شوێنکەوتووەکانی مەسیح وایان دەزانی ماوەیەکی کورت دوای لە خاچدرانی دەگەڕێتەوە و سەردەمی مەلەکوتی یەزدان دەستپێدەکات (مەتتا 24 : 29–31, مەرقۆس 13: 24–27, لۆقا 21: 25–28). بەڵام دوای ئەوەی ساڵان تێپەڕین, سەرکردەکانی کەنیسە هاتنە سەر ئەو باوەڕەی کە مانای ڕاستەقینەی وشەکانی مەسیح و پەیمانەکانی زیاتر لە ژیانی ڕۆحیدا دەدۆزرێنەوە, نەك لە ژیانی سەر زەمینیی فانیدا. لە سەردەمەکانی دواتردا,پێڕەوی هاتنەوە مەسیح دوو شێوەی وەرگرت: یەکەم, پێی وایە ئەو گەڕانەوەیە پێش تێپەڕینی هەزار ساڵ بەسەر مەرگی مەسیحدا دەبێت, بە هاتنەوەشی سەردەمی زێڕینی کەنیسە دەستپێدەکات. لایەنی دووهەمیشیان پێی وایە دوای هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە. ئاینی ئیسلامیش پێی وایە مەسیح بە هیچ جۆرێك لە خاچ نەدراوە, بەڵکو بەر لەوەی بکوژرێت یەزدان هەڵی کێشاوە بۆ ئاسمان و لەوێ دەمێنێتەوە تا ئەو ساتەی دەجال دێت, ئیتر مەسیح دێتە خوارەوە بۆ سەر زەوی و دەجال دەکوژێت و دوای ماوەیەکیش قیامەت دەستپێدەکات.

## سەرچاوە

***Blackdog Media 2001-2003***

# جان بودان
# (1530-1596)

د. موسا ئیبراهیم
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

**بەرایی:**

سەدەی شانزە فۆرمەلەبوونی شۆڕشێکی فیکریی نوێی بەخۆیەوە بینی و بووە مایەی تێکوپێکدانی ئەو بنەما فیکری و سیاسییەی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە ئارادابوو. گرنگترین دەرەنجامەکانی ئەم شۆڕشە فیکرییە نوێیە پتەوکردنی دەسەلاتی رەهای پادشاکان بوو لە بەرامبەر دەسەلات و نفوزی پاپاکاندا، بە تایبەتی دوای سەرهەلدانی بزوتنەوەی ریفۆرمی ئاینی. هەر لە تایبەتمەندییەکانی تری ئەم سەدەیە، دۆزینەوە زانستی و جوگرافییەکان و پاشەکشێکردنی ئەخلاق و نەریتی سەدەکانی ناوەڕاست بوو، لەگەل گۆڕانی شێواز و ئامرازی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان، ئەمەش بووە مایەی گەشەکردنی چینی ناوەند.

تایبەتمەندییەکی تری سەدەی شانزە، بەرپابوونی جەنگە ئاینی و مەزهەبییەکان بوو کە سەرتاسەری ئەورووپای گرتبووەوە. بۆ نمونە فەرەنسا لە ماوەی نێوان سالی 1562 تا 1598، لانی کەم هەشت شەڕی ناوخۆیی ئاینیی بەخۆوە بینی کە گەورەترین تاوانیان تێدا ئەنجامدرا، بە تایبەتی قەسابخانەکەی (سان براتلیمی). لەم ڕووداوەدا زۆربەی زۆری پرۆتستانتەکان قەتل و عام کران. لە میانەی ئەم جەنگانەدا پشێوی لە سیستمی حوکمڕانی فەرەنسادا دروستبوو، ئەمەش ڕێی بۆ زۆر لە خانەدانەکان خۆشکرد تا دەست بەسەر مولك و مالاتەکانیاندا بگرنەوە و لە بەرامبەریشدا پادشا کۆنترۆلی بەسەر زۆربەی خاکی فەرەنسادا لە دەستدا.

هۆکاری ئەو جەنگانە بە تایبەتی (لە فەرەنسا)، دەگەڕایەوە بۆ ئەو ناکۆکییە مەزهەبیانەی کەم تا زۆر پەیوەندی بە بەرژەوەندی هێزە ئابووری و سیاسیەکانەوە هەبوو.

سیستمی پاشایەتی لە فەرەنسا كە خەسڵەتێكی مەركەزیانەی لە حوكمكردندا هەبوو، لە ناوەڕاستی سەدەی شانزەوە دووچاری قەیرانگەلێكی قوڵ بووەوە. كارێك كە بووە مایەی ئەوەی توێژێكی گەورەی چینی ناوەند، بۆ ماوەیەكی دیاریكراو متمانەی خۆیان لە پادشا بسێننەوە. هاوكات نالەباری و خراپی سیستمی باج و سستی نواندن لە بەدیهێنانی دادپەروەری و خەمساردی فەرمانبەران، هەموویان پێكەوە بوونە مایەی پاشەكشێ و گەڕانەوە بەرەودواوە[1].

لەگەڵ ئەم هەلومەرجە نالەبارەداو دەستكەوتی زۆری خانەدانەكان لە هەرێم و شارەكان و مانەوەی پاشماوەی سیستمی سەدەكانی ناوەڕاست لە هەندێ ناوچەدا، بوونە هەڕەشە و مەترسیەك بۆ لاوازكردنی ئەو سیستمە تازە و دەوڵەتە نیشتیمانیەی حوكمی پاشایەتی مەركەزی دروستیكردبوو. ئەگەرچی ئەم كێشانە كێشەی ئایینی نین، بەڵام هەموو لایەنەكان ئاینیان لە پێناو بەرژەوەندی خۆیاندا بەكاردەهێنا، ئیتر چ خانەدانەكان بووبێت یان ئیماندارەكان.

ئەم جەنگانە بۆ ماوەیەكی كاتی بوونە مایەی لاوازكردنی دەسەڵاتی پادشا، بەڵام لە ئاستێكی دوور ـەودادا كاریكردە سەر توندكردن و بەهێزكردنی دەسەڵاتی حوكمڕانی ئەو. ئەوەبوو لە كۆتایی ئەو سەدەیەدا و لە سایەی تیۆری حوكمڕانی رەهای پادشایەتیدا، دەسەڵاتی مەركەزی كاراو بەهێزی پادشایەتی رەگی داكوتا.

لەماوەی جەنگە ئاینییەكانی سەدەی شانزەو دوای ئەوەش، نووسینی سیاسی جموجۆڵێكی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی و لە فەرەنسادا ژمارەیەك نووسەر و بیریاری نیشتمانپەروەر میانرەوو واقیعی بەدەركەوتن. ئەمانە پێیانوابوو كەرتبوون و دابەشبوونی مەسیحیەت بەسەر خۆیدا راستییەكی حاشا هەڵنەگرە و نكوڵی لێناكرێت، هیچ ئومێدێكیش بۆ یەكگرتنەوە لە ئارادا نییە و ناشكرێت بە زەبری هێز ناكۆكی نێوان ئاینزاكان چارەسەر بكرێت. لە سایەی ئەم واقیعە نوێیەدا، ئەو نووسەرانەی كە بە "سیاسەتمەداران" ناسرابوون، پێیان وابوو دەوڵەتی یەكگرتووی نیشتیمانی لە سنوری دەسەڵاتی خۆیدا، رێگرنییە لە بەردەم بوونی دیاردەی فرە ئایینی و فرە مەزهەبی و بگرە بە پێكەوە ژیانی نەتەوەیی هەموو ئەو ئاینانە دەتوانن لە چوارچێوەی پرانسیپی ئازادی بیروڕای هاوولاتیاندا، مومارەسەی مافەكانی خۆیان بكەن[2].

هەروەها ئەو بیریار و نووسەرانە پێیان وابوو (دەسەڵاتی پاشایەتی بنەمای یەكێتی و ئاشتی و ئارامییە، لەبەرئەوە هەوڵێكی بێشوماریاندا بۆ ئەوەی پادشا بكەنە سێنتەری یەكێتی نیشتمانی و دەسەڵاتێك كە دەستی بەسەر هەموو مەزهەبە ئاینی و پارتە سیاسیەكاندا بكشێت.. خاڵی هاوبەشی نێوان ئەو بیریارانە بریتیبوو لە ئایدیای پارتە سیاسیەكاندا بكشێت.. خاڵی هاوبەشی نێوان ئەو بیریارانە بریتیبوو لە ئایدیای تۆلێرانسی ئاینیی، چونكە ئەوان ئامادەیی تەواوی ئەوەیان تێدابوو لە چوار چێوەی یەك دەوڵەتدا رێگا بە بوونی چەندین ئاینی جیاجیابدەن، لەبەرئەوەی ئامانجی ئەوان پاراستنی یەكگرتوویی نەتەوەی فەرەنسا بوو، تەنانەت گەر لەم پێناوەیشدا قوربانیان بە ئایین و یەكگرتووی ئاین دابێت)[3].

"بودان" بە یەكێك لە گرنگترین ئەو بیرمەندانە دادەنرێت كە لەو قۆناغەدا نووسیویانە، واتە قۆناغی شەڕی ناوخۆیی لە فەرەنسا كە نیشتیمانەكەی دابەشكرد و ولاتەكەی لە گرێژنە

بـرد. لـە پێنـاو كۆتـایی هێنـان بـەو هەلومەرجـە نالـەبارەدا، "جـان بـودان" تیۆریایـەكی دەربـارەی سـەروەری داڕشـت و خسـتیەبەر دەسـتی پادشـا، چـونكە پێیوابـوو پادشـا سـەركردەی نەتـەوە و سیمبولی یەكێتی و مانەوەی نەتەوەیە.

**بەگشتی:**

"جـان بـودان" سـالّی 1530 لـە شـاری (ئەنجیـە)ی فەرەنسـا هاتۆتـە دنیـاوە. لەسـەردەمی شـەڕ و جەنجالّیـدا گـەورە بـووە. لـە تۆلـۆز یاسـای خوێنـدووەو دەوروبـەری سـالّی 1561 لـە دادگـای پـاریس بۆتـە پـارێزەر. وەكـو پـارێزەرێكی لێهـاتوو نووسـەرێكی ئـابووری، سـەرقالّی بنـەبڕكردنی پشـێوی و چەسـپاندنی سـەروەری یاسـابووە. لـەم پێناوەشـدا بەشـێوەیەكی بەرچـاوو چـالاكانە بەشداری كێشـە گشـتییەكان دەكـات. سالّی 1571 پەیوەنـدی دەكـات بـە دۆق *Alenson* و دەبێتـە راوێـژكاری و لەگەلّیـدا سـەردانی هەریـەك لـە ئینگلستان و هۆلّەندە دەكات.

سـالّی 1576 وەكـو نوێنـەری ناوچـەی *Vermandois* هەلّدەبـژێردرێت و لـە شـاری *bolis* دا دەبێتە ئەندامی ئەنجومەنی گشتی چینەكان و تێیدا ڕۆلّی گەورە دەبینێت، لەو ئەنجومەنەدا هەلّوێستی بـوێر و بەرپرسـیارانە لـە ئاسـت مەسـەلەكاندا وەردەگرێت، بە تایبەتی ئەو مەسەلانەی پەیوەندیان بـە ئـازادی بـیروڕا و دادپـەروەری و ئاشـتی و ئارامییەوە هەیە.

"بودان" لەسەر ئەم كارە بەردەوام بوو، تا ئەو كاتـەی وەك بریكـاری پادشـا لـە دادگـا سەرپەرشـتیارانی شـاهانە لـە *Laon* دامـەزراو هـەر لەوێشـدا مایـەوە، تـا لـە سـالّی 1596 بـە نەخۆشـی تـاعون كۆچـی دواییكـرد. دوای خـۆی گـرنگترین دەسـكەوتی فیكـری سـەدەی شـانزەی، بـۆ فیكـری سیاسی بەجێهێشت كە بریتی بوو لە (شەش كتێب دەربـارەی كۆمـار). ئـەم كتێبـەی سـالّی 1576 بـە چـاپگەیاند و دەسـتبەجێ و دوای بلاّوبوونـەوەی سەركەوتنێكی بەرچاوی بەدەستهێناو چەند جارێك بـە زمـانی فەرەنسـی چـاپكرایەوە. سـالّی 1586 چاپی لاتینیەكەی دەرچوو، هەروەها وەرگێردرایە سـەر زمـانی ئیتـالّی و ئیسـپانی و ئـەلّمانی. هۆكارگەلێك هەبوو وایان لە "بودان" كرد بۆ ئەوەی ئەم كتێبە بنووسێت:

1–ئەو پێیوابوو دوای "ئەرستۆ" كەس كتێبی وای نەنوسـیوە كـە بـاس لـە هـەموو مەسـەلەكانی سیاسـەت بكـات، بۆیـە ئـەو دەیـەوێت ببێتـە "ئەرسـتۆی نـوێ" و كتێبێكـی تـازە دەربـارەی سیاسـەت بنووسـێت و تیایـدا ئـەو یاسـایانە دەستنیشـانبكات كـە كـۆنترۆلّی سـەرجەم ڕووداوە سیاسیەكان دەكات.

2–"بـودان" بـە نووسـینی (شـەش كتێـب دەربارەی كۆمار)، دەیەوێت تێزەكانی "ماكیاڤیلی" رەتبكاتـەوە و زۆر دلّگرانیشـە لـەوەی بیروبۆچـوونەكانی لـە فەرەنسـا بلاّوبوونەتـەوە. بـە بـڕوای ئـەو ئـەوەی دەسـتی لـەم كارەشـدا هەیـە *Catherine de Medicis* كـە بیروبۆچـوونەكانی "ماكیاڤیلی" لە ئیتالیاوە هێناوەتە ناو فەرەنساوە. لەگـەلّ ئەوەشـدا "بـودان" قـەرزارباری "ماكیاڤیللی"یـە، چـونكە یەكـەمین كەسـێكە دوای "ئەرسـتۆ" بەشـێوەیەكی زانسـتی لـە دەولّـەتی كۆلّیبێتەوە، لەم پرۆسەیەشدا پشت ئەستوور بووە بە بەلّگە واقیعیەكان و ئەو ڕووداوە سیاسیانەی بە فیعلـی ڕوویانـداوە. ئـەو وەكـو "ماكیـاڤیللی" خوازیـاری دەولّـەتی نەتـەوەیی بـووە، بـەلاّم لـەوەدا لێی جیابۆتەوە كە ئەم پیاوێكی ئاینیی و ئەخلاقی

بووە، واتە بە پێچەوانەی "ماکیاڤیلییەوە" کە تێڕوانینی بۆ دەوڵەت تێڕوانینێك بووە دابڕاو لە ئاین و ئەخلاق. هەرچەندە "بودان" خاوەنی بیروباوەڕێکی ئاینیی دیاریکراو نەبووە، بەڵام لە بڕیارەکانیدا هاوسەنگیەکی ئەوتۆی هەبووە کە کەس نەیتوانیوە بزانێت داخۆ کاتۆلیکی بووە یان پرۆتستانتی. هەر لەم بارەیەوە هەندێك گومانی ئەوەیان لێکردووە کە ئەو بێ باوەڕ یاخود یەهودی بێت، چونکە بۆچوونێکی وا هەیە دایکی یەهودی بێت و خۆیشی پەیوەندی بە هەندێك حاخامی یەهودیەوە هەبووبێت و بیروبۆچوونەکانی لەوانەوە وەرگرتبێت[4]. "بودان" ئەوەی بە ڕاست نەدەزانی کە چاکەی ڕەهای دەوڵەت یان (کۆمار) لە چاکەی ڕەهای تاکەکەس جیابکرێتەوە، لەمەشدا پابەندی ڕێنوماییەکانی "ئەرستۆ و ئەفلاتون و ڕواقیەتی مەسیحی بوو"[5].

3-دواجار بەو پێیەی "بودان" هاوولاتییەکی نیگەران و دەربەستی نیشتمانەکەی بوو، بۆیە نوسینەکانی بۆ نیشتمانەکەی و سەردەم و ڕۆژگاری خۆی بوو. هاوکات بە زمانی ڕەسمی سەردەمەکەی کە زمانی لاتینی بوو نەیدەنووسی، بەڵکو بە زمانی میللی واتە بە زمانی فەرەنسی دەینوسی، بۆ ئەوەی هاوولاتیانی ولاتەکەی بە ئاسانی تێیبگەن و بتوانێت بیروبۆچوونی بیریارانی سەردەمی خۆیشی ڕاستبکاتەوە. دواجاریش بشتوانێت لە ڕێی ئەو نووسینانەوە، بەرپەرچی بیروڕاکانی "ماکیاڤیللی" بداتەوە کە لە فەرەنسادا ڕەواجیان پەیدا کردبوو.

**دروستبوونی دەوڵەت:**

بودان سەبارەت بە ئامانج لە بوونی دەوڵەت "بودان" تیۆریەکی ڕوون و ئاشکرای بەرچاو نەخستووین، بەڵام دروستبوونی دەگێڕێتەوە بۆ خێزان کە بەیەکەم شانەی سیاسی دەداتە قەڵەم. ئەمەیش لە کاتی پێناسەکردنی بۆ دەوڵەتدا دەردەکەوێت: (کۆمار بریتیە لە حوکمڕانی ڕاست و ڕەوانی چەند بنەماڵەیەك، بەڵام بەو مەرجەی هێزێکی پتەویان هەبێت)[6]. لێرەدا مەبەست لە (کۆمار) فۆرمی سیستمێکی حوکمڕانی نییە لە بەرامبەر سیستمی پاشایەتیدا، بەڵکو مەبەست لێی کۆمەڵێکی سیاسیە، واتە مەبەستی دەوڵەت. ئەو پێیوایە خێزان بە هۆی غەریزەی کۆمەلایەتی مرۆڤەوە دروستدەبێت و خێزان و موڵکیەتی هاوبەشی نێوان بنەماڵەکان بەلای ئەوەوە ئەو کۆمەڵگە سروشتییەیە کە هەموو کۆمەڵگاکانی دیکەی لێدەکەوێتەوە.

بەرژەوەندی هاوبەشی زۆر و بەرگری هاوبەش، خێزانەکان ناچار دەکەن لە نێوان خۆیاندا یەکبگرن و چوار چێوەیەکی کۆمەلایەتی گەورەتر و فراوانتری وەك (لادێ و شار و دامەزراوەی جۆراوجۆر) دروستبکەن. کاتێك ئەم ناوەندانە یەکدەگرن و دەچنە ژێر سایەی دەسەلاتێکی بەهێزەوە، لەو کاتەدا دەوڵەت دێتە ئاراوە و دروستدەبێت.

"بودان" بڕوای وایە" هێز ئەو بنەما سەرەکییەیە کە لە پشت دروستبوونی فیعلی دەوڵەتەوەیە و پێشیوایە موڵکیەتی تایبەت تەنها لە خێزاندا هەیە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ حاڵەتێکی خۆڕسك کە لە مرۆڤدا هەیە و هەروەها دەیگێڕێتەوە بۆ ماف سروشتی خاوەنداریتی. ئەو پێیوایە خاوەنداریتی شتێکی پیرۆزە و ئەرکی سەرشانی پادشایە پارێزگاری لێبکات.

لە ڕاڤەکردنی خێزان و دەوڵەتدا "بودان" پشتی بە پرانسیپەکانی یاسای ڕۆمانی و ئینجیل بەستبوو، ئەوەتا دەسەلاتی ڕەهای باوك لە

خێزانەکەیدا دەگەڕێنێتەوە بۆ پرانسیپی دەسەڵاتی *Patria Poreatas* کە لە یاسای ڕۆمانیدا هاتووە، هەروەها ڕێکخراوە مەدەنییە جۆراوجۆرەکانی ناو کۆمەڵگە دەگێڕێتەوە بۆ یاسای کۆمەڵگەی ڕۆمانی. لەلایەکی ترەوە خێزان بە سەرچاوەی دروستبوونی دەوڵەت دادەنێت و گرنگییەکی گەورە دەداتە باوك لە خێزاندا، هاوکات داوای ئەوەی دەکرد کە دەسەڵاتە زۆر و زەوەندەکانی باوك لە خێزاندا زیندو بکرێتەوە. بەدەر لە هەموو ئەمانەیش "بودان" سیفەتی هاوڵاتی تەنها بۆ سەرۆکی خێزان بەڕەوا دەزانێت، کاتێك لە ماڵەکەی دێتە دەرەوەو لەگەڵ سەرۆك خێزانەکانی دیکەدا دەست بەکارکردن دەکەن. بەم هەنگاوەیش لە فەیلەسوفانی گریك جیادەبێتەوە کە مەرجی هاوڵاتیبوونیان بەرادەی بەشداریکردن لە ژیانی گشتیدا بەستبووەوە. ئەو پێیوایە" هاوڵاتییان هەرچەندە لە پلە و پایە و لە ماف و دەستکەوتەکانیاندا جیاوازن، بەڵام هەموویان لە ڕووی ملکەچبوونیان بۆ تاکە دەسەڵاتێك کە سەرپەرشتی تەواوی چالاکییەکانی دەوڵەت دەکات، چوونیەك و هاوبەشن.

هاووڵاتی ئازاد ملکەچی دەسەڵاتی کەسێکی تر نابێت، ئەوەشی لە کەسانی تری جیادەکاتەوە ملکەچکردنیەتی بۆ دەسەڵاتی دەوڵەتێك کە لە کۆمەڵگاکانی تر جیاوازترە. ڕەخنەیەك کە ئاراستەی "جان بودان" بکرێت" ئەوەیە ئەو کاتێك باس لە دەسەڵاتی پاشایەکی خاوەن سەروەری دەکات، ئەو پەیوەندیە دیاری ناکات کە لە نێوان دەسەڵاتی ڕەهای سەرۆك خێزانەکان و دەسەڵاتی دەوڵەتی خاوەن سەروەریدا هەیە. هەروەها "بودان" بوونی دەسەڵاتی سەروەری سەرجەم ڕێکخراوە مەدەنییەکان ڕەتدەکاتەوە، ئامانج لەمەیش ئەوەیە تا لە هەموو جۆرە مافێکی تایبەت بێ بەشیان بکات و ملکەچیان بکات بۆ دەسەڵاتی دەوڵەت کە خاوەنی دەسەڵاتی باڵایە، واتە خاوەنی سەروەرییە.

**تیۆری "جان بودان" دەربارەی سەروەری:**

فەلسەفەی سیاسی "جان بودان" بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەر تیۆرەکەی دەربارەی سەروەری دامەزراوە، لە ڕێی ئەم تیۆرەیەشەوە (کە هەوڵێکی هۆشیارانەیە بۆ دۆزینەوەی بنەمایەکی ئاشتی لە سەردەم و ڕۆژگارێکدا کە بەدەست کێشەی ناوخۆییەوە گیرۆدەیە)، ئاشنابون و ناسیان. هەرچەندە ئەم تیۆرەیە لە یاسای ڕۆمانیدا بوونی هەبووە، بەڵام ئەو یەکەمین کەسە کە زۆر بە وردی ئەم تیۆریایەی دیاریکردبێت و لە فەلسەفەی سیاسیدا فۆرمەلەی کردبێت.

ئێمە لە کۆمەڵگەدا زیاد لە دەسەڵاتێکمان هەیە، بەڵام ئەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت لە سەرجەم گروپ و ڕێکخراوەکانی دیکە جیادەکاتەوە سەروەری دەسەڵاتی ئەوە. لەمبارەیەوە "بودان" دەنوسێت و دەڵێت: (ئەگەر بێت و ئەو جومگە سەرەکییەمان لە کەشتییەك دەرهێنا کە پێش و پاش و هەردوولا و بەشی سەرەوەی کەشتییەکە پێکەوە دەبەستێتەوە، ئەوا جگە لە لیژنەیەك تەختەودار هیچی تری لێ بەجێ نامێنێت. بە هەمان شێوەش گە رلە کۆمارێکدا دەسەڵاتێکی کۆنکرێتی وەهامان نەبێت تەواوی ئەندام و لایەنەکانی پێکەوە گرێبدات و سەرجەم بنەماڵە و خێزانەکانی لەیەك قەوارەدا کۆبکاتەوە، ئەوا بە کۆمار حساب ناکرێ)[8].

لێرەدا مەبەست لە (کۆمار)، شتی گشتی یا گرووپی سیاسی یاخود بە کورتیەکەی دەوڵەتە نەك

شتی تر. هەروەها سەروەریش بەوە پێناس دەكات كە بریتییە لەو (دەسەڵاتە باڵایەی هاوڵاتییان گوێڕایەڵی دەبن و یاسا تێدا باڵا دەستە)[9].

**گرنگترین خەسڵەتەكانی سەروەری بریتین لە:**

1-دەسەڵاتێكی هەمیشە و بەردەوامی هەیە: هۆكاری بەردەوامیشی لەبەردەوامی دەوڵەتدایە. دەسەڵاتی كاتی خاوەن سەروەری نییە. لێرەوە "بودان" داوایدەكرد *Souverain* و *Majistat* تێكەڵ بە یەكتر نەكرێن. لەبەرئەوە یەكەمیان ئەو كەسەیە دەسەڵاتی هەمیشەیی هەیە، بەڵام دووەمیان شایەنی ئەوە نییە بە خاوەنی دەسەڵات و سەروەری ناودێر بكرێت، چونكە جگە لە فەرمانبەرێكی دڵسۆزی دەسەڵات شتێكی تر نییە.

2-خاوەن دەسەڵاتێكی رەهایە: رەهایی دەسەڵاتی وای لێدەكات ملكەچی هیچ ئیرادەیەكی دیكە نەبێت و ئەو مافەشی هەیە كە یاساكان دابڕێژرێت، هاوڵاتیانیش ناچاردەكات گوێڕایەڵی ئەو یاسایانە بن و كام یاسایەشی بە گونجاو نەزانی دەتوانێت هەڵیگرێت و لایبەرێت و بە یاساگەلێكی دیكەی بگۆڕێت، بەبێ ئەوەی خۆی پابەندبێت پێیانەوە. لەمبارەیەوە "بودان" دەڵێت: (ئەو دەسەڵاتێكە یاساكان دادەڕێژێت و لە باریشیدایە سنوری ئەو یاسایانە ببەزێنێت)[10].

3-دەسەڵاتێكی ڤیتۆ ناكرێت: خاوەنی سەروەری دەتوانێت یاسا بۆ هەمووان و بە گشتی و بۆ یەكەیەكەی ئەندامەكانی كۆمەڵگە بە تایبەتی دابڕێژێت، بەبێ ئەوەی پێویستی بەرەزامەندی هیچ كەسێك هەبێت. گەر بێتو ناچاربێت رەزامەندی كەسانێكی سەروی خۆی وەربگرێت، ئەوا دەبێتە یەكێك لە كەسە ئاساییەكانی ئەو كۆمەڵە. گەر لە كەسێكی وای وەرگرت كە هاوشانی خۆی بوو، ئەوا ئەو كەسە هاوبەش دەبێت لەگەڵیدا و دەسەڵاتی بە رەهایی نامێنێتەوە. بەڵام گەر هاتو ڕەزامەندی لە جەماوەرەوە وەرگرت (لە ئەنجومەنی پیران یان گەلەوە)، ئەوا بەسەردار و سەروەر نادرێتە قەڵەم.

چەمكی سەروەری كە بەلای "بودان"ەوە دەسەڵاتێكی یاسایی ڕەهای هەیە، پێی وایە یاسا ناتوانێت خەسڵەتێكی ئیلزامیانەی هەبێت، تەنها لەو كاتەدا نەبێت كە فەرمانڕەوایەكی خاوەن دەسەڵات بڕیاری لەسەر نەدات و نەیكاتە بڕیار.. بەڵام نەریت و تەقالیدەكان پێویستیان بە دەركردنی بڕیار نییە لەلایەن فەرمانڕەواوە تا جێبەجێكردنیان ببێتە شتێكی ئیلزامی، لەبەرئەوەی خۆیان هێزێكی ئەوتۆیان هەیە كە یەكەیەكەی ئەندامانی كۆمەڵ ناچار بكەن پابەندبن پێیانەوە. "بودان" ئاشكراشیكرد كە ڕەنگە یاسا بتوانێت عورف و عادەت بگۆڕێت، بەڵام نەریت و تەقالید لە باریدانییە یاسا بگۆڕێت. لە خەسڵەتەكانی دیكەی دەسەڵاتی خاوەن سەروەری: بڕیاردانی جەنگ و ئاشتی و دامەزراندنی گەورە فەرمانبەران و دەركردنی بڕیاری كۆتایی و لێبوردنی گشتی و لێدانی دراو و سەپاندنی باج و ڕەسمی گومرگییە.

**سنورەكانی دەسەڵات:**

ئەگەر چی لە پێناسەكەوە ئەوە تێگەیشتین كە دەسەڵات ڕەهاو بێ سنورە، بەڵام "بودان" چەند سنورێكی بۆ دیاریكردوەو گرنگترین ئەو سنورانەش بریتین لە:

1-یاسای ئاسمانی و یاسای سروشتی: پادشا ملكەچی ئەو یاسایانە نابێت كە خۆی دایاندەنێت، بەڵام بۆی نییە سەرپێچی یاسا یەزدانی و سروشتییەكان بكات (چونكە پادشا خۆی یاسای زەمینی دادەڕێژێت و ناچێتە ژێر

باریان، بەلاّم هیچ یەك لە یاسای یەزدانی و سروشتی دانارپێژێت، كەچی گوێڕایەڵیان دەكات)[11].

2-ئازادی تاكە كەس و موڵكایەتی تایبەت: دەوڵەت بەرەنجامی كۆبوونەوەی كۆمەڵێك خێزانە، واتە خانەی سەرەكی دەوڵەت خێزانە نەك تاكە كەس. لەبەرئەوە پێویستە مافەكانی خێزان پارێزراوبن، بە تایبەتی ئازادی تاكەكەسی و موڵكایەتی تایبەت. (دەوڵەت ئەو شتانە دەپارێزێت كە خێزانەكان هاوبەشن تێیداو هەموویان بەشدارن تێیدا، نەك پارێزگاری لە شتە تایبەتەكانیان بكات. ئەگەر سەروەری مافی میرو پادشا بێت، ئەوا موڵكداریێتی و هەڵسوكەوت مافی هاولاّتیانە)[12]. پێویستە لەسەر فەرمانڕەوا ڕێز لە موڵك و ماڵی هاولاّتیان بگرێت، بەلاّم ئەگەر هاتوو دەستدرێژی كردە سەر ماڵ و سامانی خەڵكی، ئەوا لەو كاتەدا دەسەلاّت ئەو مافەی ناداتێ، بەڵكو بە زەبری هێز و تالاّن و بڕۆی ئەنجامی دەدات.

3-یاسا سەرەكییەكانی دەوڵەت: پادشا بەو پێیەی خاوەنی دەسەلاّت و سەروەریە، پێویستە ڕێز لە یاسا سەرەكییەكانی شانشینەكەی بگرێت، وەك (یاسای بۆ ماوەیی تاجی فەرەنسی و پاراستنی موڵك و ماڵی گشتی و دەستكاری نەكردنی ئەو یاسایانەی فۆرمی حكومەتەكەی ڕێكدەخەن).

4-پابەندبوون بە ڕێكەوتننامەكانەوە: پێویستە پادشا ئیلتیزامی ئەخلاقی بەرامبەر ئەو ڕێكەوتنامانە هەبێت كە لەگەڵ ولاّتاندا مۆریكردووە، هەروەها لەناوخۆیشدا دەربەستی ئەو پەیماننامانەیش بێت كە لەگەڵ ئەندامانی كۆمەڵگاكەیدا لەسەری ڕێكەوتوون.

بەمجۆرە "بودان" جیاوازی لە نێوان دوو جۆرە دەسەلاّتدا دەكات، دەسەلاّتێكی شەرعی (*Iamonarchie*) و دەسەلاّتێكی ستەمكار (*Monarchie Tyraunique*). دەسەلاّتی یەكەمیان واتە شەرعییە كە ملكەچی یاساكانی سروشت دەبێت و بەهەمان شێوەیش حەز دەكات هاولاّتیان گوێڕایەڵی بن، بەلاّم ئازادی سروشتی و موڵكیەتی تایبەتی بەمافی ڕەوای هەموویان دەزانێت. هەرچی دەسەلاّتی دووەمیانە (واتە ستەمكار) ئەوا: (بە چاوێكی سوك سەیری یاسا سروشتییەكان دەكات و وەكو كۆیلە هەڵسوكەوت لەگەڵ مرۆڤە ئازادەكاندا دەكات، هەروەها بەجۆرێك سەودا لەگەڵ سەروەت و سامانی خەڵكدا دەكات وەكو ئەوەی موڵك و ماڵی تایبەتی خۆی بێت)[13].

لێرەدا "بودان" وەها دێتە پێش چاو وەكو ئەوەی لەگەڵ خۆیدا ناكۆك بێت و لە بۆچوونەكانی پێشووی پەشیمان بوبێتەوە، چونكە ئەو لێرەدا كەوتۆتە سنورداناں بۆ فەرمانڕەوا، لە كاتێكدا و پێشتر دەسەلاّتێكی ڕەهای پێبەخشیبوو. ئەم هەنگاوەشی بەو مەبەستە ناوە تا بیسەلمێنێت كە ئەو پیاوێكی ئەخلاقیەو وەكو فەقیهێكیش پابەندە بە هەندێك بەهای تایبەتی و دیاریكراوەوە.

### سەرچاوەی دەسەلاّت:

"بودان" سەرچاوەی دەسەلاّت دەگەڕێنێتەوە بۆ هەلومەرجێكی ئازاد كە پێش دروستبوونی دەوڵەت دەكەوێت و تەنها دەسەلاّتێك لەو قۆناغەدا دەسەلاّتی باوكە لە خێزاندا. كاتێكیش باس لە چۆنێتی دروستبوونی دەوڵەت دەكات، ئەوا پێیوایە پەیوەندی بە هۆكاری توندوتیژیەوە هەیە كە خاوەن هێز بەرامبەر كەسانی دی بەكاری دەهێنێت. سەبارەت بە پابەندبوونی سیاسیش "بودان"

تەفسیرێکی گونجاوی نەخستۆتە ڕوو، چونکە پێیوایە دەسەڵات وەکو یەزدان وایە و ڕێدراوی سروشتی شتەکانە و پەیوەستە بە سیستەمی گشتی جیهانەوە.

بەمجۆرە دەردەکەوێت کە ئەو نەیتوانیوە سەبارەت بە سەرچاوەی دەسەڵات تەفسیرێکی گونجاوی لۆژیکی بدات بە دەستەوە، ئەگەرچی بەشێوەیەکی ورد و کەم وێنە پێناسەی کردووە. ئەمەش کەموکوڕییەکە کە لە تیۆریەکەی ئەودا هەیە سەبارەت بە دەسەڵات و سەروەری دەسەڵات.

**فۆرمەکانی سیستەمی حوکمڕانی:**

"بودان" یەکێکە لەوانەی جیاوازیکردنیان لە نێوان دەوڵەت و حکومەتدا بەکارێکی پێویست زانیوە، چونکە دەوڵەت بریتییە لەو دەزگایەی دەسەڵاتێکی خاوەن سەروەری هەیە، بەڵام حکومەت ئەو دەزگایەیە کە لە ڕێگایەوە مومارەسەی دەسەڵات دەکرێت. ئەو سیستەمی حوکمڕانی بەسەر سێ جۆردا دابەشدەکات و بنەمای ئەم دابەشکاریەش دەگەڕێنێتەوە بۆ دەسەڵات، سێ جۆرەکەش بریتین لە:

1-سیستەمی پاشایەتی: لێرەدا دەسەڵات لە دەستی تاکەکەسێکی دیاریکراوەدا دەبێت.

2-سیستەمی ئەرستۆکراتی: دەسەڵات بەدەست چەند کەسێکی دیاریکراوەوە دەبێت.

3-سیستەمی دیموکراسی: کە تیایدا دەسەڵات لە دەستی زۆرینەی خەڵکدایە یان لە دەستی سەرجەم هاوڵاتیاندایە.

بەڵام "بودان" جۆری چوارەمی شێوازی حوکمڕانی ڕەتکردەوە، جۆری چوارەمیش بریتیە لە ئاوێتەکردنی ئەو سێ سیستەمەی لە سەرەوە باسمان لێوە کردن و هەر یەك لە "ئەرستۆ و بۆلیب و شیشرۆن" و چەند کەسانێکی دی پەسەندیان دەکرد. "بودان" پێوابوو تێکەڵەکردنیی ئەو سێ سیستەمە تەنها سیستەمێکی میللی لێ دەکەوێتەوە، چونکە لەو کاتەدا دەسەڵات لە دەستی پادشا و کەمایەتی و یەك میللەتدا دەبێت، بەو پێیەشی دەسەڵات بەش بەش ناکرێت، ئەوا لەم حاڵەتەدا دەسەڵات دەبێتە دەسەڵاتی هەمووان. واتە دەسەڵات لە دەستی میللەتدا دەبێت و لەو کاتەشدا سیستەمی حوکم دەبێتە سیستەمێکی حوکمڕانی میللی. بە بەراوردکردنی ئەو سێ سیستەمی حوکمڕانییە بە یەکتری، "جان بودان" پێیوابوو سیستەمی میللی یەکسانی لە نێوان هاوڵاتیاندا دەستەبەر دەکات و چونیەك هەلیان بۆ دەرەخسێنێت و بوار بە دەرکەوتنی بەهرەو تواناکان دەدات لەسەر و هەموو ئەوانەشەوە یاسا تێیدا سەروەرە.. بەڵام هەر دوای ئەمانە و دەستبەجێ دەڵێت: (هەموو ئەم خەسڵەتانەی سیستەمی دیموکراسی، خەسڵەتێکی تیۆری و روکەشن، لەبەرئەوەی یەکسانی هەرگیزاو هەرگیز نەبووە و ئازادیش چەمکێکی تیۆرییە و لە واقیعدا دەستەبەر نابێت). خەوشێکی تری ئەم جۆرە سیستەمە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە زۆربەی زۆری گەل نەفامن و دامەزراو نین، هەروەها نهێنییەکانی دەوڵەت ناپارێزرێت و بەردەوامیش ئەگەری ئەوە هەیە شۆڕش و پشێوی تێدا سەر هەڵبدات.

هەرچی سیستەمی ئەرستۆکراتیشەکە حوکمڕانی بە کەمینەیەك دەسپێردرێت و ئەو کەمینەیەش لە رووی رەچەڵەك و سەروەت و سامان و بەهرە و لێهاتوویەوە تایبەتمەندی خۆی هەیە، ئەوا دەتوانێت چارەسەرێکی مام ناوەندی لە نێوان سیستەمی میللی و سیستەمی پاشایەتیدا

بدۆزێتەوە. بەلاّم بەلای "بودان"ەوە، سیستەمی پاشایەتی چاکترین و نمونەییترین سیستەمی حوکمڕانیکردنە لە دونیادا، ئەویش لەبەر ئەم هۆکارانەی لای خوارەوە:

1-سیستەمێکە لەگەڵ سروشتدا گونجاوە: بەو پێیەی تەنها خوایەك لە گەردوندا هەیە و خێزانیش تەنها یەك سەرۆکی هەیە، ئەوا بوونی تەنها پاشایەك لە ترۆپکی دەسەلاّتی دەوڵەتدا بەشتێکی گونجاو دادەنرێت لەگەڵ ئەوەی لە سروشتدا هەیە. واتە سیستەمێکی سروشتییەو زیاد لە سیستەمەکانی تر لەگەڵ سروشتدا گونجاوە، لە هەمووشیان زیاتر تەمەن درێژترە و ئارامی و ئاسایشی تێدا بەرقەرارە.

2-پادشا سومبولی یەکێتی و یەکبوونی نەتەوەیە: پادشا خاوەنی دەسەلاّت و سومبولی یەکێتی نەتەوەو خاوەنی ئیرادەیەکی تەواوە و بە تەنها هەر ئەویش دەتوانێت، کێشە مەزهەبییەکان بنەبڕ بکات و تەواوی چین و توێژەکانی میللەت لە ژێر رکێفی خۆیدا کۆ بکاتەوەو قسەیان بکات بەیەك.

3-چاکترین سیستەمێکە بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو قەیران و کێشانەی دووچاری دەوڵەت دێن: لەبەر ئەوەی دەتوانێت زۆر بە خێرایی بە دەنگیانەوە بچێت و چارەسەرێکی گونجاویان بۆ بدۆزێتەوە.

4-سیستەمی پاشایەتی تاکە سیستەمێکە ناهێڵێت دەسەلاّت دابەش بێت: لە سیستەمی ئەرستۆکراتی یان میللیدا دەسەلاّت بەسەر زیاد لە کەسێکدا دابەشدەبێت، ئەمەیش وادەکات هەریەکەیان مل بۆ ئیرادەی کەسانی تر بدەن و کەسانی تریش ناچاربکەن مل بۆ ئیرادەی خۆیان بدەن، بەو پێیەی هەر یەکەیان خاوەن دەسەلاّتە، بەلاّم سەرەنجام هیچ یەکێکیان نابێتە خاوەن دەسەلاّت و سەروەرییەکی راستەقینە.

5-سیستەمی پاشایەتی گونجاوترین سیستەمێکە بۆ حوکمڕانیکردنی ئەو ولاّتانەی رووبەرێکی گەورە و بەرفراوانیان هەیە و چڕی دانیشتوانیشیان بەرزە: لەبەرئەوەی رێگا لە ئەگەری پارچە پارچە بوونی دەوڵەت دەگرێت و ناهێڵێت هەندێك میر یان فەرمانڕەوای هەرێمەکان جیاببنەوە.

ئەم داکۆکیکردنە لە سیستەمی پاشایەتی و بڕوابوون پێی بە تایبەتی لەو هەلومەرجە دژوارو ناهەموارەی فەرەنسای تێدا دەژیا، "بودان" یان ناچار کرد بە پێی تیۆرەکەی خۆی دەربارەی دەسەلاّت و سەروەری، بکەوێتە دژایەتیکردنی خواست و داواکاری ئەو لیژنانەی نوێنەرایەتی چین و توێژەکانی گەلیان دەکرد، بۆ نموونە وەك لیژنەی (*Etat General*) کە بانگەشەی نوێنەرایەتیکردنی گەلی دەکرد و دەیویست لە حکومەتدا بەشدار بێت. بەلاّم "بودان" ئەو داواکاریانەی پێ پەسەند نەبوو، چونکە ئەو تەنها وەك لیژنەیەکی راوێژکاری سەیردەکردن کە ئەرکیان بۆ دیاریکردنی پادشایە و پادشایش سەربەستە لەوەی رێنوماییەکانیان پەسەند بکات یان رەتیان بکاتەوە. بەو پێیەی شا دەتوانێت لە حکومڕانیدا هاوسەنگیەك لە نێوان شێوازی حوکمکردنی ئەرستۆکراتی و میللیدا دروستبکات، واتە پێکەوە خانەدانەکان و خەڵکی ئاسایی و هەژار و دەوڵەمەند کۆبکاتەوە، لەگەڵ پاراستنی لانیکەمی دەسکەوتەکانی چینی خانەدانەکان. چونکە دروستکردنی هاوسەنگیەکی لەو جۆرە دەتوانێت دەنگی ناڕەزایی و پشێوی و شۆڕش کپ بکات. لەلایەکی ترەوە "بودان" وای بۆ دەچێت دەبێت سیستەمی سیاسی لەگەڵ سروشت و

ئەو واقیعەدا بگونجێت كە ئەو میللەتەی تێدا دەژی، لەبەرئەوە ئاوهەوای جوگرافی دەوڵەت كاریگەریان لەسەر سیستمی سیاسی دەبێت و هەروەها فۆرمی حكومەت و جۆری یاساكانیشی كاردەكەنە سەر خەسڵەتە نەتەوایەتییەكانی ئەو میللەتە.. هەر بۆیە جیاوازی دەكرد لە نێوان ئەو میللەتانەی لە باكوردا دەژیان لەگەڵ ئەو میللەتانەی لە باشوردا بوون، ئەو پێی وابوو هەریەكەیان سیستمی تایبەت بە خۆیان هەیە كە گونجاوە بۆیان. ئەوە كاتا لەم بارەیەوە دەڵێت: (گەلانی ناوچەكانی باكور رازی نابن بەوەی بە زەبری هێز حوكمڕانی بكرێن و ئەوەی بۆ ئەمان دەگونجێت دەوڵەتی میللیە یان لانیكەم سیستمێكی پاشایەتییە كە لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردرابێت، بەڵام سیستمێكی پاشایەتی كۆنكرێتی كە چاكترین سیستمێكە بە لای بودانەوە، ئەوا بە كەڵكی ئەو میللەتانە دێت كە نیشتەجێی ناوچەكانی ناوەڕاستن)[14].

**كۆتایی:**

لە پاڵ كێشە سیاسیەكاندا "جان بودان" گرنگیشی بە مەسەلە ئابووریەكان دەدا. لە چەند جێگایەكدا باس لەو پەیوەندیە دەكات كە لە نێوان سەروەت و سامان و دەسەڵاتی سیاسیدا هەیە، هەروەها سەرنج بۆ مەترسی بوونی جیاوازی گەورە لە موڵكدارێتیدا رادەكێشێت و باس لەو پشێوی و نائارامیەش دەكات كە لێیدەكەوێتەوە. سەرەڕای ئەوەش، بەڵام دژی تیۆری كۆمۆنیستی بوو كە داوای دابەشكردنی سەروەت و سامانی بەشێوەیەكی چونیەك و یەكسان دەكرد.

سەبارەت بە موڵكایەتی تایبەتیش پێیوابوو وەكو ئازادی تاكەكەس لە یاساكانی سروشتەوە سەرچاوە دەگرێت، هەر بۆیە دەست تێوەردانی دەوڵەتی لە كاروباری ئابووری هاوڵاتیاندا رەتدەكردەوە. دەسەڵاتی تایبەتیشی بەدام و دەزگا ئابووریەكان دابوو، چون دەسەڵاتی باوك لە ناو خێزانی خۆیدا.

"بودان" لایەنگری بازرگانی ئازادبوو، هەروەها لە سیاسەتی دارایی دەوڵەت و سەرچاوەكانی داهات و باشترین شێوەكانی باجوەرگرتنیشی كۆڵیوەتەوە. نووسینە ئابووریەكانی گوزارشت بوو لەو گۆڕانكاریانەی لەسەردەمی خۆیدا روویانداو، وەك گەشەكردنی چینی ناوەند. لەم سەروبەندەدا "بودان" لە پێناو خزمەتكردن بە بەرژەوەندیەكانی ئەم چینەدا، داوای دەكرد گەشە بە بازرگانی بدرێت و كۆت و بەندەكانی بەردەمی هەڵبگرێت، هەروەها تەئكیدی لەسەر پاراستنی موڵكایەتی تایبەت دەكردەوە.

دواجار ئەو فەرمانڕەوای لە مەترسی ئەوە بە ئاگاهێنایەوە كە خۆی بكاتە دادوەر بۆ یەكلاییكردنەوەی كێشەكانی نێوان هاووڵاتیان و پێیوابوو دەبێت فەرمانڕەوا ئەم ئەركە بۆ دادوەرەكان جێبهێڵێت، ئەم دادوەرانەیش فەرمانڕەوا خۆی دەستنیشانیان دەكات و كاریان چارەسەركردن و یەكلاییكردنەوەی كێشەی هاوڵاتیان دەبێت.

"جان بودان" لە ریزی ئەوانەدا پۆلێندەكرێت كە داوای سیستمێكی پاشایەتی رەها دەكەن، بەڵام دیسپۆتیزمی و ستەمكار نەبێت، سادە و ساكار بێت و تێكەڵ و ئاڵۆز نەبێت. سیستمێكی پاشایەتی وەها بێت كە شان بە شانی دەسەڵاتی سیاسی خۆی، رێگا بە دروستبوونی لیژنە و دەستەی راوێژكاری بدات و ئەركی ئەمانەیش ئەوە بێت (گەر پادشا ویستی) رێنمایی پێشكەشبكەن، بەڵام نابێت سنوری خۆیان ببەزێنن یاخود دەستدرێژی بكەنە

سـەر دەسـەڵاتەکانی، لەبەرئـەوەی پادشـا خـاوەنی سـەروەری و دەسـەڵاتە. هاوکـات نـاوی "بـودان" لـە لیستی ئەوانەدا دێت کە باسیان لە دەوڵەتی مۆدێرن کـردووە، چـونکە یەکـەمین کەسـێکە بانگەشـەی بـۆ پرانسیپی سەروەری دەوڵەت کردووە و ئامانجیشی لـەوە سـەلماندنی مـافی دەوڵـەتی نیشـتمانی بـووە لـە ژیانـدا. لێـرەوە تیۆرەکـەی ئـەو لەمـەڕ سـەروەری، سەرەتایەك بوو بۆ دۆزینەوەی کاراکتەری یاسایی و سەربەخۆیی دەوڵەت و هەروەها بۆ بڕیـاردان لەسـەر یەکسانی لە نێوان دەوڵەتاندا.

لەلایـەکی تـرەوە "بـودان" لـە ریـزی پێشـەوەی ئەوانەدایـە بـۆ یەکـەمینجار ئـەو بنـەما یاسـایانەیان داڕشـت کـە پەیوەندیـە نێـو دەوڵەتیـەکان بـەڕێوە دەبـەن، چـونکە لـەو یاسـایانەدا داوا لـە کەسـی فـەرمانڕەوا دەکـات پابەنـدی ئـەو بـەڵێن و ڕێکەوتننامانە بێت کە لـە نێوان وڵاتانـدا مـۆرکراوە. بەمـەیش زەمینـەی لەبـەردەم "گرۆتیـۆس"دا خۆشـکرد بـۆ ئـەوەی دەسـت بـە داڕشـتنی یاسـای نێودەوڵـەتی بکـات.. هـەروەها یەکێکـە لـەو کەسـە دەگمەنانەشی ئاماژەیان بەوە کردووە کە پێویستە جیاوازی لە نێوان دەوڵەت و حکومەتدا بکرێت.

سـەرەڕای ئـەو دەسـتکەوتە زۆرانـەی "بـودان" پێشـکەش بـە فیکـری سیاسـی کـرد، بـەڵام لەگـەڵ خۆیـدا نـاکۆك و هەنـدێ جـاریش بۆچـوونەکانی دژبەیـەك بـوون. ئـەوەتا دوای ئـەوە دەسـەڵاتی ڕەهـا کـرد و لـە هـەموو شـتێکی قوتـارکرد، سـەر لـە نـوێ کەوتەوە دانانی چەند کۆت و بەندێك کە سنور بۆ دەسـەڵات دادەنێت. بەمـەیش خـۆی وەکـو کەسـێکی ئـەخلاقی نیشـاندا کـە پابەنـدی هەنـدێك بـەهای دیـاریکراوە. هـەروەها یـەکێك لـەو خاڵانـەی دیکـەی وەك کـەلێنێك لـە تیۆرەکـەی دەربـارەی دەسـەڵات حسـابی بـۆ دەکرێـت، ئەوەیـە کـە نـەیتوانیوە بەشـێوەیەکی لـۆژیکی ڕەچـەڵەکی دەسـەڵات تەفسیر بکات.

دوای ئـەم هەڵسـەنگاندنە پێویسـتە گـرنگترین ئەو بیرو ڕایانە بخەینە ڕوو کە سـەبارەت بـە فیکـری سیاسـی ئـەو باسـکراون. فیکـری سیاسـی "بـودان" کـاریکردە سـەر بـیر یـارانی سـەدەی حەڤدەهـەم، چـونکە فیکـری سیاسـی ئـەو سـەدەیە بـە کێشـەی سـەروەرییەوە خـەریك بـوو، یەکـەمین کەسـێکیش سـنورەکانی سـەروەری دەسـەڵاتی زۆر بـە ڕوونـی و بەوردی دەستنیشانکردبێت ئەو بووە[15]. تەنانـەت بۆچوونەکانیشـی کاریگـەری بەسـەر بیریـارانی سـەدەکانی دواتریشـەوە بەجێهێشـت و سەرەنجامیش دەوڵەتی نەتەوەیی خاوەن سـەروەری دامـەزرا، کـە جـەنگی یەکـەم و دووەمـی جیهـانی نـەیانتوانی کۆتـایی بـەو فۆرمـە بهێـنن و لەسـەر نەخشەی سیاسی بیسڕنەوە[16].

"بارکـەر" دەڵێـت: (بـودان وەکـو ماکیـاڤیللی عەلمانیانـە بیریـدەکردەوە، هەرچـەندە ماکیـاڤیللی بانگەشـەی بـۆ دەسـەڵاتی ئیجرائـی دەکـرد، بـەڵام بـودان لایـەنگری دەسـەڵاتی یاسـایی بـوو)[17]. هـەروەها "دانـنج" دەڵێـت: (ماکیـاڤیللی چـەند هـەنگاوێك لـە بونیادنـانی سیاسـەت بەشـێوەیەکی زانسـتی نزیـك بـووەوە، بـەڵام بـودان بـە تـەواوەتی گەیشـتە ئـەو مەبەسـتەی خولیـای هاوتـا ئیتالییەکـەی بـوو)[18]. هـەر لـە درێـژەی قسـەکانیدا "دانـنج" دەڵێـت: (پێویسـتە فەیلەسـوفێکی وەك بـودان پێگەیـەکی دیـار و شایسـتەی لـە مێـژووی فیکـری سیاسـیدا هـەبێت، چـونکە لـەو بارەیـەوە تیۆریـەکی کامـڵ و هەمەلایـەنی بەردەسـت خستووین)[19].

## پەراوێزەکان

1-جورج سباين: تطور الفكر السياسي، الكتاب الثالث- ص 526.

2-هاورلد لاسكي: نشأة التحررية الاوروبية- ترجمة: عبد الرحمان صدقي- وزارة الثقافة و الارشاد القومي- ص 34-35.

3-د.علي عبدالمعطي محمد: الفكر السياسي الغربي- دار الجامعات المصرية- الاسكندرية، 1975 - ص.181

4-جورج سباين: المرجع السابق - ص 551.

5-جان جاك شوفالية: تأريخ الفكر السياسي من المدينة الدولة الى الدولة القومية - ص 284.

6-الجمهورية (1583)، ص 1-12. نقلا عن جاك شوفالية: المرجع السابق، ص 285.

7-هارولد لاسكي: المرجع السابق، ص 31.

8-جان جاك شوفالية: المرجع السابق، ص 285.

9-د. علي عبد المعطي محمد: المرجع السابق، ص 215.

10-هارولدسكي: المرجع السابق، ص 31.

11-د. علي عبدالمعطي محمد: المرجع السابق، ص 215.

12-جان جاك شوفالية: المرجع السابق، ص 290-219.

13-بروانه: الجمهورية (1583) - الكتاب السادس، ص 270- 312- نقلا عن المرجع السابق، ص 291.

14-جان جاك شوفالية: المرجع السابق، ص 296.

*15-Murrey: The history of political scince from plato to the present, P 180.*

*16-Maxey: political philosophies, P 173.*

*17-Parker, E: Principles of social and Political theory, P 15.*

*18-Dunning: Political Thiories, vol. Ii, P 120-121.*

*19-Ibid. P 120.*

## سەرچاوە

د. موسى ابراهيم: معالم الفكر السياسي الحديث و المعاصر - مؤسسة عز الدين للطباعة و النشر، بيروت- الطبعة الاولي، 1994.

# سەرەتاكانی فەلسەفەی مێژووی بۆرجوازیی

ماكس هۆركهایمەر

لە عەرەبییەوە: سامان عەلی

-3-

## یۆتۆپیا

ئەوەی كە بە ڕۆشنی و بێ گرێ و گۆڵ لە نووسینەكانی هۆبز و هەروەها لە نووسینەكانی سپینۆزا و "فەیلەسوفەكان"یشدا گوزارشتی لێدەكرێت، متمانەیە بەشێوەی ڕێكخستنی كۆمەڵگای بۆرجوازی. خودی ئەم كۆمەڵگایە و گەشەكردنی، ئامانجی مێژوون، یاساكانیشی یاسا تاهەتاییەكانی سروشتە و، ملكەچبوون بۆیان نەك هەر تەنها بڵندترین فەرمانی ئاكارییە بەڵكو زامنی بەختەوەریشە لەسەر ڕووی زەمین. هەرچی گەورە تیۆریا یۆتۆپییەكانی چاخی ڕێنیسانسە، بە پێچەوانەوە، گوزارشتە لەو چینە بێئومێدانەی كە دەبوو بۆ گواستنەوە لە شێوەیەكی ئابورییەوە بۆ شێوەیەكی دی، "خەرجییە زیادو سەربارەكان" لە ئەستۆ بگرن. مێژووی ئینگلتەرا لە هەردوو سەدەی پانزە و شانزەدا زۆرێكمان لە بارەی ئەو وردە جوتیارانە كە لەلایەن سەرداره دەرەبەگەكانەوە موڵك وماڵەكانیان زەوت كرابوو، پێشچاو دەخات، خاوەن زەوی و زارەكان سەر لە بەری دێهاتگەلێكیان دەكردە لەوەڕگە بۆ مەڕو ماڵات و بە مەبەستی دابینكردنی خوری بۆ كارگەكانی جلوبەرگ لە فلاندرز گرێبەستیان مۆردەكرد، چارەنووسی جوتیارانی برسی و پەرتەوازە لە چەند گروپێكدا ئێجگار نالەبار بوو، دەسەڵاتداران سزای مەرگیان دەرهەق بە دەیان هەزار لەو جوتیارانە جێبەجێ كرد، لە لایەكی ترەوە زۆریان بە زەبری هێز خرانە نێو ئەو مانیڤاكتۆرانەوە كە ئەو دەمە لە سەرەتای پەرەسەندندا بوون تا بە پێی مەرجگەلێكی قورس و گران كاربكەن. ئەو چینانە بەرجەستەی شێوەی یەكەم و سەرەتای دەركەوتنی پرۆلیتاریای نوێیان دەكرد. هەڵبەت لە دەست جەوری كۆیلایەتی ئازادبوون، بە هەمان شێوە لە هەڵبژاردنی ئەو هۆیانەشدا كە ژیانی خۆیانی پێدابین دەكەن ئازادبوون. ڕەوشیان بناغەی یەكەم گەورەترین یۆتۆپیایە لە چاخە تازەكاندا، ئەو یۆتۆپیایەی كە ناوی خۆی بەخشییە هەموو یۆتۆپیاكانی تر: یۆتۆپیای تۆماس مۆر (1651) كە

لـە دوای نـاکۆکی و ململانـێ لەگـەڵ پادشـادا، لـە بەندیخانە توند کراو پاشان لە سێدارە درا(1).

یۆتۆپیستـەکان بڕوایـان وابـوو، چیدی لەگـەڵ پەرەسـەندنی ئـابوری پشتبەسـتوو بـە بازرگانیـدا، قازانج بووەتە بزوێنەری مێژوو. لە دایك بوونی ئەو مانیڤاکتۆرە گەورانـە و پاشماوەی ئەو پرۆژانـەیان بینی کـە چوارچێوەی ئابوری پیشـە کۆنـەکانی لە روانگـەی پەرەسـەندنی پشتبەستوو بـە سـەروەت و سـامانە پێشـوەخت کەڵەکـەبووەکان لـە شـارەکاندا، تێکشکاندو، بووە هـۆی باڵادەستبوونی شێوەیەکی نـوێی بەرهـەمهێنان. لەلایـەك کـۆنترۆڵی مەرجـەکانی کارکرا: چونکی بەڵێندەرە لێهاتوو و خوێنـەوارەکان نـەك هـەر تـەنها خـاوەنی زانینـەکان و توانـای رێکخسـتنی پێویسـت لـە پێنـاو هۆگـەلێکی نـوێی بەرهـەمهێنانن، بـەڵکو هـەروەها خـاوەنی شـوێن و جێگای کار و کەرەستەی خاوو ئەو ئامێرو کەشتی و تێکڕای ئەو ئامادەسازیانەشن کە بێ ئـەوان کـاری قـازانجهێن ئەسـتەمە. لەلایـەکی دیکـەوە هـەژاریی لەڕادەبـەدەر و برسـێتی و بێنـەوایی کەڵەکـەبوو. ڕزگـاربووان لـە دەسـت کۆیلـەیێتی و جـەماوەری برسی شارە گـەورەکان و پاشماوەی ئەو مرۆڤانـەی کە لە ڕژێمـی لەناوچوو مانەوە بوونە ئەو کرێکارە کرێگرتانەی کە دەبوو هێزی کاری خۆیان بفرۆشن.

لـــە بەرامبـــەر ئـــەم پەیوەندییـــە نوێیانـــەدا یۆتۆپیســـتەکان بـــەدەم هـــاوارەوە بـــەم جـــۆرە وەڵامیاندایـــەوە: موڵکایـــەتی تاوانکـــارە! مانـــای سـەروەت و سـامان لـە چاخی ناوەندا جیاواز بوو لـەو مانایـەی کـە لـە چـاخی نوێـدا هـەیبوو، بـەو چەشنە داخڵ دەبوو کە لە بنەڕەتدا کەڵەکەکردنی خێروبێـــر بـــۆ چـــێژو خۆشـــی ڕاســـتەوخۆ تـــەرخانکراوەو، بـــە زەرورەت هـــەژمونی بەســـەر خەڵکیـدا لـە خۆنـەگرتبوو. هەرچـی ئەوەشـە کـە یۆتۆپییـەکان یەکڕاسـت بـەو جـۆرە لـە موڵکایـەتی گەیشـتبوون کـە شـەیتانە، ئەمـە بابەتێکـە تـەنها ئـەو کاتە دەتوانین تێبیگەین ئەگەر ڕەچاوی ئەو ڕەوشـە نوێیە کە لە تەك ڕێنیسانسدا دروستبوو، بکەین، کە ئەمەیـە: پـەیتا پـەیتا شـاندادانی دەسـەڵات لەسـەر نازناو و مافە بە میرات بۆ ماوەکان ڕووی لە کزبوون دەکـرد و، پرسـکردن لـە بـارەی ناسـنامەی نـوێی سەردار یـاخود وەسـتای نوێی پیشـە زیـاتر و زیـاتر لاوەکـی دەبـوو، ئـەوە سـەروەت و سـامان بـوو، سـەروەت و سـامان بـەو پێیـەی خاوەنـداریی هۆیـەکانی لارە، کـە بـە چـوونە بـەرگ "تقمـص"ی ڕۆڵـی ئـەو دەسـەڵاتەی کـە ڕەفتـار و هەڵسوکەوت لـە نێـو خـەڵکی و بـەهێزی کاریانـەوە دەکـات، کۆتـایی هـات. لـە تـەك شێوەی نوێی ئابوریشـدا چیدی ئـەم دەسـەڵاتە مەزەندەییـە هـیچ سـنورێکی نەدەناسـی، ئەگەر خوێن بڕژابایـە ئـەوە تـەنها زادەی بارودۆخی ناوخۆی نێو دەوڵەتە جۆر بەجۆرەکان نـەبوو، بـەڵکو هەروەها بەرەنجامی ئـەو ڕکابەرییـە نەتەوایەتییـەش بـوو کـە لـە نێـوان شـارە ئیتاڵییەکانـدا دەسـتی بەسەرهەڵدان کردبوو. یۆتۆپیستەکان دەرکیان بەوە کرد کە هۆی شـەڕ و ئاشوبەکان هـەمان ئـەو هۆیەیـە کـە هـانی خـاوەن زەوی و زارەکانیـدا جوتیارەکـان دەربکەن و کە ئەمەیە: قازانج.

ڕێکـەوت نییـە کـە هـەردوو گـەورە یۆتۆپیسـت: تۆماس مۆر و کامپانێلا، کاسۆلیکی بوون. "هینـری هەشـــتەم" بڕیاریـــدا کۆنەڕاوێژکارەکـــەی لـــە سێدارەبدرێ چونکی پابەنـدی ڕێبـازی کاسـۆلیکی بوو و سەروەریی کڵێسایی بۆ پادشا نەدەسەلماند. کامپـانێلاش لـە بەندیخانەیـەکی ئیسـپانی چـەندین نوســـینی پـــڕ جۆشـــی بـــۆ دامەزرانـــدنی ئیمپراتۆرییـەتێکی گـەردونیی ئیسـپانیی – پاپـایی

نووسی و سەرسەختانە دژایەتی هەڵگەڕانەوەی دەكرد لە ئاین. لە كاتی هەڵگرتنی ئەو دانیشتنەی كە بۆ دادگایی كردنی تەرخانكرابوو — كە هێشتا تازە بڕیاری لە سێدارەدانیشی دەركرابوو و ڕاگەیەنرابوو — تۆماس مۆر ئەمەی بە دادوەرانی ڕاگەیاند: "بە گوتەی ئێوە، من ناپاك و لە پادشا یاخیم. ئای! نەخێر، هێژایان بەڵكو ئەوە ئێوەن كە ناپاكن. ئێوە بە جیابوونەوەتان لە كڵێسای ڕاستەقینە یەكپارچەیی و ئاشتی كڵێسا تەفروتونا دەكەن. ئێوە زەمینە بۆ داهاتوویەكی سامناك دەسازێنن"[2].

شتێكی ئاسایی و سروشتی بوو كە بیرۆكەی جیهانی مەسیحیی یەكگرتوو بۆ ئەو مرۆڤانە دەركەوێ كە مێژوو فێری كردبوون و ئایینەكەی خۆیانیان كتومت وەكو وێنایان بۆ بەهەشت بە جدی وەرگرتبوو، لە كاتێكدا تەوژمی هێزە بەرهەمهێنەكان و ئابوری نوێی ڕكابەریی هاوڕێ بە پێكهاتن و دروستبوونی دەوڵەتە نەتەوایەتییەكان، هەڕەشەی لە ئایندەی یەكپارچەیی و ئاشتی ئەوروپا و ڕوخاندنی دەكرد. بێگومان كڵێسا لە كۆڕی ئایینی ترێنت دا بەم پەیوەندیە نوێیانەی زانیبوو بەڵام هێشتا كاسۆلیكیزم، بەو پێیەی ئایینێكی میللی تەقلیدی و باوە، دەیتوانی جیهان وەكو سیستەمێكی دامەزراو لەسەر ڕوانگەگەلێكی ئایینی كە تیایدا تەنانەت خاكیترین خەڵكیش تەوەری بایەخێكی باوكایەتی بوون، وێنابكات. بەڵام لە زەینی جەماوەردا ئەو كڵێسایەی سەدەكانی ناوەڕاست كە ئەركگەلێكی كۆمەڵایەتی گرنگی دابین كردبوو، بە تایبەت دەستگیرۆیی و یارمەتیدانی هەژاران، هێشتا هەر مابوو و نەمردبوو. بەڵام لەو ڕۆژگارەدا دەستبەرداری ئەو ئەركگەلانە بوو بوو، ئەویش دەستی كردبووە كەڵەكەكردنی سەروەت و سامان لە شێوەی پارەو پول و شتومەكدا.

وەكو دۆخی چینگەلێكی بەرفراوان لە میللەت، مرۆ و كامپانێللا لەبەر متمانەی بێگەردیان بە مەزنیی ڕێبازی كاسۆلیكی و سیمای مۆركە فریاد ڕەسەكەی، ئیمان و باوەڕی خۆیان پاراست. بیرۆكەی كاسۆلیكیی وابەستە بە مرۆڤایەتییەكی یەكگرتوو — یاخود، بە گوتەی كامپانێللا، وابەستەبە "پادشا هێتییەكی گەردونی" — بیرۆكەیەكی تۆكمەی ئیلهامیان بوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پەرتبوونە خوێناوییەكانی ئەوروپا كە زادەی ئابوری ئانارشیستیی نوێ بوو.

هەردەبوو ماكیاڤیللی مایەی قین و بێزی ئەم دوو بیرمەندە بێت. چونكی ئەوەی كە لای "ماكیاڤیللی" فلۆرەنسایی هەقیقەت و ڕاستییەكی پەسەند و گشتی بوو، دیارە مەبەست لە بەكارهێنانی ئایینە وەكو هۆكارێك بۆ بەرژەوەندی دەوڵەت لەگەڵ فەرامۆشكردنی ئاكاردا، لای ئەوان پێوەر و تەنانەت بناغەی نەهامەتییەكانی ئێستا بوو — وەكی كامپانێللاش دەڵێت: "هەموو میرەكان تا ڕادەیەك سیاسەتمەداری ماكیاڤیللیستین" — "ئایین دەكەنە تەنها هۆكارێك بۆ باڵا دەستیی"[3].

مۆر و كامپانێللای یۆتۆپیست قینیان لەو پەرۆشییە ئاینییە ساختەیە بوو كە دەیانبینی نەك هەر تەنها لای گەورە پادشاكان بەڵكو بە تایبەت لای گچكە میرەكانی ئیتاڵیا و فەرەنساش دەردەكەوت و ئەمەبوو: تەنها پەردەیەكی كۆن و بەسەرچووە بۆ شاردنەوەی بێنرخترین سەوداو مامەڵەكانی كۆشكی پادشایەتی.

ئایین لای مۆرو كامپانێللا وەكو ئەو دەفرە پیرۆزە وابوو كە لە بەرامبەر بێنەوایی كردەییدا هاوسەنگیی بە بێگەردی دەهێڵێتەوە، ئەوان

گەرەکیان بوو یەکبوونی قەدیسەکان لەسەر زەمین بەرجەستە بکەن، ئەو یەکبوونەی کە لە باریدایە ڕێنوێنییەکانی مەسیح بخاتە شوێنی یاساکانی ڕکابەریی ئازاد. هەروەها نەشدەکرا کە ڕوانگەیان پشت بەوێنای سروشتی مرۆڤایەتی بەو جۆرەی کە هۆبز ڕاستەوخۆ لە واقیع هەڵیهێنجابوو، ببەستێت: مرۆڤ لای ئەو دوو بیریارە گورگی مرۆڤ نییە و، بە سروشتیش خراپەخوازنییە، ئەگەر بەو جۆرەشی لێبێت ئەوە هەڵەیەکە و تاوانەکەی دەکەوێتە ئەستۆی دامەزراوە زەمینیەکانەوە، بە تایبەت ئەو دامەزراوانەی کە لەسەر موڵکایەتی دامەزراون. کامپانێللا لە پای ئەوە سەرزەنشتی ماکیاڤیللی دەکات کە تەنها لە هاندەرو پاڵپێوەنەرە خراپەکانی لای خەڵکی بە ئاگایە و دەیانزانێ و جەخت لەوە دەکات کە خەڵکی تەنها بەهۆی خۆپەرستییەوە نابزوێن بەڵکو هەروەها بە هاندانی خوداوەندیی بۆ خۆشویستنی نزیکیش دەجوڵێن.

بەم جۆرە ئەم دوو یۆتۆپییستە پێش تیۆریاکەی ڕۆسۆ دەکەون کە: مرۆڤەکان بە سروشت چاکەخوازن بەڵام موڵکایەتی خراپەخوازی کردون. تۆماس مۆر لە یۆتۆپیادا دەڵێت: "وەختێك کە خۆم دەدەم بە دەست ئەم پێودانگانەوە، پێویستە پێ لەوە بنێم کە ئەفلاتون تەواو لەسەر هەق بوو و هیچ سەرم لە سوکایەتیکردنی ئەو بە دیاریکردنی یاساگەلێك بۆ میللەتانێك کە هاوبەشایەتی خێر و بێرەکان ڕەتدەکەنەوە، ناسوڕمێت. ئەم گەورە دانایە پێشوەخت زانیبووی کە تاقە هۆکار بۆ بەرجەستەکردنی بەختەوەری گشتی لە جێبەجێکردنی پرەنسیپی بەرابەریدایە، بەڵام بەرابەری لە دەوڵەتێکدا کە تیایدا موڵکایەتی بە مافێکی تاکە کەسی بێ سنور سەیر دەکرێت، کارێکی ئەستەمە، چونکی بەمجۆرە هەرکەسە بە بیانووی بەهانە و مافگەلێکی جیاواز هەوڵی خاوەنداری دەدات بە گوێرەی توانای خۆی و، ئیدی دواجار سەروەت و سامانی نەتەوایەتی چەندە زۆر و زەوەندیش بێت دەکەوێتە نێودەستی کەمایەتییەك لە خەڵکییەوە کە تەنها و تەنها بێنەوایی و هەژاریی و بێدەرەتانی بۆ کەسانی تر جێدێڵن[4]".

هەروەها موڵکایەتی لای یۆتۆپییستانی سەدەی هەژدەیەمیش بەسەرچاوەی مێژوویی ئافات و نەهامەتییەکانی ڕۆحی مرۆڤایەتی دادەنرێت، هاوکات مۆریللیش لە دژایەتی کردنی ماکیاڤیللی و هۆبزدا نووسیویەتی و دەڵێت: "کەواتە وەرن گومڕایی و لە خۆبایی بوون و فیزوچاوچنۆکی و فێڵ و تەڵەکە و مەرایی و ڕیسوایی و هەروەها چاکەخوازییە ڕواڵەتییەکانیشمان لێکبدەنەوە، ئەو دەمە هەموو ئەوانە لە نێو ئەم توخمە وردو مەترسیدارەدا کۆ دەبێتەوە: خواستی خاوەنداری و بەخاوەنبوون، ئەم خواستە تەنانەت لە نێو قوڵایی پێشکەوتن و بڵندی و بێگەردییشدا دەبینن، بەڵام ئەم تاعونە گەردوونییە گشتییە، واتە بەرژەوەندی تایبەت، ئەم پەتا لەسەرخۆو شێنەییە، ئەم سیلە کە دووچاری کۆمەڵگا جۆربەجۆرەکان دەبێت، ئایا دەیتوانی جێگەیەك بۆ خۆی لە شوێنێکدا پەیدا بکات کە هیچ خۆراك و هەوێنێکی خراپی تیادا نەبێت؟ ئەز باوەڕم بە ئەگەر و توانای بەرپەرچدانەوەی ئەو سەلماندنەی کە دەڵێت لەو شوێنەدا کە هیچ شێوەیەك لە شێوەکانی موڵکایەتی تیادا نییە هیچ کام لەم دەرەنجامە زیانبەخشانە ناتوانن ڕۆشنایی ببینن، نییە[5]".

ڕۆسۆش دەڵێت: "یەکەمین کەس کە پەرژینی پارچەیەك زەوی کرد و زاتی کرد کە بڵێت: ئەم پارچە زەوییە هی منە، کەسانێکی ساویلکەش

هەبوون کە بڕوای پێ بکەن، ئەو کەسە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی کۆمەڵگای مەدەنییە[6]".

بەڵام لە نێوان ڕۆسۆ و یۆتۆپیستەکاندا لێکدژی و جیاوازییەکی گرنگ هەیە. ڕۆسۆ بیری لە داکۆکی لە گەڕانەوە بۆ قۆناغێکی مێژوویی لە پێشتر یاخود باشتر لەو قۆناغە و لە دابەش کردنێکی چوونیەك و خێرای موڵکایەتی نەدەکردەوە، بەڵام یۆتۆپیستەکان پرۆژە ئایدیالیەکەیان بریتی بوو لە پلاندانان بۆ کۆمەڵگایەکی کۆمۆنیی بەبێ موڵکایەتی تایبەت، بەرجەستەکردنی ئەم پرۆژەیەش لای ئەوان لە ڕێگای ئەو هۆکارانەوە کە هەنوکە لەبەردەستدان بەشێوازێکی خەیاڵیی سەرسوڕهێن کارێکی لە توانادا بوو. هەر ئەمەشە ڕاڤەی ئەوەی کە شارگەل یاخود دەوڵەتگەلی خەونەکانیان لە داهاتوودا نییە — بە پێچەوانەی پرۆژە سۆشیالیستییە نوێیەکان و دورگەی ئەتلانتیدی نوێ لای بیکۆن — بەڵکو لە پێگەیەکی لە ڕووی شوێنەوە دوور لە شوێن و جێگای بوونی ئەو نووسەرانەیە — دەوڵەتی یۆتۆپیا لای مۆر لە دورگەیەکدایە لە نێو زەریاداو، شاری خۆری لای کامپانێللاش لە نێو سیلاندایە. لای ئەو فەیلەسوفانە، دەکرێت کۆمەڵگای تەواو کامڵ لە هەر کات و لە هەر شوێنێکدا بێت دابمەزرێنرێت بەو مەرجەی کە خەڵکی، ئیدی چ بە قایل کردن بێت یان لە ڕێگای فێڵ یاخود هێزەوە[7] ڕووبکەنە پشتبەستن بەو فۆرمە سیاسییەی کە بۆیان لەبارە.

ئەم تەقللایە کە چاوپۆشی لە مەرجە مێژووییەکان دەکات، یۆتۆپیستەکان بە هۆبزەوە گرێدەدات. یۆتۆپیستەکان بە چاوپۆشیکردن لە مەرجەکانی قۆناغەکە، بڕوایان وایە وەکو چۆن تیۆریای پەیمان بڕوای بە ئەگەر و توانای دامەزراندنی کۆمەڵگایە لەسەر بناغەی ویستی ئازادی هاوڵاتیان، دەتوانرێت کۆمەڵگایەکی نوێ کە تەنها لەسەر بناغەی بڕیارە سەر فراز و ئەقڵانییەکانی لای مرۆڤەکان دامەزرابێت، دروست بکرێت. مۆر دەڵێت هەر ئەوەندە بەسە کە پێوەرە ڕاست و دروستەکان پێشچاوی فەرمانڕەوایان بخرێت، چونکی چاکتر دوژمنی چاکە و تەنها ئەو کاتەش هەموو شتێك چاك و باش دەبێت ئەگەر خودی خەڵکی خۆیان چاك و باش بن. دروست بەورپاییشەوە دەڵێت: بەڵام ڕاگەیشتن بەمە "چەند" ساڵێك دەخوازێت[8]. ڕەنگە کتومت پێودانگگەلێکی یۆتۆپی لەم جۆرە هانی ئەویاندابێت ڕاوێژکاریی هینری هەشت قەبوڵ بکات.

یۆتۆپیا باز بەسەر زەمەندا دەدات، چونکی لە خواستگەلێکی مەرجدار بە ڕەوشێکی دیاریکراوی کۆمەڵگاوە هەنگاو هەڵدەگرێت و لەگەڵ گۆڕانی واقیعدا دەگۆڕێت و دەیەوێت لە ڕێگای بەکارهێنانی ئەو هۆکارانەوە کە لەو کۆمەڵگایەدا لەبەردەستدان، کۆمەڵگایەکی تەواو کامڵ دابمەزرێنێت: کە خاك و زەمینی خۆشبەختیی خوراق بێت بۆ ئەندێشەیەك کە لە ڕووی مێژووییەوە مەرجدارە. یۆتۆپیا دەرکی ئەوە ناکات ئەو پلە و ئەندازە مێژووییەی کە پرۆژە وابەستەکەی بە "دەوڵەتی ناشوێن"ی بەسەردا دەسەپێنێت، لە دوو توێیدا مەرجەکانی گۆڕان و، بوون و لەناوچوونەکەی هەیەو، لە پێناو بەرجەستەکردنی هەرشتێکیشدا پێویستە ئەم مەرجانە نەك هەر شێوە زانینێکی ورد و دروست بزانرێن بەڵکو دەبێت پێیانەوە "بلکێن". ئەو دەخوازێت ئێش و ئازارەکانی کۆمەڵگای ئێستا لەناوببات و تەنها چاکەخوازی تیادا دەهێڵێتەوە، بەڵام ئەوەی لە یاد دەچێت کە هەردوو توخمی چاکە و خەراپە شتێك نین جگە لە دوو ڕوواڵەتی جیاوازی هەمان ڕەوش و بارودۆخ، چونکی هاوکات

هەردووکیان لەسەر هەمان ئەو مەرجانە دادەمەزرێن. هەروەها لە گۆڕانی ئەوەش کە هەیە "ماهو موجود" بەو جۆرە تێناگات کە وەرچەرخان و گۆڕانێکی سەخت و لێوانلێوە لە قوربانیدانی پایە و بونیانەکانی خودی کۆمەڵگا، بەڵکو بەو جۆرە تێیدەگات کە شوێن و جێگاکەی دەگۆڕێت بۆ خود.

بەم چەشنە، ڕێبازی یۆتۆپی ڕووبەڕوی ئەم ئاستەنگە لۆژیکییە دەبێتەوە: لە کاتێکدا جەخت لەوە دەکات کە مۆڵکایەتی مادی بناغەی پێکهاتی دەروونی مرۆڤەکانە، بە پێچەوانەی ئەمەوە پێی وایە کە پێویستە خودی ئەم دەروونە مولکایەتی لەناوببات و نابود بکات. بە دەربڕینێکی دیکە، ئەم کەموکورتییە لۆژیکییە لە مەڕ قەدەغەکردنی ئایدیا مرۆڤایەتییەکان کە دەبێت بەدامەزراوە بەد و خراپەکان کە هەن کارتێکراوبن، تەنها ئەگەر و توانای گۆڕانی شێنەیی بە کردەوەی واقیعی کردەیی "کەمەسەلەیەکە و دەکرێت پاساو بدرێت" دەرناخات، بەڵکو ئەگەر توانای وەسف کە بەرەو دوورترین وردەکارییەکان دەڕوات، وەسفی وێنەی نموونەیی کۆمەڵگایەکی تەواو کامڵیش دەردەخات. لێرەشدا جارێکی دیکە ئەو بیرۆکە گومڕا وابەستەیە بە ئەقڵێکی سەرتاپاگیری ڕەها دەبینین کە پێشان لە تیۆرییاکانی فەیلەسوفە بۆرجوازییەکاندا بینیمان، بەڵام ئەرك و کاریان لەوێڕا پێچەوانەی ئەرك و کاریانە لای یۆتۆپیستەکان و لە گۆڕینی سیماو مۆرکی ئەو کۆمەڵگایەدا کە هەیە و تێپەڕاندن "تمریر"ی گوتەزاکانی بەو جۆرە کە گوتەزاگەلێکی تا هەتایین، بەرجەستە دەبێت.

مۆر و کامپانیللا بڕوایان وابوو خێر و بێرە پێداویستەکان بۆ کۆمەڵگا لە باریاندایە زۆر و زەوەند و تێرو تەسەل بن ئەگەر بە شێوازێکی ئەقڵانی کار ڕێکخرێت و ئەگەر بەرهەمهێنان لە پێناو قازانجی تایبەتی تاکدا نەبێت بەڵکو ڕاستەوخۆ لە پێناو تێرکردنی پێویستییەکانی کۆمەڵدا بێت. کارکردن تەنها بۆ تاوانکاران نەبێت بە زۆر و ناچارییە: لای مۆر شەش کاتژمێر کارە لە ڕۆژێکدا و، لای کامپانێللا تەنها چوار کاتژمێرە. یۆتۆپیاکەی مۆر سیمای کۆمەڵبوون و کۆبوونەوەی سەراپای هاولاتیگەلێکی سەرفراز بەرجەستە دەکات و، جەخت لە هەڵبژاردنی فەرمانبەران دەکات، هەرچی شاری خۆری کامپانێللایە لە نموونەی سیستەمە کەشیشایەتییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستەوە نزیکترە. ئەگەر یاسا و دەستوری یۆتۆپیا لە یاسا و دەستوری شاری خۆر مرۆڤدۆستانەتر و لیبرالیانەتر و ڕۆشنگەرتر و "ئینگلیزی"تر بێت ئەوا کامپانێللا بە جورئەتێکی زیاترەوە پێی لەو توانست و توانایانە ناوە کە پێشکەوتنی زانست لە بواری دەستگرتن بەسەر سروشتدا دابینی دەکات. لە دەوڵەتی داهاتووشدا پێشبینی بڕێکی تەواو لە ئامێرگەلی تازە و نوێ دەکات، هەڵبەت بیکۆن لەم بارەیەوە پێش کامپانێللا کەوتبوو. کامپانێللا تەنها بڕوای بە توانای دەستگرتن بەسەر سروشتی دەرەکی و بەکارهێنانی لە چوارچێوەی مەبەست و ئامانجەکانیدا نەبوو بەڵکو هەروەها بڕواشی وابوو زانستێك لەمەڕ وەچە دەتوانێت گەشەکردنی دانیشتوان لە کۆمەڵگادا ڕێکبخات.

یۆتۆپیستەکان لە دەوڵەتگەلێکی ئایدیاڵدا بە جێمان و ئاراستەکانی پەرەسەندنی ڕاستەقینەیان فەرامۆشکرد و ئەوەش لەسەر سروشتی سیستەمەکەیان ڕەنگی دایەوە، چونکی مەرجە ئابوورییەکانی بەڕێوەبردنێکی ئەقلانییانەی کاروبارە کۆمەڵایەتییەکان کە پشتئەستورە بە مولکایەتی

تایبەتی، بە هیچ کلۆجێك لە ڕۆژگاری ئەواندا پێدراو نەبوو بەڵکو بە پێچەوانەوە بەرجەستەبوونی ئاکام و ئەنجامی ئەندێشەکانی ئەوان لە باریدا بوو ببێتە لەمپەڕێکی دەستکرد لەبەردەم ئەو پەرەسەندنەدا کە بەندبوو بە هاندانی دەستپێشخەریی داهێنەرانەی تاك لە چوارچێوەی ڕکابەریی ئازاددا. هەروەها لەسەردەمێکدا کە تیایدا نەك هەر تەنها کەسایەتی کاپتن "القبطان" بۆ سەرکەوتنی گەشتێك یەکلاییکەرەوە بوو بەڵکو هەروەها لەو شوێنەدا "کاپتن" ورد و دروستترین ئاماژە بوو بۆ سەرۆکی لقە پیشەسازییە لە داهاتوودا چاوەڕوانکراوەکانی دیکە و لە ڕۆژگارێکدا کە چیدی، لە ئەنجامی ئەو ئەقلانیکردنەی بەرهەمهێنانی مرۆیی کە هێشتا سست و لاواز بوو، کەلێنێك هەبوو لە نێوان هۆشیاری سەرکردە ئابوریناسەکان و هۆشیاری جێبەجێکاراندا، هەروەها دەبوو کەلێنێکیش لە نێوان مەرجە مادییەکانی ژیانی سەرکردە ئاراستەکارەکان و مەرجە مادییەکانی ژیانی جێبەجێکارانیشدا هەبێت. موڵکایەتی کۆمەڵ و پەیوەندییەکانی بوون "علاقات الوجود"ی دامەزراو لەسەر بەرابەریی بەو جۆرەی کە یۆتۆپییەکان داوایان دەکرد، تەنها مەرگ و مردنی ژیار و شارستانییەتی دەگەیاند. لەبەر ئەم هۆکارە ماکیاڤیللی و هۆبز بە بەراورد لەگەڵ مۆر و کامپانێللادا پێشکەوتنخواز دێنە پێشچاو، ماکیاڤیللی لەسەر هەقە و باشی بۆچووە کاتێك کە لەمیردا لە بارەی یۆتۆپیستەکانەوە بەمجۆرە دەدوێت: "بەمەبەستی نووسینی شتگەلێکی بە کەڵك بۆ ئەوانەی کە نووسینەکانی من دەخوێننەوە، پێم وابوو هەڵوەستەکردن و ڕاوەستان لەسەر هەقیقەتی شتەکان چاکترە لە درێژدادڕی لە ڕامانگەلێکی بێکەڵك و سوودا. زۆر کەس وێنای کۆمارگەل و میرنشینگەلێکیان کردووە کە لە نموونەیمان نەبینیوەو نەبیستووە، بەڵام سودی ئەو ئەندێشە و خەیاڵانە چییە؟ جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان ئەو شێوازەی کە لەسەری دەژین و ئەوەی کە دەبێت لەسەری بژین، بە جۆرێك کە تەنها بەس کردن بە لێکۆڵینەوە لەو شێوازەی کە دەبێت لەسەری بژین پتر لەوەی فێری خۆپاراستنمان بکات فێری لەناوچوونمان دەکات[9]".

لە ڕاستیدا یۆتۆپیا دوو ڕوخساری هەیە: لەلایەکەوە ڕەخنەیە لەوەی کە هەیە و لەلایەکی ترەوە وێنایە بۆ ئەوەی کە دەبێ ببێت، واتا گەوهەرییەکەشی لەلایەنی یەکەمیاندایە. ئێمە دەتوانین لە خواست و ئارەزووەکانی مرۆڤەوە بارودۆخە ڕاستەقینەکەی هەڵهێنجین، ئەوەی کە لە میانی ڕێگا یۆتۆپییە خۆشنودەکەی مۆریشەوە دەردەکەوێت ڕەوش و خواستەکانی جەماوەرە لە ئینگلتەرا کە ئەم ڕاوێژکارە هێژایە فۆرم و شێوەیەکی پێبەخشی. هەروەها ئەو پێ لەوەش نانێت کە ئەو خواستانە کاردانەوەیەکی ئەو هەل و مەرجە مێژووییەیە کە تیایدا دەژی و لەگەڵ جەماوەردا ئازاری لێدەچێژێت، بەڵام بەشێوەیەکی ساویلکانە ناوەڕۆکی ئەم خواستانە بەرەو ئەودیوی شوێنیی "مکانی" یاخود کاتیی "زمنی" تورهەڵ دەدات هەڵبەت یۆتۆپیای ڕێنیسانس وەکو ئەمە وایە: لە سەدەکانی ناوەڕاستدا (ئاسمان دونیایی بکرێت). هەڵبەت دروستکردنی دونیایەکی دوور کە مرۆڤ بتوانێت بە زیندوویی بچێتە ناوی، سەبارەت ئەو چاخانە کە هەژار تەنها لە دوای مردن دەیتوانی بچێتە ناو یۆتۆپیاکەیەوە، وەرچەرخانێکی ڕیشەیی و ڕادیکالە. بەڵام وەکو چۆن باوەڕداری سەدەکانی ناوەڕاست ڕەنگدانەوەی پێویستییە کەسییەکانی

خۆی لە ئاسماندا دەركنەكردووە، هاوكات یۆتۆپیستەكانیش دەركی ئەوەیان نەكردووە كە ئەو دورگە دورانە كاردانەوەی ئەوانە بەڕووی بێنەوایی ئێستایاندا.

جیاوازی یۆتۆپیستەكان لەو فەیلەسوفانەی كە ستایشی ئەوەیان كردووە (كە هەیە) یاخود ئەوەی كە لە ڕێگادایە بەرەو هاتنە بوون و لەدایك بوون، لە دانپێدانانیاندایە بەوەی ئەگەرچی سیستەمی بۆرجوازی تاكەكەسی لە كۆیلەییێتی ئازادكردووە بەڵام تەنانەت لە دوا ئاكامەكانیشیدا نە هەژاریی ڕاستەقینە لەناو دەبات و نەدەشتوانێت لەناوی ببات. وەختێك كە هۆبز و سپینۆزاش ئەوەیان ئاشكراكرد كە دەوڵەت گوزارشتە لە بەرژەوەندی گشتی، لەو چوار چێوەیەدا كە تێركردنی داخوازی و پێویستییەكانی هەندێك لە چینە دەوڵەمەندەكان لە كۆمەڵگادا و هاوكات پەرەسەندنی خێرای پڕۆژەكانیان بەشداری لە پێشكەوتنی سەر لەبەری كۆمەڵگادا كرد، لەسەر هەق بوون و ڕاستی بۆچووبوون. ئەم دوو فەیلەسوفە بە واتایەك لە واتاكان دووان لە لێهاتوترین پزیشكەكان بوون كە دەسبەجێ دەوای پێویستیان دەستنیشان دەكرد ئەگەرچی ئەمە لە چەند شوێنێكی ترەوە زامیشی دروست دەكرد. بەڵام – بە پێچەوانەی ئەم دووانەوە – یۆتۆپییەكان هۆكاری نەهامەتییە كۆمەڵایەتییەكانیان لە ئابوریدا، واتە سەرەتاو پێش هەرشتێك لە بوونی موڵكایەتی تایبەتییدا دەبینی و، چارەسەری كۆتاییش یان گریٚ دابوو بە گۆڕینی پەیوەندییەكانی موڵكایەتییەوە نەك گۆڕینی یاساكان.

دروست بەراوردكردنی كۆمەڵگا بە جەستەیەكی نەخۆش یاخود تەندروست، بەراوردێكی مەترسیدارە. كۆسپ و ڕێگرە لەبەردەم بینینی ڕاست و بەجێی ئەو بارەی كە شتەكانی تیادایە، چونكی بەختەوەریی و ژیانی جەماوەری بەرفراوان، لەسەر ئاستێكی فراوان وا دێتە پێشچاو وەك ئەوەی تەنها "لە ڕووی ئۆرگانی"یەوە وابەستەی خۆشگوزەرانیی "گشت"بێت. پەیوەندییەكی ئۆرگانی لە نێوان تاك و كۆمەڵدا بەجۆرێك كە چاكە یاخود خراپەی كۆمەڵ لەگەڵ دۆخی تەندروستی تاكدا چوونیەك بێت، ئەگەر چی لە سەرەتای سەدەكانی ناوەڕاستدا لە چەند شوێن و ناوچەیەكی دابڕاوی ئەوروپاشدا "لە نموونەی ژمارەیەك لە نەتەوە سەرەتاییە خاوەن ئابورییە دەستە جەمعییەكان" هەبوو بێت، بەڵام چیدی لەسەردەمی نوێدا پەسەند و شیاو نییە. ئەم ڕووداوانە بە زمانی هیگڵ بەوە گوزارشتیان لێدەكریٚ كەسایەتی دەرەكییە بۆ هەندێكیان لە نێوان خۆیاندا و هەروەها پەرتبوونی گشتە. بەراوردكردنی كۆمەڵگا بە جەستەیەكی نەخۆش كە پێویستە ڕزگاربكرێت تەنانەت ئەگەر ئەو ڕزگاركردنە ببێتە مایەی زامداركردنی لە چەند جێگایەكیشەوە، بەراوردێكە زۆر سادە و ئاسان بەسەر بێمانایی ئەوەدا تێدەپەڕێت كە ئەو شوێن و جێگا دابڕاوانە خەڵكانێكن هەن و زیندەوەر گەلێكن چارەنووسی تایبەت بە خۆیان و یەك ژیانیان هەیە. بەڵام یۆتۆپییەكان بەم جۆرە لەو بێمانایییە بێزراوانە گەیشتبوون: ڕێك و ڕاست ئەو خەڵكانەن كە ئێش و ئازار دەچێژن و كە كۆمەڵگا ناچار بە ژیانێكی نا مرۆڤانەی كردون. لە دووتوێی كارەكانیشیاندا گرنتییەك هەیە بۆ ئەوەی كە تەنها ژێرەو ژوركردنی بناغەكان – نەك چاكسازییە یاساییە پەتییەكان – دەتوانێت یەكبوون لە بری بوونی پەرتەوازە و پەرت پەرت و

نـــامرۆیی و، دادپـــەروەریی لـــە جیـــاتی جـــەورو ستەم بخولٌقێنێت.

ئـــەوەی کـــە لـــە والأکردنـــی هـــەر کتێبێـــك لـــە کتێبەکانی یۆتۆپیادا فێری دەبین ئەوەیە کە دەبێت ڕێز و بایـەخ بـۆ شایستەیی بگەڕێنرێتـەوە و نابێت تەنها هەر خراپەکاران خۆیان خاوەنی هەموو خێر و بێرەکان بن، وەکی لـە واقیعی ئێستاشدا هـەر وایە، کاتێـك کـە یاسـا ئابوورییـەکان دەتـوانن ئازادانـە هەڵسـوکەوت بکـەن، ئـەو دەمـە ئـەوەی کـە بـە پێـی جیاوازی بەشەکان لە سەروەت و ساماندا بەختیاری و بەدبەختی دابەش دەکات بەها یـاخود شایستەیی نابێت بـەڵکو ڕێکـەوتی پـەتی دەبێت. لـە دوو تـوێی یۆتۆپیادا دڵنیاییەك هەیە کە دەڵێت: کۆمەڵگا تـەنها ئەو کاتـە دەتوانێت ئـەو ئامانجـە کـە مافی سروشـتی بۆرجـوازیی بـۆی دیـاریکردووە و کـە "بـەدیهێنانی بەرژەوەندییـەکانی هەمووانـە" بەرجەسـتە بکـات، ئەگـەر بنـەما ئابوورییەکـەی، میکـانیزمی ڕکابـەریی کوێرانـــەی نێـــوان چـــەندان ویســـت و ئـــیرادە تاکەکەسییەکان لـەناو ببـات و نەخشـە و پـلان بـۆ پرۆســـەی پەرەســـەندنی ژیـــان بـــۆ بەرژەوەنـــدی هـەمووان دابنێـت. ئـەم تیۆریایـە کـە پەیوەندییـە ئابوورییـــەکانی خـــەڵکی و خۆشـــگوزەرانی مـــادی و هـــەروەها پەرەســـەندنی ئاکـــار و زانســـتەکان بەیـــەکترەوە گـــرێ دەدات، خـــەونی یۆتۆپیســـتە نوێیـــەکان دەبەسـتێت بـــە کۆمـــاری ئەفلاتونـــەوە، هاوکـات ئـەوەش بـەیان دەکـات کـە لایـەنی کـەم ئـەم خەونانـە، لـە ستایشـکردنی ئـەوەی کـە هەیـە، لـە واقیعەوە نزیکترن.

چـــەندێك بەرژەوەندییـــەکانی ئـــەو تاکـــە کەســـانەش کـــە گـــیرۆدەی ئـــێش و ئازارەکـــانی سیســـتەمی کۆمەڵایـــەتی بـــاو و بـــاڵا دەســـتن لـــە کۆمـــەڵگادا زیـــاد بکـــات، هێنـــدە بایـــەخی ڕێبـــازی مۆڵکایـەتی یۆتـۆپی، لـە ڕووی زانینی هەنوکەییـەوە زیاد دەکات. هەڵبەت کارێکی چەوت و ناڕاست بـوو باز بەسەر ئێستادا بدرێت و ئەو توانایانە کە واقیع، بە هیوای کەمالیکی ڕەها دابینی دەکات، فەرامۆش بکرێن، بەڵام هەروەها بیرنەکردنەوە لە سیستەمێکی چـــاکتر و نـــەزانینی مەرجـــەکانی بـــوونی ئـــەو سیستەمەش دیسان هـەر کارێکی چەوت و چەوێڵ بـوو. کانـت لـە ڕەخنـەی ئـەقڵی پەتیدا سـەبارەت بـە یۆتۆپیـای ئـەفلاتون دەڵێـت: "لـە جیـاتی ئـەوەی کـە ئەم بیرۆکەیە بە ناوی بێکەڵکییەوە و بە بەهانەیـەکی ئێجگـار سسـت و لاواز کـە ئـەویش ئـەم بەهانەیەیـە: شـــیاوی بەرجەســـتەبوون نییـــە، دوور بخرێتـــەوە، چاکتر وا بـوو قـوڵ بکرێتـەوە و (...) هـەوڵ بـدرێت نـرخ و بەهایـەکی بـدرێتی"[10]. کانـت، سـەبارەت هـەمان ئـەو مەرجانـەی بەرجەسـتەبوون، هاوبەشـی هەڵەو چەوتییەکانی یۆتۆپیستەکانە: ئەگەر خـەڵکی نـەتوانن سیســتەمێکی کۆمەڵایــەتی تــەواو کامــڵ بەرجەستە بکەن ئەوە سەرەتاو پێش هـەر شتێك بۆ ئەمـە دەگەڕێتـەوە: "یاسـادانان ئایـدیا ڕاسـت و بەجێیـەکان بـە هەنـدوەرناگرێت" ئـەوەی کـە لـە ڕوانگـەی ئـەودا گرنگـە گواسـتنەوەی ئـەم ئایـدیا ڕاستانەیە بۆ "یاسادانەران". هـەروەها کانت خۆی وابەسـتەی ئەمـە دەکـات: تارمـایی کۆمەڵگایـەکی هاوئاهـــەنگ و لـــە هـــەر ســـاتێکدا شـــیاوی بەرجەسـتەبوون بـەو مەرجـەی کـە پەیوەندیـداران زۆرچاك بزانن ئەو کارە چییە کە پێویستە بیکـەن و کە دروسـت ئـارەزوی کردنیشـی دەکـەن. بەهـەرحاڵ ئـەوەی کـە هـەڵگری سروشـتیی هـەم زانـینی ڕەگ و ڕیشـــەکانی خراپەخوازییـــە کـــە یۆتۆپیـــا ڕەنگدانەوەیەکییـەتی و هـەم ئـەو ئامانجـەش کـە ڕزگـاربوون وابەسـتەیەتی، یاسـادانەرانی هەنوکـە و ئەمێسـتا نـین بـەڵکو ئـەو گروپانـەن کـە وەکـی

بــەرەنجامێكی شــوێن و پێگــەیان لــە پرۆســەی پەرەسەندنی ژیانی كۆمەڵایەتیدا ئەزمونی بێنەوایی مادی دەكەن.

هــەوادارانی مــافی سروشــتی، بــە پێچــەوانەی یۆتۆپییەكانــەوە كــە سیســتەمی هەنوكــەییان رەتكردەوە، راگەیاند كە دەوڵـەتی بۆرجوازیی نوێ لە رووی گەوهەرەوە گرنتییەكە بۆ خێـرو چاكەی هــەمووان و باشــترین زامنكــەری ژیــانی هاوڵاتییەكانیشییەتی، هـەروەها بۆ ئـەو سـەردەم و رۆژگـارەش راسـتەوخۆ بەرجەسـتەی پێشـكەوتن و دادپـەروەریی دەكات. ئەم دڵنیاییە كە دواتر بـەبێ بــەردەوامبوون لەســەر بــەراوردكردن لــە نێــوان دەوڵــەتی راســتەقینەی دامــەزراوو ئامــانجی راگەیـەنراودا، بـە تونـدی پارێزگـاری لێكـرا، بـەوە كۆتـایی هـات كـە بگۆڕدرێت بۆ ئایدیۆلۆجیایـەكی پەتی. بەڵام یۆتۆپیا لەسەرەتادا تەنها گوزارشت بوو لە خواستگەلێكی كەنەفت و شیعرێكی پەتی بوو بۆ رووبەڕووبوونــەوەی داكــۆكی ئایــدیۆلۆجی لــە سیســتەمێك كــە لــە بنەڕەتــدا بــە لــەناوبردنی پەیوەندییــە فیوداڵییــەكانی كۆیلــەییێتی، واتــە بەركابـەریی ئـازاددا، دەناسرایەوە. لەگـەڵ ئەوەشـدا شتێكی سروشتییە كە هێدی هێدی ئەو خواستانە، لەو چوارچێوەیەدا كە پەرەسـەندنی كۆمـەڵگا گەشـە بـە مەرجـەكانی گـۆڕانی رێسـا كۆمەڵایەتییـەكان دەكـات و لـە ژمـارەی ئـەو هێزانـەش كـە توانـای بەرجەسـتەكردنی ئـەو گۆڕانكارییـەیان هەیـە زیـاد دەكـات، زیـاتر كەنـەفت و بـێ توانـا بێـت. وەكـی پێشتریش ئاماژەمان پێدا دامەزراندنی ئابوورییـەكی هاوبـەش لـە هـەردوو سـەدەی شـانزە و حەڤـدەدا كارێـك بـوو بـە دوور دەزانـرا، چـونكی ركابـەریی مــەرجێكی پێداویســتی هــەر پەرەســەندنێكی لەرادەبــەدەری كۆمــەڵگا بــوو[11]. ئــەوجا ئەگــەر یۆتۆپیاكــان ئــەم مەســەلەیە بەهەنــد وەرنــەگرن و فەرامۆشی بكەن ئەو دەمە بە هەمان ئاست و ئەندازە و بـە جۆرێـك كەنـەفت دەبـن لـە خوڵقانـدنی دوایـین ئامانجیانــدا كــە دەكرێــت بــە هــەرچ پرۆژەیــەكی سیاسی بێت بەراورد بكرێن.

ئەستەمێتی بەرجەستەكردنی دەسبەجێی ئەم ئامانجـە و جۆرێـك لـە بەرژەوەنـدی وابەسـتە بـە رێكخســتنی كۆمــەڵگاوە كــە مەســەلەیەك بــوو یۆتۆپییەكان لە دژی دەجەنگان، بەڵگە و بەهانەیـەك نییە بۆ ناكۆكی و لێكدژییە باوو و باڵادەستەكانی نێو كۆمەڵگا. چونكی ئەو كەسەی كە لە سیستەمی كۆمەڵایەتی نوێدا ئازار دەچێژێت تەنها لە خەون و، لە ناوەوەگـەرایی پەتیـدا داڵـدەو پـەناگای دەستگیر دەبێــت، لەبەرئــەم هۆكــارە ئــایین بەشــێوەیەكی دیاریكراو لـەو سـەردەم و رۆژگارانـەدا لـە نێو چینە نزمەكانــدا زۆر بیــنج داكــوتراو بــوو. ئــەو تاكانــە قوربانییــانی (رۆحــی جیهــان) بــوون كــە لــە پێنــاو ئامـانجی بڵنـد و بـاڵای خۆیـدا دەیكردنـە قوربـانی، چونكی ئێش و ئازارەكانیـان بەنـدە بـە قۆناغێك لـە قۆناغـەكانی پەرەسـەندنی مێـژوویی پێداویسـت بـۆ پێشـكەوتنەوە. ئـەوان — ئەگـەر جـارێكی تـر ئـەو بــەراوردە ئۆرگانییــە كــە دردۆنگییەكــەی لێــرەدا رۆشنتر دێتە پێشچاو، بەكاربهێنین — ئەو خوێنـەن كـە پێویسـتە لـە پێنـاوی چاكبونەوە دابرێـژرێت، هــەروەها ئــەم چــاكبوونەوەیە ئــەو خواســتەیە كــە بێنــەوایی تایبــەتی ئــەوان یەكڕاسـت دوای ئــەوەی شــێوەی یۆتۆپییــای دەداتــێ، ئــارەزوی دەكــات. هەلومــەرجێكی كۆمەڵایــەتی ئــەوتۆ كــە تیایــدا هێــزی هــەر كەســێك بتوانێــت بــە ئــازادی بــەكاربێت، پێویسـتی بـە (خەرجگـەلێكی بچـوكی چاوەڕواننەكراو) و مێژوویی خاوەن رەهەندگـەلێكی جیهانیی هەیە.

لێرەدا سیماو مۆركی گرفتئامێزی هەموو ئایدیالیزمەكان (المثالیات)، بە ئایدیالیزمەكەی هیگڵیشەوە، ڕۆشن و ئاشكرادەبێت. بیری ئایدیالیستی هیگڵ پێی وایە هەموو واقیعێك لەگەڵ ڕۆحی ڕەهادا چوونیەكە، "سروشت و مێژوو شتێك نین جگە لە هۆكارگەلی دەركەوتنی ڕۆح و ئەو دەفرانەی كە سەروەریی و شكۆكەی بژاردەدەكەن[12]". "دەبینین ڕۆح خۆی ئەزمون دەكات، لە توێی فرەییەكدا كە كەم ناكات، بەسەر بڕێك لایەن و بڕێك ئاقار و ئاڕاستەدا پەخش و بڵاو دەبێتەوە و خاوەنی بڕێك لایەن و بڕێك ئاقار و ئاراستەیە. لە چێژی ئەم چالاكییە تایبەتییەشیدا هیچ پەیوەندییەكی نییە تەنها لەگەڵ خۆیدا نەبێت[13]". ئەم بیركردنەوەیە نەك هەر لە خۆیدا شتێكی گرفتئامێز بەڵكو شتێكی سامناكیشی هەڵگرتووە: مەرگ و مردنی ڕاستەقینە و دەگمەنی تاكگەل كە ئەو شوێن و پێگەیەی لە سیستەمەكەدا گرتووە وادێتە پێشچاو وەك ئەوەی وەهمێكی پەتی بێت یاخود لایەنی كەم لە ڕوانگەی گەوهەری ڕۆحییدا هەر بەزیندوو نەمر دەمێنێتەوە بەو پێیەی كە ڕۆحێكی ڕەها یاخود هۆشیارییەكی باڵایە، خۆی بە بەهانە كار دەبینێت. بەڵام دژوارە لە ڕووی تیۆرییەوە هیچ "مانا" یەك بە مردن بدرێت، بابڵێین ڕاستتر وایە مەرگ ئەوەیە كە بێتوانایی و كەنەفتیی هەموو میتافیزیكایەكی "مانابەخش" و هەموو زانستێكی لاهوتی دەردەخات. وەك ئاشكرایە بیركردنەوە لە ڕەها بوون لە ئێش و ئازارە ڕاستەقینەكان، ئەو ئێش و ئازارانەی كە یۆتۆپیا بە ڕەنگدانەوەیەكی دادەنرێت، بەبێ تێپەڕاندنی ئەو پرۆسەیەی كە بە شێوەیەكی دیاریكراو جڵەوی ئەو ئێش و ئازارانەی لە نێو دەستدایە، كارێكی نابەجێیە. بەڵام هیچ شتێك ئەوەندەی ئەو دانایییە كە بۆیە هەست بە ڕەزامەندیی دەكات چونكی ئەو زەرورەتەی دامەزراندووە، دژایەتی ئەرك و كاری فەلسەفەیەكی واقیعی ناكات. ئەو بۆچوونەی كە پێی وایە مێژوو بە هەنگاو هەڵگرتن لە كۆمەڵگایەكی ترەوە كۆمەڵگایەكی چاكتر و باشتری بەرجەستەكردووە و هەروەها دەتوانێت لە ماوەی ئاقاری خۆیدا كۆمەڵگایەكی تری چاكتریش بەرجەستەبكات، بۆچوونێكی ڕاست و بەجێیە، بەڵام ئەوەش دیسان هەر ڕاست و بەجێیە كە ڕێگا و ڕەوتی مێژوو بەسەر ئێش و ئازارو بێنەوایی كەسەكاندا تێدەپەڕێت. لە نێوان ئەم دوو ڕاستییەشدا ڕستێكی تەواو لە پەیوەندیگەلە ڕۆشنەكان هەن، بەڵام هیچ مانایەكی پاساوكاری بوونی نییە.

ئەم پێودانگە فەلسەفییانە ڕێگای ئەوەمان نادەن حوكم و بڕیارێكی بەرز و باڵا لەسەر ئەو پرۆژانە بدەین كە هەندێك لە خەڵكی دەیانەوێت بیكەنە بەرجەستەكردنێكی ڕاستەوخۆی یۆتۆپیاو دامەزراندنی دادپەروەریی ڕەها لەسەر زەمین.

لە ڕۆژگاری تۆماس مۆردا مرۆڤێك كە لە لایەن خودی ئەم ڕاوێژكارە ئینگلیزییەوە (واتە لەلایەن خودی تۆماس مۆر خۆیەوە — و.ك) مرۆڤێكی بێزراو بوو، ویستی پرۆژەیەكی هاوشێوە لە ئەڵمانیادا بەرجەستە بكات بەڵام ئەو پرۆژەیە هەر لە سەرەتاوە پرۆژەیەكی نەزۆك بوو. هۆكارەكانیشی بە هیچ كلۆجێك گونجاوو لەبار نەبوون ئیدی سەرنەكەوت و شكستی هێنا. ئەم مرۆڤە تۆماس مونزیرە (*T. Munzer*)[*]. مونزیر لە پاش زنجیرەیەكی بێ پایان لە ئێش و ئازار، نەیویست چاوەڕوانی بەرجەستەبوونی مەسیحیەت بكات و ئەوەی ڕاگەیاند كە خودی مەسیح خۆشی نەیدەتوانی لەبەردەم ئەو جەور و ستەمەی كە باڵی

بەسـەر زەویـدا كێشـا بـوو دانبـە خۆیـدا بگرێـت. مـونزیر بـە گوتـەكانی خـودی مەسـیح خـۆی وەڵامـی زانایانی لاهوتی دایەوە.

تۆماس مونزیر، سەبر و دانبەخۆداگری كە بە یەكێك لە تایبەتمەندییەكانی ئایدیالیزم دادەنرێت، نـەماو لـە دەسـتدا. تیۆریسـتان و جێبـەجێكارانی سیاسەت دەزانن كە كەمترین گۆڕانكاریگەلە چالاك و كاریگەرەكان بۆ ئەوەی بەرجەستەبن پێویستیان بـە مەرجگـەلێكی ئـاڵۆز و دوورودرێـژ هەیـە، بـەڵام چیدی هـەموو ئەوانە نـاتوانن زەمینـە بـۆ دەست لە كـار هـەڵگرتنی دانـای بیرمەنـد بسـازێنن. پێویسـتە ئـەو كەسـەی كـە داوای سـەبر و دانبـەخۆداگری لەبـەردەم ئـازار و مردنـدا دەكـات (لـەو چـوار-چێوەیەدا كـە ئـازار و مـردن بەنـد و مەرجـدارن بـە چەند دامەزراوێكی مرۆییەوە) ئەمەی لە یادنەچێت: ئـەو دانبەخۆداگرییـە گشـتییە كـە لـە ڕووی پێداویسـتیی مێژووییـدا ڕادەوەسـتێت، هۆكـارێكی سـەرەكی پێداویسـتیی چاوەڕوانییشـە. ڕاڤـەكردنی ئاقـاری مێـژوو كـە تـا ئێسـتاش لەسـەر ئاسـتێكی بەرفراوان پێویستی بە تەواوكردن و جێبەجێكردن هەیـە، بەهـەرحاڵ سـەبارەت بـە فەلسـەفەی مێـژوو شتێكی تەواو جیاوازە لە پاساودانی ئەستەمی ئەو ئاراستەیە.

نیچـە حـوكمێكی بنـەبڕی داوە، كـە هاوكـات حوكمێكی ناتەندروست و بیٚ كەڵكیشـە، كاتێك كە لەو كتێبەیدا: "دەربارەی كەڵك و زیـانی لێكۆڵینـەوە مێژووییــەكان" هۆشــدارییەكی گشــتی لــە دژی زانستی مێژوو بڵاوكردووەتـەوە. بەڵام وەختێك كە مێـژوو لـە دژی یۆتۆپیـا بـەكاردەهێنێت، ئـەو دەمـە ئامـاژەكردن بـۆ هەنـدێك لـە دەسـتەواژەكانی نیچـە شیاو دەبێت، نیچە كاتیٚ بەسەرسامییەوە قسە لـەو شــتە دەكــا كــە نــاوی نــراوە "هێــزی مێــژوو" دەنووسێت و دەڵێت ئەم هێزە: "لە هەر سـاتێكدا بـە كـردەوە دەگـۆڕێـت بـۆ سەراسـیمەبوونی سـاویلكانە بەدەرەنجام و دەبێتە هۆی پەرستنی ڕووداوەكان. لە بـارەی ئـەم پەرسـتنە هاوبەشەشـەوە ئەمێسـتا ئـەم دەربڕینـــە پـــتر ئەفســـانەیی و پـــتر ئەڵمانییـــە بـەكاردەهێنرێت: "ڕەچاوكردن و بەهەند وەرگرتنی ڕووداوەكان" بەهەرحاڵ ئەوەی كە لە بەردەم "هێزی مێژوو"دا فێری خۆچەماندنەوەو سەر لەقاندن بووە، جگە لە ئاماژەیەكی میكانیكیی قایل بوون، هێمایەك لەسـەر شـێوازی چـینی لەبـەردەم هـەر جۆرێـك لـە جۆرەكانی هێزدا ئیدی چ هێزی حكومەتێك یان ڕاو بۆچـوونێك یـان زۆرایەتییـەكی ژمـارەیی بێـت، چـیدیكەی لـیٚ ناوەشـێتەوە. پەلوپۆیەكانیشـی بـە وێنەی ئەو ڕێگاو شێوازە كە "هێزێك" لـە هێزەكان بـــۆ جوڵانـــدنی داوەكـــانی بەكاریـــدەهێنێت، دەبزوێنێت. ئەگەر هەموو ڕووداوێك سـەركەوتنێكی لۆژیـك یـاخود "ئایـدیا" بووایـە، كەواتـە دەسـبەجیٚ بكەوە سەرچۆك و، بەم شێوەیەی ئێستاتەوە لەسـەر تەواوی پێپلیكانەی "دەرەنجامەكان" وەرەخوارەوە! (...) ئـای لـەم ڕێگایـە بـۆ ڕامـان لـە مێـژوو، ئـای لـەم قوتابخانـەی ئەدەبـە! ڕامـان لـە هـەموو شـتێك لـە ڕوانگەیەكی بابەتییەوە، تووڕە و بێزارنەبوون لە هـیچ شتێك، خۆشنەویستنی هـیچ شـتێك، تێگەیشـتن لـە هەموو شتێك، چەندە ئەوە مرۆڤی میهرەبـان و نـەرم و نیـان دەكـات! (...) كەواتـە مـن دەڵـێم هەمیشـە مێژوو ئەمە دەزانێت: "هەبوونـەبوو" لـە كاتێكدا لـە بەرامبـەر ئـەوەدا ئاكـار ئەمـە دەزانێـت: "پێویسـت نییە لە سەرت" یاخود "پێویست نـەبوو لەسـەرت". ئیــدی بــەم چەشــنە مێــژوو دەبێتــە كورتــە و پوختەیــەكی نائاكــاریی كردەیــی[14]". نیچـە كـە دروسـت پەرەسـەندنە فەلسـەفییەكەی نـەك بـەرەو پەرسـتنی مێـژووی مرۆیـی بـەڵكو بـەرەو پەرسـتنی

مێــژووی سروشــتیی، بایۆلۆجیــای بــرد و کــە بــە کردەوە کەوتە نێو "سەراسیمە بوونی ساویلکانە بە ئــەنجام و شــکۆمەندکردنی ســاویلکانەی ئــەنجام" واتــە ئــەنجامی بــایۆلۆجی پەتییــەوە، لێــرەدا بــیرو هزرێکــی ئەقڵانی داهێنــاوە. ڕاڤــەی تــەواو و زانــینی تـــەواوی پێداویســـتیی ڕووداوێـــك لـــە ڕووداوە مێژووییــەکان ســەبارەت بــە ئێمــە کــە دەکــارێین و چــالاکی دەنــوێنین، دەتــوانن ببنــە هۆکارێــك بــۆ ئەقڵانیکردنی مێژوو، بەڵام مێژووی ڕەچاوکراو "لــە خۆیـــدا" خـــاوەنی ئـــەقڵێك نییـــە، چـــونکی نـــە "گەوهەر"ێکە ئیدی لە هەر چەشن و جۆرێك بێت و، نــە "ڕۆح"ێکــە کــە پێویســت بێــت لەبەردەمیــدا بچــەمێینەوە و نە"هێز"ێکیشــە بــەڵکو کورتەیــەکی واتـــایی ئـــەو ڕووداوانەیـــە کـــە لـــە پرۆســـەی پەرەسەندنی ژیانی کۆمەڵایــەتی خەڵکییــەوە بەرهــەم دێــت. هــیچ کەســێك لەلایــەنی "مێــژوو"ەوە بانگهێشــتی ئــەوە ناکرێــت کــە بــژی یــاخود بمرێــت، مێــژوو نــە هــیچ ئــەرکێك پێشــنیار و پــێش دەســت دەخــات و نــە هــیچ ئــەرکێکیش چارەســەر دەکــات. تــەنها مرۆگــەلێکی ڕاســتەقینە هــەن کــە چــالاکی دەنــوێنن و کەنــدو کۆســپەکان تێدەپــەڕێنن و ئــەو خراپەخوازییە تاکەکەسی یاخود دەستەجەمعییە کە خــودی خۆیــان یــاخود کــە هێزەکــانی سروشــت دروستیان کردووە، کەم دەکەنەوە. ئەو داوایــەی کە وابەســـتەی ســـەربەخۆیی توانـــەوە "الاســـتقلالیە الحلولیــە"ی مێــژووە لــە بوونــەوەرێکی ســەرەکی یــەکگرتوودا، لــە میتافیزیکایــەکی دۆگمــا بــەولاوە هیچی تر نییە.

## پەراوێزەکان

1-لــەم بەشــەدا چــەند یۆتۆپیایــەك بــاس دەکــەین کــە نــاوەڕۆکێکی چوونیەك پێشدەست دەخەن، بە تایبەت یۆتۆپیای (شاری خۆر)ی تۆماسۆ کامپانێللای ڕاهیب و کەشیشــی کــالابری (مەبەســت لــە کــالابری، ناوچــەی کالابریایە لە باشوری ئیتاڵیا) کە یەکێکە لە گەورەترین فەیلەســـوفانی ســـەردەمەکەی خـــۆی. ســـەبارەت بـــە کامپــانێللا تەماشــای ئــەم سەرچــاوەیە بکــە: *Friedrich Meinecke, Die Idee der staatsrason in der neueren Geschichte, Munich – Berlin 1925*.

هـــەر لـــە هـــەوادارە ڕادیکالـــەکان (*Niveleurs*)ی کرۆمۆیڵــەوە تــا فەیلەســوفە فەرەنســیەکان زۆرێــك لــە ئەدەبیاتی یۆتۆپی هەن، یەکێك لە تایبەتمەندترین ئەو یۆتۆپیایانەش یۆتۆپیای "یاسای سروشت"ی کەشیش مۆریللییــە کــە لــە ســاڵی 1755دا دەرچــووە. هەرچــی یۆتۆپیاکــانی هــەردوو ســەدەی نــۆزدەو بیســتە کــە لــە ڕوانگـــەی فەلســـەفەی مێـــژووەوە واتایـــەکی تـــەواو جیاوازیــان هەیــە، ئــەم لێکۆڵینەوەیــە نەچــووە بەلایانــدا. (م.هـ).

2-بەڵگەنامــەکانی دادگاییەکــە لــەم سەرچــاوەیەوە وەرگیراوە: ئیمیل دیرمینگهام *E. Dermenghem*، تۆمــاس مۆرو یۆتۆپیستانی چاخی ڕێنیسانس، پاریس 1927، ل.68

*3-meinecke. Op, cit. P 123.*

*4-Thomas More, Utopie, Trad, M Delcourt, la Renaissance du livre, 1966, p. 52.*

*5-Morelly, code de la nature ou le veritable esprit de ses lois, paris 1910, p.15.*

*6-J.J. Rousseau, Discours sur lorigine et les fondements de linegalite parmi les hommes, Seconde partie, Oeuvrescompletes, t lll, Bibliotheque de la pleiade, 1966, p. 164.*

7-کامپالنێللا بەهۆی ژیانی خۆیەوە ئەوەی سەلماند کە پرۆژەی یۆتۆپی، لــە ڕووی گەوهــەرەوە، زەبــر و زەنــگ و قایــل کــردن وەکــی هۆکارێــك بــۆ بەرجەســتەکردنی

سیستەم و ڕژێمێکی چاکتر و باشتر بە شیاو دەزانێت، ئەمەش لەو ڕێگایەوە کە لە دوای سەرکوتکردن و تێکشکاندنی یاخیبوونەکەی لە بەندیخانەوە درێژەی بە نموونە بالآکەی خۆیدا و دەیویست قەڵەمڕەوو دەسەلآتداران بە نووسینەکانی قایل بکات. (م.هـ).

8-تۆماس مۆر، هەمان سەرچاوە.

9-میر. *Le prince. Chap XV. Bibliotheque de la pleiade. P. 335., U.G.E, collection 10/18, p.50-51.*

10-کانت، ڕەخنەی ئەقڵی پەتی.

11-ئامانج و هۆکارەکان بەجۆرێك سنوریان بەزاند بوو کە دەکرێت لە ڕێگایەوە لەو هۆکارە تێبگەین کە هانی یۆتۆپییەکانیدا بۆ بەرجەستەکردنی ئایدیاکانی خۆیان پەنا بۆ هۆکارگەلێکی ناشایستە و گەوجانە ببەن، ئەوەبوو تۆماس مۆر ئارەزوی قایلکردنی دەسەلآتدارانی دەکرد بەلآم کامپانێللا لە کالابریا یاخیبوونی کەشیشانی ڕێکخست. (م.هـ).

12-*Hegel, Encyclopedie, parag. 552, p.294*، هیگڵ ئینسایکلۆپیدیا، سەرچاوەی پێشوو بڕگەی 552، ل 294.

13-هیگڵ، کۆرسگەلێك لەمەڕ فەلسەفەی مێژوو، سەرچاوەی پێشان ئاماژە بۆکراو، پێشەکی ل 72.

*14-Nietzsche, considerations inactuelles, paris, 1907. P.217.*

*تۆماس مونزیر: دامەزرێنەری ئەو گروپەیە کە داوای گەڕاندنەوەی لە ئاو هەڵکێشان "التعمید" "*anabaptistes*" دەکەن، لە ساڵی 1525دا لە ملی درا.

## سەرچاوە


بدايات فلسفة التأريخ البورجوازية

تأليف: ماكس هوركهايمر

ترجمة: محمد علي اليوسفي

الترجمة العربية الاولى - 1981، ص 64-77.

# پاشەكشەی مرۆڤی عاقڵ

## لە نێوان دەسەڵاتی نیشانە و دەسەڵاتی زانیاریدا

عەلی حەرب

لە عەرەبییەوە: عەدالەت عەبدوڵلا

لە ژێر ناونیشانە گەورەكانی شەپۆلە مەعریفی و تەكنیكییە یەك لەدوای یەكەكاندا كە بریتین لە: جیهانگیری و پۆست مۆدێرنیزم و ئەندازەی بۆماوەیی، ئێستا جیهان بەشێوەیەك وەردەچەرخێت پێشتر شتی وای بەخۆوە نەدیوە. گومانیشی تیادا نییە "جیهانگیری" ناونیشانی هەرە دیاری ئەو وەرچەرخانانەیە كە ڕوودەدەن. هەر بۆیە، ئەم زاراوەیە كە جێی بایەخ وبەدحاڵیبونە، ڕیزی پێشەوەی لەو مشت و مڕە جیهانییانەدا داگیركردووە لە نێوان ئەوانەدا هەیە كە لە تێگەیشتنی دیاردەكە لە یەكتر جیاوازن، مەبەست لە بانگەشەكاران و ڕۆشنبیران یان زانایان و بیرمەندانە.

وەرچەرخانەكانیش زۆروزەوەندن بەئەندازەی ئەوەی كە بنەڕەتین، سەراپاگیرن بە ئەندازەی ئەوەی كە خێران. بەڵگەش ئەو قسانەیە كە لەسەر كۆتاییەكان كراوەو تا ئێستاش دەكرێت: كۆتایی مرۆڤ و مێژوو، یان كۆتایی ڕۆشنبیر و ئایدیۆلۆژیا، یان كۆتایی سیاسەت و جوگرافیا، ئەمە وێڕای ئەو باسكردنە زۆر و زەوەندەی كە لەسەر پۆست-ەكان (البَعدیات/ دوای-یەكان) هەیە: پۆست مۆدێرنیزم و پۆست پیشەسازی، یان پۆست زانست و فەلسەفە، یان پۆست دەوڵەت و دیموكراسی.

ئەم ووتەزایانە دەربارەی كۆتاییەكان و پۆست-ەكان، بە شێوەیەكی حەرفی و ساویلكانە ناخوێنرێنەوە وەك ئەوەی دابڕانگەلێكی یەكلاكەرەوەو جیاكەرەوە بن لە نێوان قۆناغەكانی بوون و نەبووندا، لەم ڕووەوە، ئێستا (الحاضر) خۆی، لە كۆتاییدا، ئەوەیە كە ڕابردوو هەنگاوی بۆ ناوە. هەروەها پاشەڕۆژ-یش ڕێك ئەوەیە كە دەشێت ئێستا هەنگاوی بۆ بنێت. بۆیە ئێمە لە ئاست دەستەواژەگەلێكین ڕاڤەكردنی ئەوەیە"

خودی ئەو جیهانەی کە هەیە چیدی ئەو جیهانە نییە کە هەبووە، چ لە ڕووی فەزاو زەمەنییەوە، یان لە ڕووی سیستم و ریتمەوە، یان لە ڕووی هێز و میکانیزمەکانییەوە، ئەمە سەرەڕای عەقڵانییەت و مرۆڤگەرییەکەی. لەم ڕووەوە بازدان و تەقینەوەکان، لە بیروباوەڕ و چەمکەکاندا، لەگەڵ تەقینەوە تەکنیکییەکان و وەرچەرخانە شارستانییەکاندا، هاوکار بوونەتەوە، بۆ ئەوەی نەخشەی پەیوەندییەکان لەگەڵ شتەکاندا تێکەڵ بەیەکتر بکەن و، بەمەش بوار، بۆ لەدایك بوونی چەشنێکی نوێ بۆ بوون و ژیان بەسەربردن، لە نێوان ئادەمیزاددا، بڕەخسێنن..

## بازدانە مەعریفییەکان

لەسەر ئاستی ئایدیاکان، مۆدێرنە، دەهەگەلێکە، کەوتۆتە بەر ڕەخنەیەك کە درێژ دەبێتەوە بۆ سەر ناونیشان و نەگۆڕە جیاوازەکانی، بە تایبەتیش بۆ سەر سێ کوچکە پەیوەستەکەی بە عەقڵ وئازادی و پێشکەوتنەوە، ئەمە بێجگە لە چەمکی مرۆڤ، کە لەژێر لێدانی ڕووداوە کت و پڕەکان و لەبەر ڕۆشنایی دۆزینەوە مەعریفییە ئابڕووبەرەکاندا، هاتۆتە هەژان. چونکە ئەوەی کە فەزای نوێ لە تەقینەوەکاندا، بە خۆوەی دیوە، ئیدی لە کایەکانی زانیندا بێت یان بوارەکانی پیادەکردن، بەدەستهاتووی ئەوەیە کە مۆدێرنەی، وەك نەگۆڕ و بەڵگەنەویست، پێ بونیاد نراوە یان ئەوەیە کە مۆدێرنە، وەك خواست و دروشم، هەوڵی بۆ داوە.

هەر بۆیە ئەو ڕەخنەیەی کە، بۆ گلانە فەزای پۆست مۆدێرنەوە، عەقڵانییەتی ڕەخنەیی لێوە تێدەپەڕێنین بە تەنها نایەوێت ڕیفۆرم بێت بۆ عەقڵ یان چاککردنەوە بێت بۆ پرۆژەی ڕۆشنگەری بەڵکو ئەیەوێت ڕەخنە بێت بۆ فکر، ڕەخنەیەك کەلەسەر هەڵوەشاندنەوەی ئەم پرۆژەیە ڕادەوەستێت (مەبەست لە پرۆژەی ڕۆشنگەرییە/ وەرگێڕ) ئەمەش بەمەستی ڕووتکردنەوەی مەبەستە تەڵەڕێژکراوەکانی بەپەیڕەوکردنە تاریك و میکانیزمە ناماقوڵەکانی. لەگەڵ ئەمەشدا ڕەخنەکردنی فکر پاشەکشەکردن نییە لە عەقڵ و دەسکەوتەکانی ڕۆشنگەری ئەوەندەی کرانەوەیە بەسەر دوورەوەخراو و ناماقوڵدا یان بەسەر گۆڕاو و نادیاردا، واتە کرانەوە بەسەر هەموو ئەوەی کە مۆدێرنە دووری خستۆتەوە لە فەزای خۆی و وای لە خۆیکردووە خۆی بەتاڵ بکاتەوە یان بگاتە تەڵەزگەی خۆی یان تەقینەوەکانی خۆی ببینێت.

بەم مانایە، ڕەخنەکردنی مۆدێرنە دەیەوێت بە شێوەیەکی بنەڕەتی سەرلەنوێ چاو بگێڕێتەوە بە مەسەلەی حەقیقەتدا، چاوگێڕانێك کە لەهەمان کاتدا بریتییە لە فۆرمۆلەکردنێك بۆ پەیوەندییەکی مۆدێرن لە نێوان فکر و واقعدا، پەیوەندییەك، ئەوەی کە بەتاڵ بۆتەوە لەو ووتەزایانەی کە جیهانی فکریی مۆدێرنە و تا ڕادەیەکی زۆریش دێرینەی لێ پێك دەهێنرا، تێ بپەڕێنێت، مەبەست لە ووتەزاکانی وەك نواندن و نوێنەرایەتی (التمثل و التمثیل)، یان نمونەو بە نمونەکردن (المثال و الامتثال)، یان چوونیەکی و وەکیەکی (المماثلة و المطابقة)، یان ڕاستبێژی و پێویستی (الصدق و الضرورة) یان دڵنیایی و سەلماندن (الیقین والثبوت)، یان پاڵاوتەکردن و خاوێنکردن (التصفیة و التنقیة) یان بەبنەڕەتکردن و دامەزراندن (التأصیل و التأسیس)، یان گەوهەری فکری و عەقڵی پەتی یان خودی

بــاڵاخواز (الــذات المتعالیــة) و بەڵگەنەویســتە بنەڕەتییەكانە.

تێپەڕانــدنیش بــە مانــای گواســتنەوەیە بــۆ ناوچــەیەكی فكریــی نــوێ كــە تیایــدا ڕەوایــەتی مــەعریفیی لــە ڕێگــەی تــۆڕێكی تــازە لــە ووتــەزاكان پەیڕەو بكەیت، وەك ووتەزای زانین (معرفة) و هێز، دەق و حەقیقــەت، پایــەكانی گوتــار و كردارەكــانی ئاخــاوتن (الكــلام)، ســتراتیژەكانی ڕاڤــەكردن و گێڕانەوەكارییــە عەقڵانییــەكان، بــیری ئاوێتــەیی و كــردەی پێكگەیشــتن، ئەمــە جگــە لــە چــەمكەكانی ڕێگەچارە و گرەوكردن، یان گەمە و سەرەڕۆیی، یان بڕین و تێپەڕاندن، یان هەژاندن و حەواڵەكردن، یان جیــــاوازی و جیاكــــاری، یــــان خــــەرجكردن و وەرچەرخاندن..

ئــــەم پێكهاتــــە چــــەمكییە نوێیانــــە لــــە چــەندین پێشــێلكردنی فكــری و، ســتراكتۆری و بەزێنــــەردا بەرجەســــتە دەبــــن كــــە لــــۆژیكی شــــوناس و چــــوونیەكی هەڵدەوەشــــێننەوە و چــــەمكەكانی نوانــــدن و نمونــــە یــــان بــــە نمونــەكردن لــەنێو دەبــەن، بــە هــەمان ئەنــدازە پەیوەندییــەكانی نێوان مانا و مەرجەعی مانا یان نێوان چەمك و واقعی چەمك یان نێوان نموونە و پراكتیككردنــەكانی، دەتەقێننــەوە، بــەم جــۆرەش وێنــەی ئــەو مرۆڤــە عاقڵــە یــان پێگەیشــتوو وكامڵــە دەشڵەژێنن كە بە نواندنەكانی دەست بەسەر واقعدا دەگرێــت یــان بــە ئایدیاڵــەكانی بەســەر حــەز و ئارەزووەكانیدا، سەرئەكەوێت. پاشەكشەكردنیشی (واتە پاشەكشەی مرۆڤ: و) لە بەردەم سیستمەكانی نیشــانە و پێكهاتــە گوتارییەكانــدا، یــان لەبــەردەم میكانیزمــەكانی ئــارەزوو و دەزگاكــانی دامــەزراودا، یــان لەبــەردەم وەهمــەكانی چــییەتی (الماهیــة) و درزەكانی شوناسدا، سەرباری نەخشەكانی ماتەر و گرگرتنەكانی ئەزموندا، تۆمار دەكەن.

### دەسەڵاتی نیشانە

سـەیریش نییـە ئەمـەی كـە دەیڵـێین، چـونكە ئـەزموونی مرۆیـی جیهـانێكی سـادەو پـاك و تـەنك نییـە و بـە كەرەسـتەكانی نوانـدن و دەستبەسـەردا گرتن یان سەقامگیربوون و باوەڕ ڕەهایش دركی پێ ناكرێـت، جیهـان جیهـانێكی بەرینـە لـە سـتراكتۆرە پەیوەندیدارەكان و پەیوەندییە تێكەڵ و ئاوێتـەكان. هـەر ئـەم جیهانـە بوارێكـە بـۆ كـرۆك و ناوەرۆكـەكان (طبیــات و ثنیــات)، یــان بــۆ جیــاوازی و نەبەرابەرییـەكان، یـان گـرژی و پێكدادانـەكان، یـان بـڕین و تێكشـكانەكان، یـان كـەلێن و بۆشـاییەكان، لەگەڵیاندا، بۆ مـرۆڤ مەحاڵـە یەكسان بێتـەوە لەگـەڵ خۆیـدا یـان تێكبێتـەوە لەگـەڵ مانـای خۆیـدا یـان خاوەنی ئارەزووەكـانی خـۆی بێـت و بەسـەر زمـان و شتەكانیدا زاڵ بێـت، چونكە لـە بنەڕەتـدا وەكیـەكی (التطابق) لە نێوان تێڕوانین و فرێزدا (العبارة) یان لـە نێـوان چییەتی و واقعـدا یـان لـە نێـوان ووتـن و ئـارەزوودا یـان نێـوان مەبەسـت و ئـەوەی دروسـتی دەكەی، لە توانادا نییە. بەم شێوەیەش ناتوانرێت دابــڕان، لــە ســاختەیی فرێــز و ڕووپۆشــیی تێڕوانین بكرێت.

هـەر ئەوەشـە بەرهـەمی دان نـان بـە كاریگـەریی زمانــدا لــە بــواری ئــەوەی كــە بــەدیهاتوون لــە دۆزینـەوەكانی پۆسـت مۆدێرنیزمـدا: زمـان چـیتر بریتــی نییــە لــە ئاوێنەیــەك یــان پۆشــاكێك یــان ووتەبێــژێكی حـاڵ، بـەڵكو وای لێهـاتووە خـاوەنی خۆپارێزیی خۆیەتی كە لە دەسەڵاتی نیشانەكان و یارییەكانی دەقدا، بەرجەستە دەبێت. داننانیش بە دەسـەڵاتی نیشـانەدا بـە مانـای ئەوەیـە: ئـەوەی كـە

دەیڵێین زۆر یان كەم جیاوازە لەو مانایەی دەمانەوێت یان ئەوەی مەبەستمانە. بە دەستەواژەیەكی تر، مانای ئەوەیە ئێمە هۆشیارنین، ئەوەمان بەردەوام مەبەست نییە كە دەیڵێین، یان ئەوە بەبەردەوامی ناڵێین كە مەبەستمانە. مانای ماناش ئەوەیە، ئێمە كەمتر عاقڵین و پێگەیشتووین لەوەی كە حسابمان بۆ كردووە" كەمتر توانای دەسگرتن و ڕاگرتنی ئەو شتانەمان هەیە كە بە وەهم ڕامانگرتون و دەستمان بەسەرداگرتون.

## وەهمی نواندن

بۆیە ئەوەی لە توانادا هەیە لە فكر و كردار، نوێكردنەوەو گۆڕانە، یان خوڵقاندن و جۆراو جۆرێتییە لە ڕێگەی ئیشكردن لەسەر پێدراو و كەرەستەكان، یان لەسەر ئارەزووەكان و قەناعەتەكان، بە شێوەیەك درێژبێتەوە بۆ سەر نموونەكانی بیركردنەوەو سیستمەكانی گوتار، یان جۆرەكانی دەسەڵات و سیستمەكانی پێكگەیشتن، یان شێوازەكانی ئاگایی و بایەخدان بە ڕەوشی خۆ. كارێك كە دەبێتە هۆی گۆڕانی چەمكی حەقیقەت و پەیوەندی لە نێوان فكر و واقعدا بە هەمان ئەندازە كە دەبێتە هۆی گۆڕانی چەمكەكانی عەقڵ و عەقلانییەت و عاقڵێتی و وێنەی مرۆڤی عاقڵ.

یەكەم: مانای عەقڵ دەگۆڕێت، لەم ڕووەوە چیتر عەقڵ، وەك گەوهەرێكی میتایی (ما ورائي) یان سروشتی، تێناگەیشترێت كە وێكبچین (نتماثل) لەگەڵیدا یان پابەندبین بە سیستمەكەی، بەڵكو، وەك سیستمێك بۆ گەیاندن و جیاكردنەوە، تێدەگەیشترێت، سیستمێك كە پایەكانی بە گوێرەی بواری واقیعەكان و چەقی ئەزموونەكان یان بەكاریگەرییەكی كولتوری دەگۆڕێت، كاریگەرییەك خۆی لە توانای بونیادنانی ڕەوتەكان و نموونە مەعریفی و كردارییەكاندا بەرجەستە دەكات و لە گۆڕینیشیان، ئەمەش بە دۆزینەوەی ئەو ڕووانە لە كەم و كورتیی و هەڕەمەكێتی یان داپۆشین و داخران، كە تیایاندا هەیە.

دووەم: چەمكی عەقلانیەتەكانیش گۆڕانیان بەسەردا دێت، بەجۆرێك، وەك وەكیەكی یان چونیەكی لەگەڵ بابەتەكان و خودەكاندا، لێیان تێناگەین، وەها لێیان تێناگەین كە پرەنسیپە پێشینیەكان (المبادیء قبلیة) بەرجەستە دەكەن یان چوارچێوە تیۆرییەكان پراكتیزەدەكەن، بەڵكو وەها لێیان تێدەگەین بەوەی جۆرێكن لە نزیكبوونەوە یان سەوداكردن و چارەسەركردن كە واقع بەرهەم دەهێننەوە بە هەمان ئەندازە واقعی خۆیان دەخولقێنن و سیستمی خۆیان دادەمەزرێنن، ئەمەش لە ڕێگەی داڕشتنەكانی گوتار و مەرجەعەكانی مانا یان لە ڕێگەی دامەزراوەكانی زانین (المعرفة) و تەكنیكەكانی زانیاری یان لە ڕێگەی تۆڕەكانی دەستاودەست كردن و كەناڵەكانی بڵاوكردنەوە.

سێیەم: وێنەكانی مرۆڤی عاقڵیش گۆڕانیان بەسەردا دێت، لەم ڕووەوە عاقڵێتی چیتر وەك خۆدامالین لە حەزەكان یان وەك پاكتاوكردنی ناماقوڵییەكان لێی تێناگەین، بەڵكو وەك ژمارەیەك ڕێگەچارە كە مرۆڤ لەگەڵ خودی خۆیدا دایدەمەزرێنێت، ئەمەش بە گێڕانەوەی مەیل و قەناعەتەكانی بەشێوەیەكی عەقلانی یان خەیاڵ لێكردن و گوزارشت لێكردنیان بەشێوەیەكی ستاتیكی یان دەرهێنانیان دەرهێنانێكی ئاڵوگۆڕكەرانەو پێكگەیشتنانە.

هەموو ئەمانەش چەمکی حەقیقەت دەگۆڕن، لەم ڕووەوە زانین چیتر تەنها وێناکردنیان هەواڵێك نییە دەربارەی واقع، بەڵکو پەیوەندیەکە بە حەقیقەتەوە، پەیوەندیەکی بەرهەمهێن و کاریگەر، واتە کردەی دامەزراندن و داهێنانە، یان دروستکردن و بەرهەمهێنان. ئەم کردەیە بریتییە لە وەرچەرخانێکی ڕوو سێگۆشەیی، وەرچەرخانێك درێژدەبێتەوە بۆ سەر بابەتی زانین و خود و زانراو هەروەها بە تایبەتی درێژدەبێتەوە بۆ سەر کەرەستەکانی زانین.

بەم شێوەیە خودی پیادەکردنی کاری فکریش گۆڕانی بەسەردا دێت، لەم ڕووەوە چیتر فکر یەکبوون نییە لەگەڵ واقعێکی ئەزموونی یان گەڕان نییە بەدوای بنەمایەکی واقعی، هەروەها چیتر بەرجەستەکردنێك نییە بۆ پرەنسیپی لەپێشینە یان بۆ نموونەیەکی بنەڕەتی، بەڵکو فکر گرەوی مرۆڤە لەسەر ئەوەی لە بیر و باوەڕ و هەڵسوکەوتەکانیدا گۆڕانی بەسەردا بێت، بەشێوەیەك ئەو گۆڕانە ئەوەی بۆ بڕەخسێنێت کە لە دیاردەکان و ئەوەی ڕوودەدات، تێبگات، یان ئابڕووچوونەکان و پارادۆکسەکان بدۆزێتەوە، یان کێشەکان و قەیرانەکان دەست نیشان بکات، یان لەو تەڵەزگانە دەربچێت کە مرۆڤ خۆی بە خودی خۆی دەیانهێتە کایەوە.

بەم جۆرە گواستنەوە لە مۆدێرنەوە بۆ دوای مۆدێرنە ڕەوتێکی عەقڵیی نوێیە، ڕەوتێك درزگەلێکی خستۆتە ستراکتۆری بوونەوەرەوە و بە هۆیەوە لە جیهانی ماناوە دەگوازینەوە بۆ سیستمی نیشانەکان، لە فەلسەفەی شوناس و دووبارەبوونەوەشەوە بۆ فەلسەفەی جیاوازیی خوڵقێنەر، لە لۆژیکی هاوشوناسی و بنەڕەتیگەراییەوە بۆ لۆژیکی وەرچەرخان و بەرهەمهێنان.

### فێڵی نوێنەرایەتیکردن

لێدانی چەمکی نواندن لە ڕووی مەعریفیەوە، چەمکی نوێنەرایەتیکردن-یش، لە ڕووی سیاسییەوە و چەمکی ئایدیاڵ لە ڕووی ئاکارییەوە دەهەژێنێت. ، چونکە ئەگەر نواندن وەهمێکی مەعریفی بووبێت، ئەوە نوێنەرایەتیکردن فێلێکی سیاسییە، هەروەها ئایدیاڵیش خەیاڵاتێکی ئاکارگەراییە. لێرەوە، گۆڕانی چەمکی حەقیقەت لە هەمان کاتدا، بە مانای گۆڕانە لە چەمکی ئازادی و دادپەروەریدا، گۆڕانێك کە بە هۆیەوە دیموکراسیەتی نوێنەرایەتیکردن تێپەڕ دەکەین ئەوەندەی ئەوەی کە ئاکاری ئایدیاڵخوازی و پێشەنگیی، تێدەپەڕێنین. واتە ئەگەر ڕەوایەتیی مەعریفی (المشروعیة المعرفیة) تەنها زانینی حەقیقەت نەبێت، بەڵکو بەشداریکردن بێت لە دروستکردنیدا لە ڕێگەی خوڵقاندنی واقیعەتە مەعریفیەکانەوە، ئەوە ڕەوایەتیی سیاسی پەیوەندیدار بە پەیڕەوکردنی ئازادیەوە، لە میانەی پرەنسیپی نوێنەرایەتیکردنی دیموکراسیانەوە، بەدی نایەت، بەڵکو بەوە بەدی دێت هەریەکەو بتوانێ دەسەڵاتی خۆی پێك بهێنێت وکاریگەرێتیی خۆی لە سەر شانۆی بوون-ی خۆی بنوێنێت. بە هەمان شێوە ڕەوایەتیی ئاکارگەرایی (المشروعیة الخلقیة) بەوە بەدی نایەت تاکێك یان گروپێك، بە ناوی بەهایەکی باڵاوە، ڕێنوێنیکاری بەسەر خەڵك و مافەکانیانەوە بکات، بەڵکو بەوە بەدی دێت هەریەکەو بەرپرسیارێتی لەبەرامبەر خودی خۆی هەڵبگرێت و بۆ سەربەخۆیی خۆی پەرۆش بێت، بە جۆرێك لە ڕێگەی بەشداریکردن لە چارەکردنی

كێشـــەكانی و دابڕینـــی (خلـــع) مانایـــەك بەســـەر تاقیكردنـــــەوە ژیانییـــــەكانی و شـــــارەزاییە بوونیەكانییـــــەوە (خبراتـــــە الوجودیـــــة) خـــــۆی دروست بكات. ئەوەیە ڕووەكانی وەرچەرخانەكان و ئـــــەو توانســـــتانەی، كـــــە دۆزینـــــەوەكانی پۆســـت مـــۆدێرنیزم، لـــە بـــواری فكـــر و زانینـــدا، دەبێتە هۆی كەوتنەوەیان. ئەمە شەپۆلێكی نوێیە لە شەپۆلەكانی مۆدێرنە، شەپۆلێك دەچێتە پێشەوە ئەوەنـدەی ئـەوەی كـە لەگـەڵ شـەپۆلێكی تـردا بەیەكدادەچـێت كـە دیـاردەی جیهانگیرییـە بـە تەكنیك و ئامێرەكانییەوە.

## بۆمبی میدیایی

لـە بـواری تەكنیكـدا، چـەندین وەرچـەرخانی بەلێشاو و خێرا هەن كە لەسەر ئاستی گەردوونی بەڕێوەدەچـــن، ئەمـــەش بـــەهۆی شۆڕشـــی پەیوەندییـــەكان و تەقینـــەوەی زانیارییەكانـــەوە، هـەروەك لـە ژمێركارییـەكان (حواسـیب) و تـۆڕە ئەلكترۆنییـەكان و سیسـتمە ژمارەییـەكان و شـتی تـری لـە بابـەت تەكنیكـە باڵاكـان و ئـەو میـانگیرە ئاوێتانـەدا بەرجەسـتە دەبـن كـە گواسـتنەوەی پێـدراوەكان و نیشـانەكان یـان بـەڕێوەبردنی كارەكـــان و داراییـــەكان، لـــە دووری دوورەوە دەڕەخسـێنن و بەوپـەڕی خێرایـی، خێراییـەك كـە خێرایی تیشكە، بەڵكو، وەك یەكێك لە ئەستێرەكانی جیهانی بەجیهانیكراو "بیل گیتس" گوزراشتی لێ دەكات، خێرایی فكرە.

ئەمەیە كە جیهانگیری، بە كردەوە و بە هێزە بڕێنەرەكانی خۆی، دەیرەخسێنێت، ئەو هێزانەمان مەبەستە كە چوارچێوەكانی ئاگایی و دركمەندیی دەگـۆڕن ئەوەنـدەی ئـەوەی كـە پەیوەنـدیی نێـوان زەمـــەن و شـــوێن دەتەقێننـــەوەو بەمـــەش توانسـتەگەلێكی بـێ پێشـینە ئـاوەڵا دەكـەن بـۆ گشتاندنی ئاڵوگۆڕەكان لەسەر ئاستی ئەستێرەیی (علـى المسـتوى الكوكبي) ئیدی لـە پەخشـكردنی وێنـــەو نامەكانـــەوە بێـــت یـــان گواســـتنەوەی ژمارەو سیمبولەكانەوە یان جوڵاندنی كەسەكان و ئیش و كارەكان.

بـەم شـێوەیەش ئێمـە لـە ئاسـت شۆڕشـێكی دووسـەرەی میـدیایی و ژمارەیـداین، ئـەم شۆڕشـە پەیوەندی لەگەڵ واقعدا دەگۆڕێت و مەرجەكان بۆ پێكهێنـانی كۆمەڵگایـەكی نـوێ دەخوڵقێنێـت، كۆمەڵگایەك كە، لەگەڵیدا، جیهانی پیشەسازی بۆ دوای پیشەسـازی، تێپەڕدەكـەین. لـە كۆمـەڵگای پیشەسـازیی سـوونەتی و مۆدێرنـەی كلاسـیكیدا، مامەڵەكردن لەگەڵ واقعدا، لە ڕێگەی بەرهـەمهێنراوە ماتەرییـەكان و زەخیرەگەلـە قورسـەكان و ئـامرازە ئامێرییـەكانی گواسـتنەوەی وەك شـەمەندەفەر و فرۆكـەوە، بەڕێوەدەچـوو. جیهـانیش لـە ڕێگـەی كتێـب و ڕۆژنامـەوە یـان لـە ڕێگـەی بیروبـاوەڕ و ئایـدیۆلۆژیاوە و شـتی تـری لـە بابـەت دەقـە چاپكراوەكان و بەرهـەمهێنراوە ڕەمزیـەكانی كۆمەڵە ڕۆشنبیریەكانەوە، دروست دەكرا.

لەگەڵ چوونە ناو كۆمەڵگای میدیایی و بواری تەلەفزیۆنیـەوە، مامەڵـەكردن لەگـەڵ واقعـدا، لـە میانـەی بەرهـەمهێنراوە ئەلكترۆنییـە ئاسمـانی و نیمچـە ماتەریەكانـەوە بەڕێوەدەچێت، لـەو وێنـە و سـیمبول و ژمـارەو نیشـانانەی كـە لەڕێگـەی ڕێگـە خێراو زۆر و زەوەندەكانی میدیاوە، هەڵدەڕژێن، بە شێوەیەك كـە لەگەڵیدا سنووری نێوان دەوڵـەتان و كۆمەڵگاكان دادەخورێت و، پەرژینە عەقیدەگەرایی و زمانەوانیـەكان، كـە شوناسـە كولتوریـەكان و تایبەتمەندێتیە نەتـەوەیی یان ئاینیـەكان خۆیانیان تیانـــدا دامەزرانـــدووە، درز دەبـــەن. ئەوانـــە

تێکستگەلێکی کۆکەرەوەن، کردەبڵند و ئاوێتەن، زەوی ڕادەماڵن و بە خێراییش فەزای سەبرانی دەبڕن، بەمەش پاشەکشەی شتی خوێنراوی سەرکاغەز (المقرؤ علی الورق) لە بەردەم بینراوی سەر شاشەدا و زاڵبوونی کۆمەڵگای وێنەو دیمەن بەسەر کۆمەڵگای بیر و باوەڕ و ئایدیۆلۆژیادا و چوونی واقعی دەستکردی سیستمە ژمارەیەکان و نیشانە تیشکیەکان بۆ شوێنی واقعی کردارییانەی بوونەوەرە مرۆییەکان و زمانە سروشتییەکان، ڕادەگەیەنن.

بێگومان ئەمە بە مانای ئەوە نییە کە شۆڕشی زانیاری پیشەسازی ناهێڵێت ئەوەندەی بە مانای ئەوەیە بەرهەمهێنانی کەرەستە ماتەریەکان یان سیمبولییەکان، وای لێهاتووە، لەسەر بەکارهێنانی ژمێرەرە ئەلکترۆنیەکان دەوەستێت.. لێرە بە دوا چیدی ناتوانرێت کالاّ و تێکست یان کەل و پەل و بیر و باوەڕ یان خزمەتگوزاریەکان و دەسەلاّتەکان، بەبێ بەرهەمهێنانی زانیاری و بەڕێوەبردنی یان خوێندنەوەی لەسەر شاشە، بەرهەم بهێنرێن.

بەم شێوەیە بەڕێوەبردنی شتەکان و ئیش و کارەکان و ئادەمیزاد، وای لێهاتووە بەندە بە بەڕێوەبردنی زانیاری و ئیشکردن بە ژمارەکان ئەوەندەی کە سەوداکردن لەگەڵ واقعی کردەیی کۆتاردا وای لێهاتووە مەرجبەندە بە واقعی دەستکردەیی (الواقع الاصطناعي)، واقعێك کە لەگەڵ خەیاڵ لێکردنی دیمەنیی و پێکهاتنی ژمارەیی ناکۆتاداردا، تواناگەلێکی زۆر و زەوەند بۆ کردن و کارتێکردن، دەخاتەوە..

بەو جۆرە، پەیوەندی لەگەڵ حەقیقەتدا هەڵدەگەڕێتەوە، چونکە لە دوای شۆڕشی زانیارییەوە چیدی مەسەلەکە مەسەلەی واقعێك نییە کە چارەسەرکردنەکەی بەوە بێت سەر لە نوێ و لە ڕێگەی وەرچەرخاندنی بە کالاّ و کەرەستە یان تێکست و بیرۆکە، بەرهەم بهێنرێتەوە، بەڵکو مەسەلەی واقعێکە، سەوداکردن لەگەڵیدا، بەوە دەبێت واقعێکی دی بخوڵقێنیت، واقعێکی ناواقعی کە، بە زمانی بۆدریار، واقعێکی کردەبڵندە (واقع فائق) لێرەوە بەڕێ خستنی جیهان، لە ڕێگەی ئەو نیشانە تیشکی و دەسکەوتە ناماتەریانەوە، بەڕێوەدەچێت کە فەزای سەبرانیان لێوە پێك دێت.

بەم شێوەیەش ئێمە ئێستا لە نێوان سێ جیهاندا دەژین، یەکەمیان جیهانی ئایدیاکانە، دووەمیان جیهانی فیزیکییە ڕێك وەك ئەوەی کە (کارل پۆپەر) دەیووت، بەلاّم جیهانی سێیەم، بەپێی پۆلێنی پۆپەر، جیهانی ئەزموونە خودیەکان نییە، بەڵکو جیهانی ڤێرتوێلی-یە (واتە کۆناوی جیهانی بەرهەمهێنراوە ئەلکترۆنیەکان: و) یان جیهانی گریمانەکراوە کە تەکنیکەکانی پەیوەندی دەیخوڵقێنێت، ئەو شتەی کە دەمانخاتە بەردەم پۆلێنکردنێکی جیاکارەوە بۆ جیهانەکان، پۆلێنکردنێك، لەگەڵیدا، سیاسەتی هەقیقەت و بەڕێوەبردنی واقع گۆڕانی بەسەردا دێت.. لەم ڕووەوە، لە ئەفلاّتۆنەوە تا هیگڵ، زانینی هەقیقەت، پێکهاتنەوە بوو لەگەڵ ئەوەی کە واقعیە، جیهانی هەمەکییەکانیش (الکلیات) وەك ئیدیاڵە ئەبستراکتەکان و ئایدیا ڕەهاکان، جیهانی ڕاستەقینە بوو، واتا ئەو دادوەر بوو بەسەر ئەم جیهانەو ڕێکخەری بوو. هەرچی ئێستایە، ئەوە دادوەر و ڕێکخەر، جیهانی تارماییە تیشکیەکانە کە لە بەرهەم هێنراوە ئەلکترۆنیە نابەرجەستەکاندا، خۆی دەنوێنێت. ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێت کە هەقیقەت ئەوە نییە کە دەیزانین بەڵکو ئەوەیە کە لە ڕووداوەکان دەیخوڵقێنین یان ئەوەی کە لە

جیهانەکان دروستی دەکەین. جیهانی دەستکردیش کە ئێستا واقعی پێ بەڕێوەدەبرێت و لەوپەڕی ناسکیدایە، واقعیترە لە واقع ئەوەندەی ئەوەی وای لێهاتووە هەڵیدەسوڕێنێ و شوێنی گرتۆتەوە. ئائەمەشە پارادۆکسەکە: چیتر تارماییەکان سێبەری حەقیقەت نین، بەڵکو ئەوەن کە بە هۆیانەوە حەقیقەت دروست دەکەین.

بەم جۆرەش تەقینەوەگەلێکی تەکنیکی هەیە کە پەیوەندیی مرۆڤ بە واقعەوە دەگۆڕن بە هەمان شێوە پەیوەندیی نێوان عەقڵ و کەرەستەکانی یان نێوان فکر و میانگیرەکانی، دەتەقێننەوە. بەو شێوەیەش پاشەکشەی مرۆڤ، وەك گەوهەرێکی فکریی تەنك یان وەك منێکی ترانسدستاڵ (متعال)، لەبەردەم دروستکراوەکانی خۆیدا لە بابەت ژمێرەرەکان و تۆڕەکان، تۆمار دەکەن.

ئەوەیە کاریگەرییەکانی بۆمبی میدیایی هەروەك "پۆل ڤیرلیۆ" ناو لە شۆڕشی زانیاری دەنێت، شۆڕشێك کە ڕووی ژیان لەسەر زەوی وەردەگۆڕێت: ئەم شۆڕشە لە دایکبوونی مرۆڤی ژمارەیی ڕادەگەیەنێت ئەوەندەی کە دوو واقع دەخوڵقێنێت، فۆرمی بیرکردنەوە و شێوازی ئیشکردن، دەگۆڕن، واتە پەیوەندی بە حەقیقەت و ڕایەڵە کۆمەڵگەییەکانەوە.

## دەسەڵاتی زانیاری

مانای شۆڕشی میدیایی، یەکەم، ئەوەیە: بەر بە جیاوازیی نێوان مرۆڤ و ئامێر بگرێت وا لە مێشکە ئەلکترۆنییەکان بکرێت کێبەرکێ لەگەڵ خەڵکدا بکەن و لە زۆر چالاکیی عەقڵییاندا، جێگایان بگرنەوە، کارێك کە زۆر لە خەڵکانی خاوەن زانست و زانین بۆ ئەوە دەبات لەسەر ڕێچکەی ژماردنی ئامێرییانە، لە چالاکیی فکر و دیاردەی هۆشیاری تێبگەن.

لەلایەنی دووەمەوە، بە مانای ئەوەیە بەر بە نابەرامبەریی نێوان کاری فکری و کاری دەستی، بگرێت، بەمەش بەشداری بکات لە خوڵقاندنی مەرجەکاندا بۆ دەرکەوتنی میانگیرێکی شارستانی و بکەرێکی کۆمەڵگەیی نوێ کە بەرجەستەکەری ئەوانەن کە ئەلف و بێی ژمارەیی و خوێندنەوەی ئەلکترۆنی لە کارەکانیاندا بەکار دەهێنن، ئیتر لە کایەکانی بەرهەمهێنانی ماتەریدا بێت یان کولتووری.. بەم شێوەیە چیدی چالاکییەکانی پەیوەست بە بەرهەمهێنانی زانیاری و خەزن کردنی یان بەڕێوەبردن و بەرهەمهێنانی، خەسڵەتێك نییە ئیشکەرانی لقە مەعریفییەکان، جیاواز لە خەڵکی دی، پێی دەرکەون، بەڵکو بوارێکی فەراهەم کراوە بۆ هەموو بکەرە کۆمەڵایەتییەکان ئیتر پەیوەندییان بە هەر کایەیەکەوە هەبێت، بگرە ئەمڕۆ ئەو نووسەر و توێژەرەی کە قەڵەم و پەڕە بە کاردەهێنێت، بە بەراوورد لەگەڵ ئەوانەی ئەلف و بێی ژمارەیی بەکاردەهێنن و لە خەرجگەکان و کۆمپانیاکانا ئیش لە بەڕێوەبردنی زانیارییەکاندا دەکەن، بە نەخوێندەوار لە قەڵەم دەدرێت. ئەوە عەقڵی دەستەبژێرییانەیە کە لە بەردەم عەقڵی میدیایی پیاوەکانی میدیاو ئیشکەرانی سەر تۆڕەکان، پاشەکشە دەکات..

ئەم گۆڕانکارییانە کە فرە ڕوو و فرە دیون، ئیشکردن لە بواری زانینی زانستیدا دەگۆڕن بە هەمان شێوە پاشەکشەی عەقڵی ئەکادیمیی نوێ، لەبەردەم عەقڵی بە ژمێرەرکراو و بە جیهانیکراودا، تۆمار دەکات. زانین، وەك لە زانکۆکان و مەڵبەندەکانی توێژینەوە

پـــەیڕەو دەكـــرا، پشـــتی بـــە چـــاوپیاگێڕان و تێخوێندنـــــەوە یـــــان بـــــە میكانیزمـــــەكانی پێوانــەكردن و جۆرەكــانی ســەلماندن و بەڵگانــدن دەبەست، لەگەڵ شۆڕشی میدیاییدا توانایەكی نوێ والا دەبێت. ئـەم شۆڕشـە بەرهـەم هێنـانی زانین بە ئامرازگـــەلێكی نـــوێ فەراهـــەم دەكـــات كـــە لەســـەر بەرچاوخســـتنی ژمـــارەیی و پێكهێنـــانی گریمانەیی، ڕادەوەستێت.

ئەگـــەر شۆڕشـــی پۆســـت مۆدێرنـــەش بـــەو دەســـەڵاتەی كـــە بـــە نیشـــانەكانی داوە، چـــەمكی نوانـدنی مـەعریفیی تەقاندبێتـەوە بـەو جـۆرەی كـە زانین وا لێ بكـات وێنـاكردن نـەبێت بـۆ واقـع بـەڵكو دروســـتكردن بێـــت بـــۆی لـــە ڕێگـــەی ئـــەوەی كـــە دەویسترێت بزانرێت، ئەوە شۆڕشی میـدیاییش بـەو دەســـەڵاتەی كـــە بـــە تـــەكنیكی زانیارییـــەكانی دەدات، تـەكنیكی چوونیەكیكردن تێپـەردەكات بـەو جۆرەی كە وەها لە زانین دەكات تەنها بریتی نەبێت لــە دروســتكردنێكی واقــع، بــەڵكو دروســتكردنی واقعێكـی نـوێش بێـت لـە ڕێگـەی پرۆسـەكانی بـە ژمێرەركـــردن و بـــە نیشـــانەكردنەوە یـــان بـــە ژمارەكردنەوە (الرَقمَنة)..

ئەمــە حــاڵی چــەمكی نوێنەرایەتیكردنیشــە " ئەگـەر شـەپۆلی مۆدێرنـە بـە تەقاندنـەوەی چـەمكی نوێنەرایـەتیی سیاسـی، گـورزێكی لـە دیموكراسـیی نوێنەرایـــەتیكردن وەشـــاندبێت، ئـــەوە بـــۆمبی میدیایی، لای خۆیەوە، بە تەقاندنەوەی پەیوەندیی نێـــوان هـــاووڵاتی و نوێنەرەكـــەی، گـــورز لـــەو دیموكراسـییەتە دەوەشـێنێت، چـونكە عـەقڵی میدیایی بۆ مرۆڤی ژمارەیی، كەم و كورتیی گەمەی دیموكراسی ئاشكرا دەكات بە هەمان شێوە بوارێك دەكاتـەوە بـۆ سیاسـەتێكی نـوێ، سیاسـەتێك ئـەو هاووڵاتییـە تێپـەڕ دەكـات كـە تـەنها بینـەرە یـان دەنگدەرە یان خوێنەرێكی بەئاگایە. گرەوەكە ئێستا ئـــەوە نییـــە هـــاووڵاتی، لەســـەر بنـــەمای ئـــەو زانیارییانـەی كـە پێشكەشـی دەكرێـت، نوێنـەری خۆی هەڵبژێرێت، بەڵكو گرەوەكە بەشداریكردنە لە بەرهـــەم هێنـــانی زانیـــاری و بـــەكارهێنانی میانگیرەكانـدا، ئـەوەیش كـە لـە دیمـەنی میدیاییـدا ئامادەبوونی نییە، ئەوە بۆی هەیە چەواشە بكرێت یان پەراوێز بخرێت مادامێ هەقیقەت وای لێهاتووە بـە هـۆی میانگیرەكـان و وێنـەكان و ژمارەكانـەوە، دروست دەكرێت.

## شۆكی ڕۆشنبیران

ئـەم تەقینـەوە تەكنیكییانـە، ئێسـتا كـارو كردەیی خۆیان بەوە دەسەلمێنن كە شۆك و لەرز لە عەقڵییەتـــەكان و ســـتراكتۆرە مـــۆدێرن یـــان كۆنـــەكانی لای ئـــەو دەســـتەبژێرە ڕۆشـــنبیرانە دروسـت دەكـەن كـە پاسـەوانی شوناسـن و هـەموو ئەوانـەش كـە دیاردەكـانی بـە جیهـانیكردن و بـە ژمێرەركـردن و بە نیشـانەكردن، لـە ناكـاوە بۆیـان، وەك چۆن پێشتر شەپۆلەكانی پۆست مۆدێرنەش، لە بـــواری هونـــەر و وێـــژەو فكـــردا، ناكـــاوی كـــردن (فاجـأتهم). لــەو ناكاوبوونەشــدا، مۆدێرنـــەكان و كەلەپووریيـەكان، بنـەڕەتخوازەكان (الأصـوليون)و عەلمانییـــــەكان، لـــــە ڕۆژئـــــاوا و هـــــەروا لـــــە ڕۆژهەڵاتیش، یەكسانن.

ئەمەیـە كـە ئـەو مشـت و مڕانـەمان بـۆ لێـك دەداتـــەوە كـــە لـــە شەســـتەكانەوە تونـــد دەبـــن و بـــەردەوامن لـــە نێـــوان لایـــەنگرانی مۆدێرنـــە و ڕەخنەگرانیـدا دەربـارەی سـەڵاحییەتی پـرۆژەی ڕۆشـــنگەری یـــان دەربـــارەی كۆتـــایی مێـــژوو و ئـاینزای مرۆیـی یـان دەربـارەی ڕاسـتگۆییەتیی ڕۆشـنبیر و كـەڵكی پـرۆژە ئایدیۆلۆژییـەكان یـان

دەربـــارەی عـــەقڵ و ڕاســـتبێژی و هەقیقـــەت و پەیوەنـــدیی ئەمانـــە بـــە سیســـتمەکانی گوتـــار و بنەماکانی گێڕانەوە و گەمـەی دەقەوە" هـەروەك ئـەو مشـت و مڕانـەی کـە لـە نێـوان ریمـۆن ئـارۆن و جـان پـۆل سـارتەردا، یـان لـە نێـوان سـارتەر و میشـێل فۆکـۆدا، یـان لـە نێـوان فۆکـۆ و یـۆرگن هابرمـاس و چۆمسکیدا ڕوویاندا، یان وەك ئەوەی کە ئەمڕۆ لە نێـوان فرانسـوا لیوتـار و جـان بۆدریـار و ریتشـارد رۆرتـی لەلایـەك و هابرمـاس و تـیری ئـەنگلتۆن و کریستۆڤەر نۆریس لەلایەکی تر، بەڕێوەدەچێت.

هەر ئەمەشە کە ئـەو مشـت و مڕانـەمان بـۆ لێـك دەداتـــەوە کـــە لەگـــەڵ کۆتـــایی ئـــەم ســـەدەیەدا دەتەقنـەوەو بـەردەوامن دەربـارەی کۆتـایی مێـژوو و ئایـــدیۆلۆژیا، یـــان دەربـــارەی لیبراڵیزمـــی نـــوێ و سیســـتمی جیهـــانی، یـــان دەربـــارەی دەوڵـــەت و کۆمپانیـــا زەبەلاحـــەکان، یـــان دەربـــارەی ڕێگـــەی ناوەڕاست و نموونەکانی پەرەپێدان، یان دەربـارەی زیرەکیـــی ئـــادەمیزاد و مێشـــکی ئـــامێری و بـــە تایبەتیش دەربارەی کاریگەرییـەکانی جیهـانگیری و شۆڕشـی زانیـاری لەسـەر شوناسـە کولتورییـەکان و بەها ئاکارییـەکان، وەك ئـەو مشـت و مڕە گەرمانـەی کە لە نێوان هـەردوو بلـۆکی دژ یـان پشـتگیریکەری جیهـــانگیری و سیســـتمی نـــوێی گەردوونیـــدا بەڕێوەدەچێت هـەروەك ئـەوەی کـە ڕۆشـنبیرانی وەك چۆمسکی و پیاربۆردیۆ[1] و سـەمیر ئـەمین و بنیـامین باربـەر و جـۆن سـیرل و سـادق جـەلال و ئەلعـەزم و محەمەد عابد ئـەلجابری لەلایـەك و، ئـەلفین تۆفلـەر و ئـــەنتۆنی گیـــدنز و فرانســـیس فۆکۆیامـــا و تۆمـاس فرێـدمان و رای کورزوێـل، لەلایـەکی تـر، تێوەی دەگلێن.

بـــەم شـــێوەیەش، بازدانـــە مەعریفیـــەکان و تەقینـەوە تەکنیکییـەکان، سـەربارى ئـەو داڕمانـە سیاســی و ئایدیۆلۆژییانــەی کــە لەگــەڵ کــەوتنی یـــەکێتیی شـــوورەوی و هەڵوەشـــانەوەی بلـــۆکی سۆشیالیزمدا، ڕوویاندا، دۆخێکی نوێیـان خوڵقانـد کـە لەگەڵیـدا دیمـەنی گـەردوونی گـۆڕانی بەسـەردا هات. ئەو دۆخە نوێیە گۆڕانکارییـەکی لـە نەخشـەی شتەکان و دەروویەکی بۆ جموجوڵی کۆمەڵگاکان و وەرچەرخانێکی لە چارەنووسی شوناسەکاندا، کرد، ئەوەنـدەی ئـەوەی کـە گۆڕانکـاریی لـە بـەهاکان و چەمکەکان و عەقڵییەتەکاندا یان لە دامەزراوەکان و دەســەڵاتەکان و ڕەوایەتیەکانــدا، خســتەوە، بــە جۆرێــك کــە، لەگەڵیــدا، جوگرافیــای عــەقڵ و پەیوەندیــەکانی هێــز، سیســتمەکانی مەعریفــەو سەرچــاوەکانی ســامان، سیســتماتیزەکراوەکانی بەیەکگەیشــتن و شــێوازەکانی ژیــان، گۆڕانیــان بەسەردا هات.

ئەمــە حــاڵی ڕووداوە گــەورەکان و بازدانــە شارســـتانیەکانە" ئـــەم ڕووداو و بازدانانـــە، بـــەو کودەتـاو وەرچـەرخانانەی کـە دەیخەنـەوە و بـەو هێزگـەل و تەوژمگەلـەش کـە هەیانـە و بـەو ئاسـۆ و بوارانەش کە واڵایـان دەکـەن، حەقیقەتگـەلێکی نـوێ دەخوڵقێنن کە پێویستییان بە فۆرمگـەل و ڕێگەگـەل و شێوازگەلێکی نوێ و گۆڕاو هەیـە بـۆ بیرکردنـەوەو خەملاندن، یان بۆ پۆلێنکردن و هەڵسـەنگاندن، یـان بۆ ڕێکخستن و تەگبیرکردن.

لێرەوە، ڕەوت و پرۆژە فکرییە مۆدێرنـەکان کـە گرێـدراون بـە عـەقڵ و ڕۆشـنگەری و پێشـکەوتن و مـــرۆڤ دۆســـتیەوە، لـــە عـــەقڵی مۆدێرنخوازەکـــان و ڕۆشـنگەراکان و مرۆڤدۆسـتەکاندا، وەرچـەرخا بـۆ بیروباوەڕگەلێکی چەقبەستوو و نەگۆڕگەلێکی ڕەها، یـان بـۆ بنەماگـەلێکی میتـایی و گێڕانەوەگـەلێکی تۆبـــاوی، ئەمـــەش ڕاســـتگۆییەتی ئـــەو ڕەوت و پرۆژانـەی دۆڕانـد و وای لێکـردن، لـە گرەوکـردن

لەسەریان، بۆ تێگەیشتن و دەست نیشانکردن یان بۆ کردار و کارتێکردن، گونجاو نەبن.

ئەڵبەتە چەندین سەردەمی فکریی گەشەکردوی ئەوتۆ تێپەڕ بوون کە تیایاندا دروشمەکانی عەقڵ و ئازادی و پێشکەوتن و سوشیالیزم، ڕۆڵی خۆیان لە لێکدانەوە و ڕۆشنگەرێتیدا یان لە هاندان و جوڵاندندا، دەگێڕا، ئێستا ئەو سەردەمانە چیتر بەو شێوەیە نین، بەڵکو سەردەمگەلێکن وایان لێهاتووە پێویستیان بەوەیە لێك بدرێنەوە بۆ تێگەیشتن لە تەڵەزگەی پرۆژەکان و دۆڕانەکان. ئەوان، سەردەمگەلێکن، لانی کەم، پێویستییان بەوەیە لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی ڕوودەدات، لە بابەت وەرچەرخانە مێژووییەکان و کودەتا وجودییەکان، سەرلە نوێ دابهێنرێنەوە. بەم مانایە، مۆدێرنخوازەکان و کەلەپوورخوازەکان، لە دژی ئەوەی ناویان لێناوە مەترسیی جیهانگیری بە هێزە هەژموونگەراکانی و تەڵە نراوەکانییەوە، لەیەك بەرەدان. لەم هەڵویستەدا ئەو ڕۆشنبیرانەی کە بنەچەی نەتەوەیی و بنەڕەتی پەیامبەری–نەبەوی و ڕیشەگەلێکی مارکسیان هەیە، یەکسانن. لەم ڕووەوە هەموویان لەگەڵ داهێنانە تەکنیکییەکان و بازدانە شارستانییەکاندا وەها مامەڵە دەکەن وەك ئەوەی کەرەستەگەلێکی ئەهریمەنی بن، کەرەستەگەلێك کە خراپەو گەندەڵی یان لەبەریەکترازان و هەڵوەشان دێننە گۆڕێ. هەموانیش وەرچەرخانەکان، لە ئایدیاکان و ڕووداوەکاندا، بەو جۆرە دەخوێننەوە کە مەینەتیەکی فکریی خراپەخوازە، یان داگیرکەرێتیەکی کولتووریی دوژمنکارانەیە لەلایەن ڕۆژئاواوە یان ڕەوشێکی نوێیە لە ڕەوشەکانی ئەو سەرمایەدارییەی کە لە هەژموونی ئەمریکادا، بەرجەستە بووە.

بەم جۆرەش، ئەوان، لە پێناوی سەلماندنی ووتەزاکانیاندا، گۆڕانکارییەکان ڕەت دەکەنەوە ئەوەندەی ئەوەی کە ڕووداوەکان بە زمانی چاکەناسی و سکاڵا یان بە لۆژیکی ئایدیۆلۆژیاگەرایی و خەیاڵزەدەیی یان بە عەقڵییەتی قوربانی و پیلانگێڕی، دەخوێننەوە. بەرهەمیش گواستنەوەیە لە شۆکی پۆست مۆدێرنەوە بۆ شۆکی جیهانگیری، لە تیرۆری بنەڕەتخوازیەکانەوە (الأصولیات) بۆ داگیرکارێتیی وێنەکان و زانیارییەکان، ئەمە سەرباری هەڵچوون و داچوون لە نێوان جیهانێتیی بەسەرچوو و تایبەتمەندێتیە خنکێنەرەکاندا، واتە بەرگریکردن لە جیهانێتیی تێپەڕکراو یان بەتاڵکراو لە سەردەمی ڕۆشنگەری و شۆڕشەکانی ڕزگاریخوازی، دواتر کودەتاکردن بەسەریدا بۆ بەرگریکردن لەو تایبەتمەندێتیە کولتوورییانەی کە خەڵکەکانیان دەمارگیریی فاشیانە و پاکتاوکردنی نەژادیانە، پەیڕەو دەکەن، یان بۆ بەرگری کردن لە دەوڵەتگەل و ڕژێمگەلێك کە خاوەنەکانیان کۆمەڵگانی خۆیانیان وەرگۆڕاوە بۆ پرۆژەگەلێکی هەمەکی و سەربازگەگەلێکی ئایدیۆلۆژی.

## خامەنەئی و چۆمسکی

وا دیارە ئەم قەیرانە لە جیهانی عەرەبیدا دوو ئەوەندەیە، چونکە مۆدێرنەی فکری لەسەر دەستی بانگەشەکەرانی، ئەنجام نەدراوە، بە بەڵگەی ئەوەی ئێمە دەوڵەمەند کردن یان گەشەپێدانێك، بۆ هیچ یەکێك لە چەمکە مۆدێنێتییە باسلێکراوەکان، وەك چەمکی دیموکراسی و عەقڵانییەت و ڕۆشنگەرایی و پێشکەوتن و پەرەپێدان نابینین، بەڵکو ئەمانە بوونەتە چەند دروشمێکی لەبەرکراو کە دەوترێنەوە یان بت ئاسا پیرۆز دەکرێن. لێرەوە، لە ڕووی

لۆژیکی چەمك و میکانیزمەکانی بیرکردنەوەوە، سەرەڕای جیاوازیی پێودانەکانیان و بەریەککەوتنی تێزەکانیان، جیاوازییەکی گەورە لە نێوان مۆدێرنخواز و کەلەپورخوازدا نییە. هەردووکیان بە عەقڵییەتی بنەڕەتخوازییانە سەودا لەگەڵ پێدراوەکانی فکر و بەرهەمەکانی ڕۆشنبیریدا دەکەن، عەقڵێك کە جگە لە مینەکانی خۆی (الغامە) لەسەر زەمینی واقعی زیندوودا، شتێکی دی بەرهەم ناهێنێت. مادامێك یەکهاتنەوە لەگەڵ بنەڕەتدا مەحاڵ بێت، ئیدی مەسەلەکە پەیوەست بێت بە کەلەپووری ئیسلامەوە یان بە مۆدێرنەی ڕۆژئاواوە، بە عەقڵانییەتی دێکارتەوە یان بە ڕۆشنگەریێتیی کانتەوە. هەر ئەم بنەڕەتخوازیەش تەڵەزگەی ئابڕووبەری مۆدێرنەی عەرەبیە. ئەم تەڵەزگەیە سێ ڕووی هەیە، ڕووی یەکەمی ئەوەیە: دوای دەهەگەلێك لە کۆششی مۆدێرنخوازەکان بۆسیکۆلاریزەکردنی (علمنة) کولتوور و کۆمەڵگا، بنەڕەتخوازە ئاینیەکان (الأصولیات الدینیة) گۆڕەپانی فکر و کردەوە، لە زیاتر لە وولاتێکی عەرەبیدا، ڕادەماڵن. ڕووی دووەمی ئەوەیە: لە کاتێکدا خەڵکانی مۆدێرنە سوورن لەسەر بەرپاکردنی شۆڕشێك لە فکری ئاینی یان لە عەقڵی لاهوتیدا: لە چەشنی شۆڕشەکەی لۆسەر یان ڤۆڵتێر یان کانت، مۆدێرنە لە ڕۆژئاوا، بە هەموو ناونیشان و بەڵگەنەویستەکانیەوە، دەخرێتە بەر توێکاریی ڕەخنەو هەڵوەشاندنەوەوە دوای ئەوەی کە چەندین تەقینەوەی لە چەمکەکاندا، لە زیاتر لە لقێکی زانین و ڕۆشنبیریدا، بە خۆوە بینی" لە وێنەکیشانەوە بۆ بیناسازی و، لە فیزیاوە بۆ فەلسەفەو، لە ماتماتیکەوە بۆ ڕەخنەی ئەدەبی.

دوا ڕووی تەڵەزگەکە ئەوەیە: ئێستا لە کاتێکدا مۆدێرنخوازەکانی عەرەب داوای پەیڕەوکردنی نموونەکانی مۆدێرنە دەکەن لە بواری پیشەسازی و پەرەپێداندا، شۆڕشی زانیاری بە جۆرێك دەتەقێتەوە نموونە مۆدێرنەکانی کاری شارستانی و پەرەخوازی (التنموية) وا لێدەکات ئاسۆیەکی داخراویان هەبێت. ، ئەمەش بەرهەمی مامەڵەکردنە لەگەڵ ئەزموونە مۆدێرنەکاندا وەك نموونەگەلێکی بنەڕەتدار: واتە بەرهەمەکە ئەوەیە قەیرانگەلێکی پەرەخوازی (أزمات تنموية) بەرهەم دەهێنێت، چونکە ئەوەی وای کردووە مۆدێرنە مومکین بێت، پەیوەندیی ڕەخنەگرانەیە لە نێوان فکر و ئەوەی کە بەرهەمی دەهێنێت لە بابەت ڕەوتەکان و نموونەکان.

بەم شێوەیەش، ڕووبەڕووبوونەوەی گۆڕانکارییە جیهانییە مەعریفی و تەکنیکیەکان، بە عەقڵییەتێکی بنەڕەتخوازانە یان ئایدیۆلۆژییانە، خەڵکانی مۆدێرنیست و شوێنکەوتوانی کۆنەخوازێتی، لە یەك بەرەدا، لە دژی ئەوانە کۆ دەکاتەوە، کە ناویان لێناون بە ڕۆژئاواییکردن و بە جیهانیکردن هەروەك ئەوەی کە لە جیهانی عەرەبیشدا دەکرێت، یان دژی ئەوانەی کە ناویان ناون بە جیهانیکردن و بە ئەمریکاییکردن هەروەك لە ئەوروپا و بە تایبەتیش لە فەرەنسادا، دەکرێت. سەیریش نییە ئالەم کاتەدا ڕۆشنبیرانێکی دوورلەیەکی زۆر دوور لە زمان و کولتوور و شوناسدا، بەیەکتر بگەن، وەك بەیەکگەیشتنی خامەنەئی و چۆمسکی و پیاربۆردیۆ لە هەڵوێست وەرگرتنیاندا لە کولتووری ڕۆژئاوایی و ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و سیستەمی نوێی گەردوونی.. لەم ڕووەوە، لەو کاتەی زمانزانی ئەمریکی (چۆمسکی) کتێبێك دەربارەی داگیرکردنی بەردەوامی ڕۆژئاوا بۆ جیهان، دادەنێت و، زانای فەرەنسی (بۆردیۆ) هەڵمەتێکی توند دەکاتە سەر

تەلەفزیۆن، رابەری ئێرانی (خامەنەئی) یش بە بەردەوامی هێرش دەکاتە سەر کولتووری رۆژئاوایی و ئامرازەکانی راگەیاندن، رێك وەك ئەوەی کە بانگەشەکەران و پیاوانی ئاینی لە جیهانی ئیسلامیدا، ئەنجامی دەدەن. لە کۆبونەوەی ئەم رۆشنبیرانەشدایە گەواهی بۆ ئەوە دەدرێت کە رۆشنبیران شتێکی تر نین جگە لە دیوەکانی تری ئەو دەسەڵاتانەی کە ئەوان، واتە رۆشنبیران، لافی ئەوە لێدەدەن بەرەنگاریان دەبنەوە یان لە دژیانن.

بەم جۆرە، رۆشنبیرە مۆدێرنخوازەکان و بانگەشەکەرە بنەرەتخوازەکان، لەگەڵ تەقینەوە مەعریفی و تەکنیکیەکاندا، بۆ بەرگریکردن لەو بەهاو چەمك و پرۆژانەی کە هەڵدەوەشێنەوە و دادەرووخێن، لەیەك سەربازگەدا رادەوەستن. سەرەنجامی هەڵوێستەکانیشیان بەرگریکردنێکی شکست خواردووانەیە، بەرگریکردنێك کە وایان لێدەکات ببنە قوربانیی ئەو بیروباوەڕانەیان کە شتێکی دی بەرهەم ناهێنن جگە لە قەیرانەکان و تەڵەزگەکان، ئەوەش وا دەکات جیهانگیری زیاتر بەرفراوان ببێتەوە و وولاتە یەکگرتووەکانیش زیاتر بە هەژموون بکات. ئەمەش جێی سەرسوڕمان نییە، جیهان کە ڕێی خۆی دەکات و پێك دێت، لە خوێندنەوەیدا، نە ریفۆرمخوازێتیی لۆسەر و نە عەقڵانییەتی سەردەمی کلاسیکی، چارەی ناکەن، هەروەها چیدی لە تێگەیشتن لێی، نە لیبراڵییەتی ڤۆڵتێر و نە رۆشنگەرایی کانتیش چارەی ناکەن، لە گۆڕینیشیدا، نە مێژووگەرایی هیگڵ یان مارکس و نە شۆڕشگێڕێتیی سەدەی بیست یان ئایدیۆلۆژیا رەخنەیی و ئازادیخوازەکان، سەرکەتوو نابن. لە بەرتریش لەمانە، ئەوەیە کە، لە تێگەیشتن لێی و لە گۆڕینیدا، واتە تێگەیشتن و گۆڕینی جیهان، ئەو عەقڵییەت و نموونانەی، کە ریشەیەکی پێغەمبەرانەو ئاینیانەیان هەیە، چارەی ناکەن.

ئەوەی کە روودەدات، پەیوەندیی بە ماناو هێزەوە، بە زانین و بەهاوە، بە سامان و دەسەڵاتەوە، بە خودو شوناسەوە، بە فکر و واقعەوە، واتە بە حەقیقەت و بوونەوە، دەگۆڕێت. لەبەر ئەوە، پێویستیمان بەوەیە لەوە بگۆڕێین کە لە بواری فکر و ووتن و کردەوەدا لەسەری هەین، بە جۆرێك هەموو کەرەستەی فکری و زەخیرەی چەمکی: واتە تاکبەندیەکانی گوتار (مفردات الخطاب) و ئاوێتەکراوەکانی تێگەیشتن، میکانیزمەکانی لۆژیك و قاوغەکانی زانین، نموونەکانی روانین و پرەنسیپەکانی پۆلێنکردن، پێوەرەکانی کردەوەو رێ و شوێنەکانی مامەڵە، بخەینە بەر لێپرسینەوە و پێداچوونەوە یان ئاشکراکردن و رووتکردنەوەوە. ناشتوانین، لە سەردەمێکدا کە فکر و کەرەستەو هێزەکانی، بە شێوەیەکی خێراڕەوت دەگۆڕێن، بیر بکەینەوەو کاربکەین ئەگەر خوازیار نەبین بیروباوەڕەکانمان وەربچەرخێن بۆ بەربەستگەلێك یان ببنە سەرچاوەی بێ توانایی خودیمان.

ئەوەی کە لە ئێستادا لە توانادا بێت، گەڵاڵەکردنی تۆڕێکی نوێ و جیاوازە لە چەمکەکان، تۆڕێك کە لەگەڵیدا، خودی چەمکی گۆڕانیش گۆڕانی بەسەردا دێت ئەوەندەی کە پەیوەندیی هەڵگرانی پرۆژەکان بە فکر و کردەوەوە و، بە واقع و جیهانەوە، دەگۆڕێت. ئەم گۆڕانەش سێ رووی هەیە، گۆڕانەکە ئەوەیە کە دەشێت تێوەی بگلێیت بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەوەی کە روودەدات، رێك وەك ئەوەی کە من هەوڵ دەدەم لە نزیك کاریەکانمدا (مقارباتي) بۆ شۆڕشی زانیاری دەریبخەم، ئەو نزیك

كاریانـەم كـە جیاجیـان بـۆ مەسـەلەی پەیوەنـدیی نێـوان شـوناس و جیهـانگیری، ئەمـەش لەبـەر ڕۆشـنایی شـێوازێكی نـوێ لـە شـێوازەكانی بەیەكگەیشـتنی مرۆیـی، شـێوازێك كـە لـە ڕێگـەی ڕەخنـەكردنی وێنـەو فۆرمـە ناسـراوەكانی مـرۆڤ دۆسـتییەوە سەرچـاوە دەگرێـت، ئـەو وێنـەو فۆرمانـەی مرۆڤدۆسـتی، كـە دارمانـەكان، لـە دامەزراوەكانی مانا و قوتابخانەكانی فكر، كۆتاییە شكسـتخواردوو یـان شـوومەكانیان، بـۆ دەنووسنەوە.

## پەراوێز

1-ئـەم بابەتـەی كتێبەكـە، پـێش كۆچـی دوایـی "پیار بۆردیۆ" نووسراوە.

## سەرچاوە

ئەم بابەتە، نەسكێكە لە كتێبی (حدیث النهایات، فتوحات العولمة و مآزق الهویة)ی بیریاری لوبنانی "عەلی حەرب" ل 167-179.

# ڕەخنە و لێکۆڵینەوە

- پەیوەندی نێوان ژیاننامە و ڕۆمان

**عبدالرحمن منیف**

**لە عەرەبییەوە: شیرین. ک**

- ژیانی من

**هنری میللەر**

**لە فارسییەوە: فرزند شیرکۆ**

- چۆنیەتی خوێندن و ژیان لە ئەکادیمیای نسیبین

**پیکو لوسکایا**

**لە فارسییەوە: وریا قانیع**

# پەیوەندی نێوان ژیاننامەو ڕۆمان

بەشێك لە كتێبی (گەشتی تیشكێك)

**عبدالرحمن منیف**

**لە عەرەبییەوە: شیرین. ك**

كۆلریدج دەڵێ:

"ژیانی هەر مرۆڤێك چەندە هیچیش بێت گەر بەڕاستگۆیی بگێڕدرێتەوە خۆشە"

ئەم قسەیەش بەمانای ئەوەدێ (هەرچەندە قسەكە زۆر ئاشكرایە) بۆ ئەوەی چێژوەرگرین دەبێت دوو ڕەگەزی سەرەكی لەگێڕانەوەكەدا هەبێت، یەكەم: ئەو شێوازەی –ژیان–ەكەی پێدەگێڕدرێتەوە شێوازێكی هونەری بێت، دووەمیش ڕاستگۆیانەبێت بەڕادەیەك هەر كەسێ گوێی لەو –ژیان–چیرۆك–ە بێت شتێك لەچێژی تیا هەست پێبكات، چونكە ئەگەر هونەر چێژی تیانەبوو، هونەر نییە ڕەنگە شتێكی سوودبەخش بێت وەكو مێژوو، ڕەنگە زانیارییەكی زیاتربێت وەكو زانستەكان، لەوانەشە ئامۆژگاری بێت بەڵام لەئەنجامدا هونەرنییەو شتێكی ترە، ئەمە بێئەوەی لەبایەخ و پێویستی ئەو شتە كەمكەینەوە.

ئەگەر ئەو كەسەی ئەو ژیانە دەگێڕێتەوە خۆی تیاژیابێت درەوشانەوەیەكی زیاتر دەدا بەڕۆمانەكەو گەرمو گوڕترو وردو توونـدوتۆڵتر دەبێت، ئەمە هیچ نەبێ لەڕووی ئەو واقیعانەوە كە دەیگێڕێتەوە چونكە گەر كەسێك خۆی لەو ژیانەدا ژیابێت دەتوانێ ڕاستگۆیانەتر بیگێڕێتەوە وەك لەو كەسەی لەدوورەوە چاودێری دەكات یان ئەو كەسەی بەخەیاڵ دەینووسێ.

بەمجۆرە ئەو ڕۆمانەی كەسەكە خۆی واتە خاوەنی مەسەلەكە خۆی نووسیوێتی بەمەرجێ ئەو دوو ڕەگەزەی تیابێت (شێوازو ڕاستگۆیی) لەم حەقیقەتەوە نزیك ترو كاریگەرتر دەبێ، ئەمەیە وادەكات ژیاننامە بایەخداربێت و هەندێجاریش دانسقە بێت، ئەمجۆرە ڕۆمانە قەدەرێك زیاتری لەوردەكاریو وردبینی و هەستەكان تێدایە لەچاو ڕۆمانەكانی تردا، چونكە ئەوەی دەیگێڕێتەوە

بەهەستەکانی دڵو بەئەعسابی ڕۆح ئەمەدەکات بێئەوەی زۆر گوێ بەساردو سڕی عەقڵ بدا کە زیاتر بەلای هەڵبژاردنو وردبینیدا دەیشکێنێتەوە، ئەوەی بەلای نووسەری –ژیاننامە– ڕۆمان–ەوە گرنگە ئەوە بگێڕێتەوە کە بەڕاستی ڕوویداوە بەدەر لەجوانی بونیادو مەزنی زمانو زرنگانەوەی وشەکان، ئەمە ئەو هاوسۆزییەی زۆر لەخوێنەران ڕاڤە دەکا کە بەرامبەر بە –ژیاننامە–هەیانەو زۆر نەوەستانیان لەئاستی ئەو کەموکوڕیانەی کە ئەو جۆرە نووسینە تیایدابێت لەهەندێك لایەندا وەکو لەڕووی زمان یان مەنتقو بونیادی هونەرییەوە" بەلام لە کۆتاییدا هونەر، بەتایبەتی ڕۆمان بەتەنیا گوزارشتکردن نییە لەخودو بەتەنیا پێشکەشکردنی دانپیانانێك نیە، سەرەڕای گرنگی ئەو دوو ڕەگەزە، ئەرکی ڕۆمان بنیاتنانی جیهانێکی تەواوەتیە بەهەموو لایەنو دژواریو ململانێکانیەوە، ژیانی راویش یەکەیەکە لەنێو چەندین یەکەی تردا. بەلام ئەگەر هاتوو ژیانی راوی بووە تاقە تەوەر یان ئەو بازنەیەی گەمارۆی جیهاندەدا ئەمە دواجار دەبێتە هۆی حاڵەتێك لەتێکەڵیو شڵەژان، خۆ ئەگەر یەکەم ڕۆمان لەم شتە ڕزگاری بوو ئەوە لەڕۆمانەکانی دوایی تریدا دەرئەکەوێ.

ئەو یەکەم ڕۆمانەی ڕۆماننوس دەینوسێ زۆر گرنگو خەتەرە ئیتر بلاوی بکاتەوە یان نا، چونکە ئەم یەکەم ڕۆمانە بڕیاردەدا کە ئەمە بەڕاستی یەکەم ڕۆمانێتی یان ئەمە تاقە ڕۆمانو دوایین ڕۆمانێتی، ئەمەش پشت بەچەندین ڕەگەزو مەرج دەبەستێت کە دەبێ ڕۆمانووس هەیبێت لەو مەرجانەش، دەبێ راوی خەمێکی گشتی هەبێت کە بیەوێ بیگەیەنێ، یان مەسەلەیەکی گەورەی وای هەبێت کە داگیری کردبێتو بەپێویستی بزانێ بۆ خەڵکی باسبکات تا لەو خەمە یا مەسەلەیەدا بەشداری بکەن، هەروەها دەبێ ئارەزوو و توانای هەبێت ئەوەی دەیەوێ بیڵێت، بەشێوەیەکی هونەری بیڵێت، کەواتە هەموو مەرجەکانی بونیادو زمانو قەناعەتپێکردنو چێژی تیابێت هەروەها باسی مەسەلەیەك بکات چەند نووسەرەکە خۆی بەلایەوە گرنگە خەڵکیش بەلایانەوە گرنگ بێت، تا نووسەر یان راوی خۆی بەتەنیا تاقە تەوەرنەبێت ڕووداو و کارەکتەرەکان لەدەوری بسوڕێنەوەو لەخزمەتی ئەودابن بۆ دەرخستنی، هەروەها دەبێت ڕۆمانەکە زادەی سەردەمەکەی خۆی بێتو سوود لەو پێشکەوتنانە وەرگرێ کە لەو بوارەدا ڕوویانداوە، جگە لەوەی شتێکی نوێ بهێنێتە ئاراوە.

ئەو ڕۆمانە چونکە یەکەم ڕۆمانەو خاوەنەکەی خۆیدەکات بەجەنگەڵێکی چڕوپڕدا کە لەوانەیە پێشتر نەچووبێتە شوێنی واوە، دەبێت بزانێ کام ڕێگا دەگرێتەبەرو بۆ کوێ دەچێت، زانینی ئەم شتانەش زۆر بەکەمی نەبێت دەستەبەر نابێت، کەواتە لەکۆی ئەو شتە دەستلێدراوانەی نووسەر پشتی پێدەبەستێت تا لەو جەنگەڵەدا ڕێی خۆی بدۆزێتەوە زۆربەی جارەکان شتێکە لەهەموو ئەوانی تر ئاشکرا ترە ئەویش ژیاننامەیە.

ژیاننامەی مرۆڤ، هەر مرۆڤێك گرنگو ئامادەیە بۆ مرۆڤەکە خۆی ئەو وایدادەنێ کە لەژیانیدا چەندین ئەزموونو وێستگە هەیە کە بەلای خۆیەوە زۆر دەهێنێ، بەو پێیەی ئەو وای دەبینێ، ڕەنگە لەگەڵ ڕووداوو مەسەلەکانی خەڵکانی تریشدا یەکبکەونەوە، چونکە بابەتی ژیاننامە ئامادەیەو بەسەخاوەتەوە خۆی بەدەستەوە دەدا" ئەو ئیغرائەی تیایەتی هەندێجار دەگاتە ڕادەی فریودان هەر ئەمەیە کە چەندین نووسەری ڕۆمان تووش دەکاتو پێوەی دەکات بەتایبەتی لەیەکەم ڕۆمانیاندا.

بۆیە دەبێ بەوردیو سڵکردنەوەوە سەیری یەکەم ڕۆمان بکرێ چ لەلایەن نووسەرەکە خۆیەوە چ لەلایەن خوێنەرانیشەوە, چونکە ئەگەر (بڕی) ئەو ژیاننامەیە لەیەکەم ڕۆماندا زۆربوو ئیتر نووسەر ڕێ لەخۆی دەبەستێتەوە, چونکە هەر نووسینێکی تری ئەو گەرمو گوڕییەی تیانابێت کەوایکردووە پەیوەندییەك یان هەڵوێستێکی بۆ دەستەبەر بکات لەناو خوێنەراندا, زۆرجار ڕۆمانی یەکەم ئەو جۆرە تەکانەی تیایە چونکە ئەو درکاندنەی بەیەکەم بەرهەمەوە دیارەو ئەو وردەکارییانەی لەژیانە ڕۆژانەکەوە وەرگیراوە جگە لەوەی زۆر کەس حەزدەکەنو ئارەزوویان وایە ژیانی نهێنی نووسەری ژیاننامەکە بزانن کە لەیەکەم ڕۆمانیدا دایناوە, لەکارەکانی دواتردا بۆی هەڵناکەوێ, هەروەها ئەو فزوڵەی خەڵك بۆ یەکەم دەرکەوتنی نووسەر هەیەتی دواتر کەمدەبێتەوەو پاشەکشە دەکات ئەمە وادەکات هەنگاوەکانی دواتری نووسەر بشڵەژێنێو تووشی ڕامان بێ سەبارەت بەوەی کە دەبێ چی بڵێ, چی بۆ زیادبکات بەتایبەتی کە هەراو هۆریای ژیاننامە کاریگەرییەکی تایبەتمەندی هەیەو زۆر هەژێنەرو سەرنجڕاکێشە.

ڕەنگە زیادەڕۆیی بێت گەر بڵێین ژیاننامە وەکو شێوازێکی نووسین سیحرێکی سەرسامکەری بۆ نووسەرو خوێنەرەکەشی هەیە, جگە لەوەی تایبەتمەندە زۆربەی کات سەربەستو ئازادو ئاسانە, بڕێکی باشیش وردەکاری گەرمو هەندێجاریش سووتێنەری تیایە, بەبیانووی ئەوەوە ئەمە لەپێش هەموو شتێکدا دانپیانانە یان گەڕاندنەوەی ژیانێکە کە ڕۆژێ لەڕۆژان هەبووە بەهەموو خۆشیو ناخۆشیو شکستو برینەکانیەوە بەهەرچی ئارەزوو و خەونەکانیشیەوەیە, هەروەها ژیاننامەکە وەکو زەمەنو ڕووداو لەگەڵ ژیانی گەلێك کەسدا لەهەندێ جێگەدا یەکدەگرنەوە, ئەمە وادەکات خوێنەرو ڕاوی ئەگەری ئەوەیان هەبێت بتوانن شوێنەکانی خۆیان ئاڵوگۆڕبکەن, بەشێوەیەك لەچەند چرکەیەکی تایبەتدا خوێنەر هەستدەکا خۆی پاڵەوانی ئەو ڕووداوانەیە کە بەبەرچاویدا تێدەپەڕن, خۆ ڕەنگیشە هەست بەشتی زیاتریش بکات کاتێ ژیانی خۆی یان چارەنووسی خۆی بەژیانو چارەنووسی کەسێکی دی بەراورد دەکا.

ئەو شتانەی لەژیاننامەدا هەیە گەر لەگەڵ شتەکانی خوێنەریشدا نەیەنەوە فزوڵی خوێنەر کە هەندێجار دەگاتە ڕادەی غەریزە وایلێدەکات شەیدای زانینی نهێنیو ڕووداوە نهێنییەکان بێت, بەتایبەتی ژیانی ئەوانەی ناوی بیستوون یان دەیانناسێ, هەروەکو ئەوەی بەدزییەوە بەراوردێك بکات تا بزانێ ئەو هۆکارو بارودۆخانە چین کەوای لەراوی کردووە لەسەرکەوتنو شکستەکانیدا ناوازەبێت.

هەندێجاریش لە کتێبەکانی ژیاننامەدا هاتووە چۆن پەیوەندی خوێنەرو ڕاوی دەبێتە شتێك لەبابەتی ئامۆژگاریو ڕێزلێنان چونکە لەژیانی پێشیناندا چەندین دەرس هەیە کە زیندووەکان دەتوانن سوودی لێوەرگرن, ئەمەش ڕاڤەی ئەو پەیوەندییە دەکات کە لەنێوان ژمارەیەکی زۆر لەخوێنەرانو کتێبەکانی ژیاننامەدا هەیە ئەم حاڵەتەش لەزەمەنی شکستەکاندا زۆر ئاشکرا دەبێ, ئەو کاتەی ژیاننامەکان دەبنە پەناگەیەك یان بۆ ڕاڤەکردنی ئەو نەهامەتیەی هاوچەرخەکان تیا دەژین.

شێوەی پەیوەندیکردن بەژیاننامەوە هەرچۆنێك بێت زۆر گرنگو ئاماژەدارە, بەتایبەتی نووسینە عەرەبیە هاوچەرخەکان لەم تایپە

نووسـینەی زۆر کـەم تێدایـە کـە دەبـوو کەسـانی پەیوەندیـدار بـەم مەسـەلەیەوە خۆیـان راسـتەوخۆ بیانوسـیایە بـەڵام لەبـەر گـەلێ هـۆ نـەیان نووسـیوە لەوانـە سانسـۆریکۆمەڵگە، تـرس لەلێپێچـینەوە، سەرەڕای بەهاچەقبەستووەکان کە (دەبێ و نابێ)کان تەحدید دەکەن، ئەمانە هەمووی زۆرجار دەبنە هۆی نەنووسینی ئەو ژیاننامەیە، جگە لەوەی لەئەنجامە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان دەترسن، ئەمە وادەکات تۆمارکردنی ژیاننامـە لەتەسـکترین سـنووریدابێ و پـەراوێزێکی بچـووک بـێ لەنووسـینی عـەرەبی هاوچەرخدا.

لێرەشـدا دیسـان جـارێکی تـر دەبـێ ئـەوە دووپات بکەینەوە کە تا ئێستا یادەوەری عەرەبی، یادەوەرییـەکی سـەرزارەکییە، واتـە نەگەیشـتۆتە ئاستی تۆمارکردن، لەبەرئەوە زۆربەی نووسینەکان پشتیان بەوە بەستووە کە یادەوەری کۆیدەکاتەوە، یا راوییەکان دەیگێڕنەوە، بێئەوەی بگەڕێنەوە لای بەڵگەنامـەو ئـەو یاداشـتنامانەی لـەکاتی خۆیـدا نووسـراون، ئەوە لەکاتێکدا گەر ئەو یاداشتنامانە هەبن.

لەئاسـت ئـەم حاڵەتـەداو لەئـەنجامی ئـەو تینوێتیە گەورەیەی کە هەیە بۆ دووبارە گێڕانەوەی رۆمـانی رووداوەکـان و دەرکەوتـە مێژووییـەکان بەپشت بەستن بەئەزموونەکان بەمەبەستی گەیشتن بـەجۆرێ لـەدڵنیایی، ئیتر لەسەر ئاستی دەرکەوتە مێژووییەکان بێ یان رووداوە کەسییەکان لەبەرئەوە دەبیـنین بایەخـدان بەیاداشـتنامەو ژیاننامـەو خسـتنەڕووی شـایەتیەکان لەزیادبووندایـە، جگـە لەوەی نووسەرانی رۆمان لەم ماوەیەی دواییدا زیاتر شـەیدای ئـەوە بـوون بگەڕێنـەوە بـۆ قۆنـاغی منـاڵی و هەوڵدانیان بۆ جارێکی تر گێڕانەوەی یان تەنانەت -خـەڵفکردنی- بـەو حیسـابەی گەنجینەیەکە بـۆ رووداو و زیندوکردنـەوەی یادەوەرییـەکی لـەبیرکراو بەهـەموو رووداوە لـە رادەبەدەرەکانییـەوەو بـەو رابردووەشەوە کە نایەوێ ئاوا بێ..

ئـەوەی وادەکـات ژیاننامەیـەك بایـەخی هـەبێ، بایـەخی ئـەو مرۆڤەیـە کـە لەوێـدا ژیـاوە، بایـەخیش بـەڕۆڵی سیاسـی یـان فیکـری پێوانـە نـاکرێ، بـەڵکو بەپێی قەوارەی موعانات و جۆری ژیانەکەیە، بایی چـەند ئـەو رۆژگـارەی کـە تیـا ژیـاوە ناخۆشـی و تەحـدای تیـا بـووەو بـایی چـەند توانیـوێتی بـەرەو روویان بێتەوەو بەسەریاندا زاڵبێت، ئەو ئاماژانەی ژیانەکـە لەسـەر جەسـتەو رۆحـی جێیهێشـتووە، بەشێوەیەك دەتوانین بەشاهێدی قۆناغێ لە زەمەن-ی دانێین بەهـەموو شـیرینی و تاڵییەکانیـەوە، دواتـر چـۆن چـۆنی ئـەو شـتانەی تێپەڕانـدووە وا ئێسـتا جارێکی تر دەیانگێڕێتەوە تا ببێتە پەندو دەرس.

لەبەرئـەوەی ژیاننامـە شـایەتیدانە، مـەرجی شایەتیدان و کاریگەریشی ئەوەیە کە راستگۆیانەو وردبێت، راستگۆیی مەرجێکی سەرەکییە کە دەبێ لەژیاننامـەدا هـەبێت تـا ئـەو رەگـەزە زیاتربـێ، هـەتا ئـەو رەگـەزەش (واتـە راسـتگۆیی) زیاتربـێ پەیوەندییـەکی متمانـە پێکـراو لـەنێوان هـەردوولای هاوکێشـەکەدا دروسـت دەبێـت واتـە راوی و وەرگـر، مەنـەلۆژێك دروست دەبێ قەوارەو ئەدگارو رەنگ و تـامو بـۆی راسـتەقینەی خـۆی پێدەبەخشـێ، بەشـێوەیەك دەتـوانین وێنـای ئـەو ژیانـە بکـەین کـە هەبووەو ئەو رووداوانەی تیایدا روویداوە.

شانبەشـانی ئـەو راسـتگۆییەی کـە پێویسـتە لەژیاننامـەدا هـەبێت، دەبێ وردبینـی -شـی تیابێ، چونکە وردبینـی بەشـێکە لـەو راستییەی دەمانـەوێ پێیبگەین، ئەوەندە بـەس نییـە رووداوەکـان بـەکاڵ و کرچی وەکو خۆی بگێڕدرێنەوە بەڵکو دەبێ بخرێتە ڕێڕەوی زەمـەنی خۆیـەوەو ئـەو بـارودۆخ و تێکـەڵی و

پێکەڵییەی لەگەڵیدا هاتووەو ئەو کەشەی ئەو ژیاننامەیە تیا روویداوە هەمووی روونبکرێتەوە، چونکە پشتگوێ خستنی ئەو رەگەزانە یان بەیەکدا چوونیان وادەکات رووداوەکان بگۆڕێن یان هەڵاوگێڕبن، ئینجا شێوازی گێڕانەوەی ئەو رووداوانەی پەیوەندی بەژیاننامەکەوە هەیە لەژیاننامەکە کەمتر نییە، ئەمەش پێویستی بەزانینی جۆری گەیاندنەکە هەیە هەر وەکو ئەوەی لەگۆرانی وتنی گۆرانیبێژدا پێویستە، ئەوەندە بەس نییە گۆرانیبێژەکە وشەکانی گۆرانییەکەی لەبەربێت بەڵکو لەوەش گرنگتر ئەوەیە بزانێ چۆن دەیڵێت و دەنگێکی خۆشی هەبێت و ئامادەییەکی کاریگەری هەبێت.

هەموو ئەوەی باسمان کرد لایەنێکی ئەو بابەتە دەگرێتەوە کە دەبێ لێی بەئاگابین چونکە لایەنەکەی تری کە لەو کەمبایەخ تر نییە، ئەوەیە کە دەبێ جیاوازی لەنێوان رۆمان و ژیاننامەدا بکەین بەتایبەتی کە ئێستا ئەم تایپە لە رۆمانی — ژیاننامەدا لەزیادبووندایە.

رۆمان هەروەکو ئێستا ئاماژەمان پێدا دروستکردنی جیهانێکە، راوی یەکێکە لەیەکەکان و تاقە کەس نییە بەڵام ژیاننامە تۆمارکردنی ژیانی مرۆڤێکە یان بەشێك لەژیانی ئەو مرۆڤە ئیتر چی لەو ژیانەدا هەبووبێت بەرووداو و ناخۆشی و تەحەداکانییەوەو چۆن مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، ئەمە یەکەم، دووەمیش: زۆرجار بەشێك لەرۆماننووس لەو رۆمانەدا هەیە کە دەینووسێ بەڵام ئەو —بوون— ەی شاراوەیەو بەسەر هەموو لایەنەکانی رۆمانەکەدا دابەشکراوە، واتە لەهەموو بەشێکی رۆمانەکەدایە بێئەوەی خۆی دەربخات و بێئەوەی خوێنەر هەست بەقورساییەکەی بکات، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرێ درکی پێبکرێ و بناسرێتەوە، ئەو رۆمانووسەی پیشەکەی خۆی چاك دەزانێ، دەتوانێ سوود لەئەزموونەکانی ژیانی خۆی وەرگرێ و هەندێك لەو ژیانەی کە ژیاوە دزە پێبکاتە ناو رۆمانەکەیەوە، بەڵام دەزانێ ئەو برە چەندە کە دەبێ بیکاتە ناوی، هەروەها دەزانێ ئەو شێوازە چۆنەو ئەو کارەکتەرە یا کاراکتەرانە کێن کە دەتوانن ئەو تام و چێژە هەڵگرن، چونکە خەمی رۆمانووس ئەوەیە کە دەیەوێ لەمیانەی رۆمانەکەیەوە توێژێك یان قۆناغێك لە ژیانێکی زۆرو فرە لایەن و هەمەرەنگ پێشکەشبکات، ئەو ژیانەش چەند وەکو رەفتارو قەناعەت نموونەی خۆی بن ئەوەندەش دەبێ نموونەی خەڵکیش بن بەو پێیەی ئەوانی تریش بابەتی رۆمانەکەین.

کەواتە ئەدگاری رۆماننووس چەند دیار نەمێنێ و لەچەقی وێنەکە دوورکەوێتەوە ئەوە باشترو زیاتر کاریگەری دەبێ، بەتایبەتی گەر راوی خۆی تەوەری سەرەکی رووداوەکە نەبوو یان بەشێك نەبوو لەو وێنەیە، بەڵام ئەو کاتەی رۆماننووس باسی ئەوانی تر دەکات کەچی خۆی دەکاتە تەوەری سەرەکی رۆمانەکەو ئەوانی تر دەکاتە زوڕناو دەمامك بۆ ئەو شتەی حەزی پێدەکات یان دەیەوێت بیڵێت ئا لەم حاڵەتەدا هەموو کارەکە سەقەت دەکات و رۆمانەکە دەبێتە وێنەیەکی شێوێنراوی خۆی و ئەوانی تر پێکەوە.

لەبەرئەوەی رۆمان جیهانێکی زۆر دەوڵەمەندو هەمەرەنگ و ئاڵۆزە بەجۆرێك ناتوانین لەیەك نموونەدا کورتی بکەینەوە، ئیتر ئەو نموونەیە هەرچییەك بێت، لەبەرئەوە دەبێت رۆمانووس باکگراوندێکی مەعریفی باشی هەبێت و خاوەنی ئەزموون و سەر راستیش بێت، دەبێت لەزۆربەی ئەو خەسڵەتانەدا لەدادوەر بچێت واتە لەڕووی ئاگالێبوونیەوە لە وردەکاریەکان و توانای چاك

گوێگرتنی هەبێت، هەرچیش بێتە بەردەمی لێیوردبێتەوەو هەوڵبدات شتو پاڵنەرەکانی پشت ئەو ڕووداوانە کەشف بکات هەروەها دەبێ بەوردیو بەجیا لەهەر ڕووداوێك رابمێنێ، ئینجا لە پەیوەندی ئەو ڕووداوە بەڕووداوەکانی ترەوە، پێش ئەوەی حوکمەکانیشی دەربکات دەبێ بگەڕێتەوە لای عەقڵو دڵی خۆی، کە دڵنیابوو بێ ترس قسەی خۆی بکات.

ڕۆمانووسو دادوەر لەو خەسڵەتانەدا هاوبەشن، بەڵام لەدوو خەسڵەتدا جیاوازن، ئەو دووانەش لەیەککاتدا باشنو خەوشیشن، ئەو دوو شتەش: بێلایەنیو خەیاڵ-ە.

ڕۆمانووس بێلایەن نییە چونکە دادوەر نییە کەواتە ئەرکی سەرشانی ئەونییە حوکم بدات، ئەرکی ئەو نمایشکردنی ڕووداوەکانە بۆ ئەو کەسەی لێی رادەمێنێ و لێی ورد دەبێتەوە چی بەمەنتقیو دادپەروەری دەزانێ ئەو ئەنجامەی تیابەدی دەکات، ڕاستە شێوازی نمایشکردنەکە ناڕاستەوخۆ حوکمەکان تەحدید دەکات بەڵام هەست ناکات کە تاوانبارە یان ناچارە بەرگری لەخۆی بکات، ئەو لەگۆشە نیگای خۆیەوە ڕووداوەکانی چۆن دیوە یان وایدادەنێ دیوێتی ئاوایان نمایشدەکات، کەواتە بەوردترو ڕاستتریان دادەنێ، بەو مانایەش بێلایەن نییە. ئەوەی هەڵوێستی ڕۆماننووس دیاری دەکات ئەوەیە ڕووناکی خستۆتە سەر چیو چی شاردۆتەوە، چی وتووەو چی نەوتووە؟

کەواتە هەڵبژاردنەکانی ڕۆمانووس هەڵوێستی دیاریدەکات، هەروەها شێوازی پێشکەشکردنی شایەتحاڵەکان، نیازەکانی هەڵدەماڵێ، ئەوەی شایەتحاڵەکان دەیڵێن بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەریدەخات ڕۆماننووس دەیەوێ چی بڵێت یان چی بشارێتەوە، لەبەرئەوە ناتوانرێ ڕۆماننوس بەبێلایەن دانرێ، چونکە هەموو جارێکیش بێلایەنی لەڕۆماندا باش نییە، بەڵام لێرەدا جیاوازی هەیە، جیاوازییەکی بنەڕەتی لەنێوان ئەو هەڵوێستەو ئەوەی لەژیاننامەدا دێت، ڕۆمان بڕێکی گەورە لەڕووداو و شایەتیدان دەخاتەڕوو بەڵام ژیاننامە تێڕوانینێکی یەك لایەنەی هەیە لەگەڵ ئەو خەسڵەتەی کە هەر تاوانبارێك هەیەتی کاتێك لەژێر تاقی دادگادا دەوەستێو پێدادەگرێ لەسەر ئەوەی کە بێتاوانە یان دەیەوێ وابێ، ئەمە وایلێدەکات ڕووداوەکان بەجۆرێکی تر ببینێ بەمەش بڕێکی زۆر لەشێواندنی بەئەنقەست درووستدەکا بەجۆرێك وا دەکات ئەوانی تر شتەکان نەبینن.

ڕاستە ڕۆماننوس بەشێوەیەکی فۆتۆگرافی واقع ناگوێزێتەوە بەڵکو جارێکی دی دروستی دەکاتەوەو دایدەڕێژێتەوە بەپێی ئەو پێوانانەی ئەو بە جوانتری دەزانێ، بەڵام پەراوێزێك بۆ ئەوانی تریش دەهێڵێتەوە تا هاوبەشی بکەن لەوێناکردنی ئەو واقعەدا لەڕووی یەکەو ڕووداوەکانەوە.

دووەم خەسڵەتیش کە ڕۆماننوس لەدادوەر جیادەکاتەوە بڕی ئەو خەیاڵکردنەیە کە لەو ئیشەدا هەیە کە پێشکەشی دەکاتو بەپێویستی دەزانێ بۆ ئەوەی کارەکەی ڕاستبێتەوەو ئەڵقەکانی پێکەوە گرێبدرێنەوە ڕۆماننوس چەندە لەواقیع وەردەگرێ هێشتا هەر بەشی ناکاو ئەو حاڵەتەی کە هەیە پێی ڕازی نابێ، ئەمە وایلێدەکات ئەو واقیعە بگۆڕێو شتی بخاتە سەر یان شتی لێلابدات تا ئەو شێوەیەی دەستکەوێ کە خۆی بەگونجاوی دەزانێو پێیوایە ئاماژەی زیاتر دەبەخشێت، تەنانەت گەر لەوێنە واقیعیەکەشی نەچوو لەڕووی بابەتە ئەسڵیەکەیەوە، هەروەها ڕۆماننوس مافی خۆیەتی لەمێژوو، ئەفسانەو خەیاڵ شت وەرگرێ، ئەوەی

بەپێویستی دەزانێ بۆ كارەكەی، ئەشتوانێ ئەو شتانە جارێكی دی بەگەڕخاتەوە بەشێوەیەك كە لەخزمەتی مەبەستو نیازێكدابنو پێی وابێت ئەمە باشترە وەك لەوەی كارەكتەرو حاڵەتەكان وەكو خۆیان لەڕاستیدا چۆن بوون وایان وێنا بكاتەوە.

هەروەها مافی خۆشێتی كە چەندین كارەكتەر لەیەك كارەكتەردا كۆبكاتەوە، یان كارەكتەرێك لەشوێنێكەوە بگوازێتەوە بۆ شوێنێكی گونجاوتر ئیتر ئەو گواستنەوەیە وەكو جوگرافیابێت یان لەزەمەنەكانی پێشووترەوەبێ، بۆیە ئەمە دەكات تا كارەكتەرێك یان حاڵەتێك چڕترو قووڵتر پێشكەشبكات، واتە، بەئاماژەتربێ.

هەر كارەكتەر یان حاڵەتێك رادەی واقعی بوونی خۆی یەكەم لە ڕێی قەناعەت پێكردنەوە دەستەبەردەكات ئینجا لەڕێی ئاماژەكانییەوە، ئیتر ئەو كارەكتەرە یان حاڵەتە بوونێكی راستەقینەی هەبێ یان نەیبێت، نموونەی ئەو كارەكتەرو حاڵەتانەی بوونێكی راستەقینەو بەرجەستەی باڵادەستیان پەیداكردووە (كە لەئەسڵیشدا نەبوون) لەژماردن نایەن، لەوانە (دۆن كیشۆت، هاملت، مەدام بۆڤاری) و چەندانی تریش كە بایەخ و ئامادەییەكی زۆریان هەیە جگە لە ئاماژەش، دووقاتی ئەوەی كە كەرەسە سەرەكییەكەی ئەم كارەكتەرانەی لێدروستكراوە هەیان بووە، هەر بەتەواوی وەكو هەر ماددەیەكی خاو، قوڕ، ئاسن، بەرد پێش ئەوەی ببێتە ئەو پەیكەرەی كە خەریكە بێتە زمانو شتێكی زیندوو لەیادەوەری هەر كەسێكدا دەمێنێتەوە كە دەیبینێ.

ئەم لایەنی تێكەڵكردنو دارشتنەوەیە تایبەتمەندیی رۆمانەو ژیاننامە ناتوانێ بیكات یان راستتر بڵێین ئەمە رۆمان لە ژیاننامە جیادەكاتەوە ئەمەش مانای ئەوەنییە كە یەكێكیان بەگرنگتر دەزانین لەوی تریان، هەروەها بەراوردیش ناكەین لەنێوانیاندا، ئەوەی مەبەستمانە سەرنجراكێشانە بۆ تەسكی ئەو پانتاییەی ژیاننامە پێیایدا دەڕواو ئەو خەتەرەی هەیەتی بۆ سەر رۆماننووس.

مافی هەموو مرۆڤێكە كە هەستیكرد شتێكی گرنگ هەیە دەیەوێ بیڵێ با بیڵێت، رەنگە ئەو وتنە شتێك بخاتە سەر شتێك بەڵام دەبێ رۆماننووس كاتێك پەنا بۆ ژیاننامەی خۆی دەبات زۆر بەئاگاییەوەو زۆر كەم ئەمە بكات چونكە گەر جارێك ئەمەی كردو سەركەوتووبوو مانای ئەوە نییە كە ئیتر رێگاكە لەبەردەمیا ئاوەڵایە، ئەو جۆرە سەركەوتنە وەكو یاری مارو پەیژە وایە چونكە هەندێ پەیژە بەرەو سەرەوە دەیبات، بەڵام هەندێكی تریان بەرەو خەرەندێ دەیبات.

## سەرچاوە

كتێبی (گەشتی تیشكێك)

دكتۆر عبدالرحمان منیف

# ژیانی من

هنری میللەر
لە فارسییەوە: فرزند شێركۆ

لەبیست و شەشی دیسەمبەری 1891، لەدایك و باوكێكی ئەمریكی، لە نیویۆرك سیتی لەدایك بووم. باپیرم بۆ قوتاربوون لە خزمەتی سەربازی هاتبووە ئەمریكا. باوو باپیرانم هەموو ئەڵمانیین و بنەماڵەی ئێمە بە گۆشە و كەناری دونیادا بڵاوبوونەتەوە. پیاوانی خێزانەكانمان زیاتر دەریاوان و شاعیر و مۆسیقار بوون. كاتێك چوومە خوێندنگا جگە لە زوبانی ئەڵمانی هیچم نەدەزانی. ژینگەی پەروەردە بوونم سەرباری ئەوەی دایك و باوكم زادەی ئەمریكا بوون، بە تەواوی ئەڵمانی بوو. پێنج تا دەساڵی، گرنگترین ساڵەكانی تەمەنی من بوو. لە كۆڵان و بازاڕدا دەژیام و بە پەروەردەیەكی گانگستەری كە ئەمریكیەكان پێی ئاشنان، پەروەردە بووم. لە بەشی چواردەهەمی برۆكلین خۆم گرت. ئەم گەڕەكە بۆ من زۆر ئازیزە. ئەو كاتانە كۆچكەران لێی نیشتەجێبوون. منالان خێڵ و رەچەڵەكی جیاوازیان هەبوو. جەنگی ئەمریكا ئیسپانیا كە لە حەوت ساڵی تەمەنمدا دەستی پێكرد، رووداوی گەورەی ڕۆژگاری منالیم بوو.

كەیفم بە سروشت و رەفتاری چەقاوە سووەكان دەهات، چونكە بێ قەید و بەند بوو و لەو تەمەنە كەمەدا، توندو تیژی و بێ یاسایی سروشتیی ئەمریكای پێ دەناساندم. دایك و باوكم دەستكورت و نەگریس و بێ زەوق و وشك بوون (باوكم لە تەمەنیدا تەنانەت یەك كتێبیشی نەخوێندبۆوە) بەڵام زۆر خزمەتیان دەكردم و تا ئەو كاتەی فامم كردەوە و خۆم گرت، ڕۆژگارێكی باش و خۆشم هەبوو. ئەهلی ماڵ و ژیان نەبووم" لە خەرجكردندا زیادەڕۆییم دەكرد" ڕێزم بۆ گەورەترەكان، یا یاساو و ڕێسا كۆمەڵایەتیەكان دانەدەنا. بە گشتی هەر لەو كاتەوەی زمانم پژا كەوتمە سەرپێچی كردن لە دایك و باوك و دەوروپشتەكانم. هێشتا چەند مانگێك لە چوونم بۆ (*city college*) سیتی كۆلێج تێپەڕی نەكردبوو كە وازم هێنا. لە برۆ و بەردەو گێلێتی دەرسەكان دڵم گیرا.

كارێكم لە ژمێریاری كۆمپانیای چیمەنتۆدا دۆزیەوە كە دەست بەجێ كشامەوە دوو ساڵ دواتر،

باوکم پارەیەکی دا کە لە زانکۆی (*cornell*) کۆرنێل خۆم ناونووس کەم. پارەکەم خستە گیرفانم و لەگەڵ مەعشووقەیەکدا کە لە تەمەنی دایکما بوو، دیارنەمام. دوای نزیکەی ساڵێک دەرکەوتمەوە و ئەمجارە زۆر گوێڕایەڵتر خۆرئاوای ئەمریکام گرتەبەر. لە زۆربەی شوێنەکان، بە تایبەتی لە ویلایەتەکانی باشوری خۆرئاوا، کارم کرد. هەموو کارێکم کرد، بەڵام زیاد لە هەمووی لە کێڵگەدا کارم دەکرد. لەسەر رێگە لە (*Juneau*) جونیو و ئالاسکا، ماوەیەك لە کانی ئاڵتوندا کارم کرد کە (تا)، بابمی دەرهێنا. گەڕامەوە نیویۆرك و کۆڵبەکۆڵ و ئاوارە بووم و ژیانێکی بێ چوارچێوەم گرتەبەر. دەستم لە هەموو کارێك وەردەدا بەڵام تەنها چەند رۆژێکم بەرگە دەگرت. وەرزشکارێکی باش بووم و پێنج ساڵی رەبەق هەموو رۆژێك یاری لەش جوانیم دەکرد – دەتگوت دەمەوێت لە یاریەکانی ئۆڵۆمپیدا بەشداری بکەم؟ سەبارەت بە بونیەی باشم سوپاسگوزاری سێ شتم: یەکێك ئەم رێژیمە "ئیسپارتی"یە، دوهەم هەژاریەکی بەردەوام کە لەگەڵیدا دەستەو دامێن بووم، سێهەم ئەم بێ خەیاڵی و گوێپێنەدانەی کە هەمە.

تا سی ساڵی بێ فیکر و وەك یاخیەك دەژیام. سەرم لە هەموو شتێ دەردەکرد. دەردەکەم ئەوە بوو کە زیاد لە سنوری خۆی خۆمانەو بێ ڕیا و دەست و دڵ کراوە بووم. لە مناڵێتیدا ناچاریان کردم فێری پیانۆ ببم. وەك ئەوەی توانایەکم لە خۆمدا نیشاندابێت: دوای بە جیدی تر پیانۆم وەرگرت و حەزم لێیبوو ببمە پیانۆژەن، بەڵام نەبووم بە تەواوی لە پیانۆ دابڕام، لەبەر ئەوەی دروشمم ئەمە بوو: یا هەموو یا هیچ.

بەهۆی رێکەوتی ڕۆژگاریشەوە ناچاربووم ماوەیەك لە دوکانی بەرگدرووی باوکمدا بگوزەرێنم" لەبەرئەوەی نەیدەتوانی دوکانەکە بەرێوە ببات، لە درومان هیچ فێرنەبووم بەڵام لەبری ئەوە دەستمدایە نووسین، وا دەزانم یەکەم بەرهەمم لە دوکانەکەی باوکمدا هێنابێتە بەر. وتارێکی دوورو درێژ سەبارەت بە دەجال (*Anti-Christ*)ی بەرهەمی نیچە. هەمیشە بۆ هاوڕێیانم نامەم دەنوسی، نامەگەلێکی چل تا پەنجا لاپەڕە. لە ئاسمان تا ڕێسمان هەم تەنز ئامێز بوون و هەم لە راستیدا رۆشنبیرانە. (ئێستاش نامەنوسینم لە شتەکانی دی پێخۆشترە). بە کورتی، بەبیرمدا نەدەهات رۆژێك ببمە نووسەر. لەوەهابیرێك دەترسام. کاتێك ئەمریکا چووە جەنگەوە چوومە واشینتۆن و لە وەزارەتی جەنگ بوومە کارمەند (نامەکانم رێکدەخست). لە کاتی بێکاری و دەست بەتاڵیدا راپۆرتم بۆ یەکێك لە رۆژنامەکانی واشینتۆن ئامادە دەکرد. کاتێك هاتمە سەر عەقڵی خۆم لەم گێژاوە دوور کەوتمەوە و دووبارە گەڕامەوە نیویۆرك و لەبری باوکم کە نەخۆش بوو دوکانەکەم دەبرد بەڕێوە. ئاشتیخوازێکی تەواو عەیار بووم. ئێستاش هەروام بە باوەڕی من، ئەمە قبوڵ دەکرێت کە کەسێك لە توورەییدا مرۆڤ بکوژێت، بەڵام ئەوە قبوڵ ناکرێت کە کەسێك لەوپەڕی ئارامی و لەبەر خاتری باوەڕ گەلێك ببێتە پیاوکوژ و هەموو یاساکان و دەسەڵاتەکانی جیهانیش پارێزگاری لێبکەن. لە ساڵانی جەنگدا ژنم هێناو بووم بە باوك. ئەگەر چی ئەو سەردەمە بواری کارکردن زیاد بوو بەڵام من بێ ئیش و بێ کار بووم. هەڵبەتە زۆرم کاری یەك دوو رۆژە هەبوو بەم شێوەیە:

حاجەت شتن، سەکنی ئۆتۆمۆبیل و شاگردی شۆفێری، رۆژنامە فرۆشی، نامەبەری، گۆڕکەنی، کتێب فرۆشتن، گارسۆنی کردنی بارەکان، عارەق فرۆشتن، فیتەری، ژینگەپارێز (کۆکردنەوەی خۆڵ)،

سەکرتێری، شۆفێری، ڕاهێنەری ژیمناستیك، شیرفرۆشتن، بیتاقە درینی، حەماڵی، یارمەتی کۆکەرەوە، تایپیستی، ژمێریاری و هتد.

گرنگترین دیدارێك کە لە ژیانمدا هەمبوو لەگەڵ (*Emma Goldman*) ئیما گۆڵدمان لە (*San Diego*) سان دیاگۆ لە کالیفۆرنیا بوو. ئەم ژنە دەروازەی فەرهەنگی ئەوروپایی بەڕودا کردمەوە و بزاوتێك و لایەنێکی نوێی بە ژیانمدا. کاتێك (یەکێتی کرێکارانی جیهان) لە ترۆپکی کردنەوەدا بوو، گەلێك شەیدای بووم و بە چ سەروەری و ڕێزێکەوە یادی کەسانی وەك (*jim Larkin*) جیم لارکین، ئێلیزابێت گێرلی، (*Flynn*) فلین، (*Giovanitti*) گیوڤانێتی و (*Carlo Tresca*) کارلۆ تریسکام دەکرد. ئەندامی هیچ یانە و ئەنجومەن و کۆمەڵەی سیاسی یا کۆمەڵایەتیەك نەبووم و وەك ئەوەی گەنجێتی دەخوازێت لە کلێسایەکەوە بۆ کلێسایەکی دیکە دەچوم. دواتریش بە شەوق و بزێویەکی تەواوەوە لە وتار خوێنیەکانی ئەنجومەنی بەهاییەکان (*Bahai center*) و (*Theosophists*). زیۆسۆفیستەکان و (*New Thoughtes*) و نوێ ئەندێشەکان و (*Seventh Day Adventists*) ئادۆنیستەکانی ڕۆژی حەوتەمدا ئامادە دەبووم: بە تەواوەتی تێکەڵاو و لەگەڵ چین و توێژە جیاوازەکاندا پێکدەهاتم. هاوبیری و هاوڕەنگی (*Quakers*)[1] کواکەرسەکان و (*Mormons*) مۆرمۆنەکان لە دڵم نیشت. بەبڕوای من باشترین ئەمریکاییەکان، ئەمانەن.

لەساڵی 1920 دا پاش ماوەیەك لە تەلەگراف چێتی و ئیشکردن بۆ (کۆمپانیای تەلەگراف خۆرئاوا) لەنیویۆرك سیتی ڕاکەراکەو هەواڵ گەیاندن, گەیشتمە پلەی سەرپەرشتی کردنی کارمەندەکان. ئەم ئیشەم پێنج ساڵی تەواو لەئەستۆگرت و ئەم سەردەمە بەپڕ دەستکەوتترین دەمەکانی ژیانمی دەزانم. هەموو ئیش و کارم لەگەڵ کەسانی بێ فەڕو چەقاوە سووەکانی نیویۆرکدا دەگوزەرا. لەم ماوەیەدا لەگەڵ سەد هەزار ژن و پیاوو منالی نالەباردا چەلەحانێم کرد. لەمۆڵەتێکی سێ هەفتەییدا ساڵی 1932 یەکەمین کتێبم نووسی کە باسی ژیانی 12 کارمەندی ماندونەناسی تەلەگرافخانەی دەکرد. کتێبێکی درێژدادڕو هەڵگری وشەی هەلەق و مەلەق بوو. بەڵام حەزی نووسینی لەمندا بەئاگاهێنا. بێ سێ و دوو وازم لەکارەکەم هێناو وتم دەبێت ببمە نووسەر. لەوە بەدواوە ئیتر بەدبەختی ڕاستەقینەم دەستی پێکرد. لەساڵی 1924 تا 1928 خەروارێك وتارو چیرۆکم نووسی بوو کە هیچ کەس چاپی نەدەکرد. لە کۆتاییدا لەسەر حسابی خۆم شتێکم چاپ کردو هەموویم بەهاوکاری ژنی دوهەمم دانە بەدانە لەم دەرگا بۆ ئەو دەرگاو لەم ڕێستۆرانت بۆ ئەو ڕێستۆرانت و لەم بار بۆ ئەو بار فرۆشت. لە ئەنجامدا کەوتمە سوال. ساڵی 1928 لەشوێنێکی چاوەڕوان نەکراوەوە پارەیەکم چنگ کەوت پێی چوومە ئەوروپاو نزیکەی ساڵێك مامەوەو سەرتاسەری کیشوەرەکەم بەسەرکردەوە. ساڵی 1929 م لەنیویۆرك بردەسەر. هەمدیسان لە هەموو لایەك دابڕاوو دەستم بە هیچ شوێنێکەوە گیر نەبوو.

سەرەتای ساڵی 1930 پارەو پولێکم پێکەوە نا کە پێی بگەڕێمەوە بۆ ئەوروپا. دەمویست یەکسەر بچمە ئیسپانیا, بەڵام لەپاریس دوورتر نەکەوتمەوەو لەوەو دوا هەر لەوێ مامەوە. جگە لەو کتێبەی کە سەبارەت بەڕاکەڕاکەی تەلەگرافخانە لەماوەی سێ هەفتەدا نووسیبووم, ئەو کاتەی لەئەمریکا بووم دوو کتێبی دیکەشم نووسی و کاتێك گەڕامەوە ئەوروپا ئەم دوو کتێبەو کتێبێکی

نیوە ناچڵم بەدەستەوە مابوو. کاتێك ئەم کتێبەی دووایـیم تـەواو بـوو, دام بەوەشـێنەرێکی (ناشـر) پاریسـی کـە یەکسـەر گـومی کـردو ڕۆژێـك زۆر بەخوێنساردییەوە لێی پرسیم: "بەراستی دڵنیایت لـەوەی کتێبەکـەت لای منـە؟". نوسـخەیەکی دیکـەم لەو کتێبە نەبوو. ماندوێتی سێ ساڵەم بەباچوو. پاش ساڵێك ژیـان لـەپاریس, نووسینی (مدار راس السـرطان)م (کـە هەنـدێ کـەس وا دەزانـن یەکـەمین کتێبی منە) دەست پێکرد. ئەگەیشتمە هەر شوێنێك هەرچـییەکم دەسـت بکەوتایـە هەنـدێکیم لەسـەر دەنووسی زیاتر لەپشتی دەستنووسەکانی پێشوو دەمنووسـی. هیـوای چـاپکرانی زۆر لاواز بـوو. هـەوڵێکی مـەرگ ئاسـابوو, کاتێـك بڵاوکـراوەی ئۆبلیسکی پاریس ئەم کتێبەی چاپ کرد, دەرگای خێرو بێرم بەڕوودا کرایەوە. بەچاپکرانی ئەم کتێبە دۆسـت و ئاشـناگەلێکی فـراوانم لەسەرانسـەری دونیادا پەیدا کرد.

ئێستاش سەروەت و سامانێکم نییە, ئێستاش لـەژیان بـەڕێکردن کۆڵـەوارم, بـەڵام لـە بەرامبـەردا چ هاوڕێ گەلێکی خۆشەویست و خێرخوام هەیە. لانی کەم ئیتر ترسی برسیەتی, کە لـەم دواییـەدا ببـووە دڵەراوکێیـەك, نییـە. ئێسـتا لەگـەڵ چـارەنووسمدا پێکهـاتووم و بـاوەڕم وایـە هـەر چـییەك دێتـەڕێم خۆشە. کەمترین ترسێکم لەئایندە نییە لەبەرئـەوەی دەزانم چۆن لە (کاتی ئێستا)دا بژیم.

بـەڵام سـەبارەت بـەوەی چ کەسـانێك و چ شـت گـەلێك کاریـان لـەمن کـردووە دەبێت بڵـێم زۆرتـرین کاریگەرێتی, خودی ژیان لەسەری داناوم, بەتایبەت ژیـانی کوچەو کۆڵان کە هـەرگیز لێی تێر نابم. من شـارییەکم بەتـەواوی بـەمانای وشـەکە. لەسروشـت بێـزارم, هـەروەها لەبـەر هـەمی کلاسـیك. نـەختێك قەرزاری فەرهەنگ و ئەنسـکلۆپیدیاکانم. کاتێك کە گەنجتر بووم, وەکو "بالزاك" هەڵپەی خوێندنەوەیان بـووم, تـا بیسـت و پێـنج سـاڵی جگـە لەبەرهـەمی نووسـەرە ڕوسـەکان, هـیچ نـۆڤڵێکم نەخوێنـدبۆوە. لەقوڵایی دڵەوە شەیدای مەزهەب, فەلسەفە, مێژوو, کۆمەڵناسـی, هونـەر, کەلـەپورو شـوێنەوار ناسـی, فەرهـەنگ و شارستانیە سەرەتاییەکان و ئەفسانەو لەم بابەتانە بووم, ساڵەو ساڵ تەماشای ڕۆژنامەم نەدەکرد. لەهەموو تەمەنمدا تەنانـەت یـەك چیرۆکی پۆلیسـیم نەخوێندۆتـەوە. لەبەرامبـەردا لـەجیهانی تـەنزو چـاکە خـوازی کـەمتر شـتێکی شـیاو هەیـە نەمخوێندبێتـەوەو (بەراسـتی تـەنزی دەگمـەن چـەند نایابـە!). حـەزم لەئەفسـانەی جنۆکـەو پـەری فۆلکلـۆری خۆرهەڵاتـە بەتایبـەت لەئەفسـانە ژاپۆنییـەکان کـە لێـوان لێـوە لەتوندوتیـژی و تەڵەکەبازیی. بەنووسەرانی وەك هێربرت سپێنسەر, (*faber*) فابەر, هاڤیلۆك ئـەلیس "بیرمەنـدو نوسـەری ئینگلیـزی". (*fraser*) فرازێـر, و تۆمـاس هێنـری هێکسـلی گـەورە دڵشـادم. دەبێـت سوپاسـی ئیماگۆڵـدمان بکـەم کـە بـووە هـۆی ئـەوەی هـەم بەرهەمگـەلێکی نمایشـی ئـەورووپی بخوێنمـەوەو هـەمیش شـانۆنامە نووسـە ئەورووپیـەکان زیـاترو باشـتر لـە شـانۆ نووسـە ئـەمریکی و بریتانیـەکان بناسـم. بەرهـەمی نووسـەرە ڕوسـەکانم زۆر پێشـتر لەنووسـینەکانی نووسـەرانی ئانگلۆساکسـۆن خوێنـدەوە, هـەروەها ئەڵمانیـەکانیش بـەر لەفەرەنسیەکان.

دستۆفسکی و نیچەو (*E lie faure*) ئێلی فـەور, زیـاد لەهـەموان کاریگـەرێتیان لەسـەر مـن جێهێشـتووە. (پرۆسـت)[2] و (شـپێنگلەر)[3] یـش کاریگەرێتیـەکی زۆر دروسـتکارانەیان لەسـەرم جێهێشـتووە. لەنووسـەران و شـاعیرانی ئـەمریکا, (*walt whi tman*) والـت ویتمـەن و ( *ralph woldo*

*emerson*) ئیمرسۆن زۆر کاریان تێکردووم. بلیمەتی (هێرمان مێلڤل)[4] م قبوڵە بەڵام بەبڕوای من وەڕس کەرە. بەتەواوی مانا رقم لە (هێنری جیمسە)[5]، لە (ئیدگار ئالن پو)[6]ش بێزارم. بەگشتی کەیفم بەئەدەبیاتی ئەمریکی نایەت. ئەدەبیاتی ئەمریکا زۆر واقیعگەرایانەو وشكو خۆ بەزلزانە، زۆرە ملێکارو فەرماندەرانەیەو بۆ خەڵکی ئاسایی نووسراون. بەبڕوای من تەنها چیرۆکە کورتە ئەمریکییەکان باشن. کەسانی وەك (شێروود ئاندرسۆن)[7] و (ویلیام سارۆیان)[8] کە خاڵی بەرامبەر یەکدین بەبڕوای من لەم بوارەدا ئەگەر لەنووسەرە ئەوروپییەکان لەپێشتر نەبن، هاوتاو هاوسەنگن.

بەڵام ئەدەبیاتی ئینگلیزی هەرگیز سەرنجم راناکێشێت، وەك خودی ئینگلیزەکان. جیهانەکانیان زۆر دوور دەست و نادیارو نەدۆزراوەن. بۆ من بەتەواوەتی بێگانەیە. زۆر شوکور گوزارم کە نزیکی و لێك گەیشتنێکم بەهەرحاڵ لەگەڵ ئەدەبیاتی فەرەنسیدا دەستەبەرکردووە کە لەگەڵ ئەو هەموو لاوازی و داخراویەیدا کە بەراورد کردن لەگەڵ ئەدەبیاتی ئەنگلۆساکسۆنی ئەمڕۆدا هەیەتی، دونیای بێ کۆتایی خەیاڵ و داهێنانە. هەروەها تا رادەیەکیش قەرزاری (دادائیستەکان) و (سووریالیستەکان)م. نووسەرانی نا فەرەنسی کە بەفەرەنسی دەنووسن لای من خۆشەویست ترن. بەبڕوای من فەرەنسا بۆ خۆرئاوا، لەئاستی (چین) دایە لەخۆرهەڵات ئەگەرچی هێندەی گەورەیی (چین) رەسەن نییە. فەرەنسا، لەجیهانی خۆرئاوا، باشترین شوێن بۆ ژیان و کارکردنە، بەڵام هێشتا زۆری ماوە تا ببێتە ژینگەیەکی تەندروست و دڵخۆش.

ئامانجی من لەنووسەرێتی، سەقامگیرکردنی واقیعییەتێکی گەورەترە. من نە (ریالیستم) و نە (ناتۆرالیست). من لەژیان دەنووسم. لەمەڕ ژیان نووسین تەنها بە بەکارهێنانی جیهانگەلی خەون و سیمبولەکانی دیکە دەست دەکەوێت، من نووسەرێکم بەقوڵی، میتافیزیکیم، ئەو سودەی کە لەرووداوو نمایش و لێچواندن دەبینم، بیانوویەکە بۆ هێنانەکایەی مەسەلە گەلێکی قوڵتر. من دژی (پرۆنۆگرافی)م و لەگەڵ قێزەون نووسی و ئەتك کردندام. زیاد لەهەموو شت لایەنگری خەیاڵپلاوی و ئازادی گەلێکم کە بیریشمان لێ نەکردۆتەوە. من وێرانکاری بەشێوەیەکی دروستکەرانە_ کەم و زۆر بەشێوازی ئەڵمانیەکان_ بەکاردێنم، بەڵام هەمیشە ئاگاداری هاوئاهەنگیەکی راستەقینەو ئاشتی و بێ دەنگی دەروونیم. مۆسیقا بە باڵاترین هونەر دەزانم، لەبەرئەوەی کامڵییەکی رەهایەو ئەویش لەوەوەیە کە بێ دەنگی دەناسێت. بە بۆچوونی من بۆ ئەوەی ئەدەبیات لەدڵەوە بگاتە دڵ (کە هێشتا نەگەیشتووە) دەبێ لەسیمبولەکان و خوازە فۆلکلۆری و ئەفسانەییەکان، زیاتر سوود وەربگیرێت. ئەو ئەدەبیاتەی کە هەمانە زیاتر لەناوەرۆکی وانە سواوەکانی کۆن دەچێت. هەموو رووداوەکان لە (پێدەشتی) عەقڵ و عەقڵانیەت دا دەگوزەرێت. لەسەدا نەوەدو نۆی نووسینەکانی ئەمڕۆ یا هەروەها بەرهەمە هونەرییەکانی دیکە دەبێ لەناو ببرێن. حەز دەکەم خوێنەرم کەمتر بێت. بەهیچ شێوەیەك کەیفم بەژیانی بەکۆمەڵی خەڵکیی نایەت، هەروەها بەئامانجی حکومەتەکانی ئێستای جیهان.

هیوادارم و باوەڕم وایە کە بەیتو باڵۆرەی شارستانیەتی ئەمڕۆ، تا سەد ساڵی دیکە نامێنێت،

باوەڕی من ئەمەیە کەمرۆڤ دەتوانێت ئاسان و ئاسوودە, بەبێ "شارستانیەتی" بژی.

هێنری میلەر

## پەراوێز

1-(*guakers*): پەیڕەوانی گروپێکی مەزهەبی کە لەسەدەی هەڤدەهەمدا بە رابەرایێتی جۆرج فۆکس لەبریتانیا پەیدا بوون.

2-(*macel proust*): چیرۆك نوسی فەرەنسی.

3-(*oswald spengler*): فەیلەسوف مێژووی ئەڵمانی.

4-(*herman melville*): نووسەری ئەمریکی.

5-(*henry james*): نووسەری ئەمریکی.

6-(*edgar allan poe*): شاعیرو نووسەری ئەمریکی.

7-(*sherwood anderson*): شاعیرو چیرۆك نووسی ئەمریکی.

8-(*william saroyan*): نووسەرو شانۆ نوسی ئەمریکی.

## سەرچاوە


کتاب شیطان در بهشت

هنری میلر

ترجمەی بهاء الدین خرمشاهی ص 7-15

زندگی من_چاپ سوم 1382

انتشارات

# چۆنیەتی خوێندن و ژیان لە ئەکادیمیای نسیبین

پیکو لوسکایا
لە فارسییەوە: وریا قانیع

لە سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاستدا قوتابخانە بەرزەکانی خۆرهەلاتی نزیک تەنها بە ناوەندێکی خوێندن نەدەژمێردران. بەڵکو ڕۆڵێکی گرنگ و فراوانی فەرهەنگییان لە ئەستۆدا بوو. قوتابخانە گەورەکانی خۆرهەلاتی ناوەڕاست، لە ژیانی عەقڵی و مەعنەوی کۆمەڵگادا ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو، قوتابییەکانیش بەپێی ڕەسم و یاسا و بڕیارەکانی قوتابخانە، لەم قوتابخانەیەدا سەرگەرمی خوێندن بوون. شێوەی ئەم جۆرە قوتابخانانە، لە قوتابخانە فەلسەفییەکانی ڕۆژگاری دێرینیشدا هەبووە. یەکێك لە دیاردە باوەکان لە نوسینگە و قوتابخانەکانی بێزانسدا ئەوە بوو کە لە ڕیزی شارە بەناوبانگەکانی ئەسکەندەریە و ئەنتاکییە و ئەدس (ئەدسا) دەژمێردرا. لە قوتابخانە سوریانییەکانیشدا کە لە خاکی ئێراندا دامەزرابوون لە بارودۆخدا وەکو یەکبوون. بەلآم وەکو لە سەرچاوەکانەوە دەردەکەوێت، دابونەریتی قوتابخانەکانی بێزانسی وردە وردە لە ئێراندا باویان پەیداکرد. زۆربوون و فراوانبوونی شارەکانی ئێران، زەمینەیەکی لە باری بۆ گەشەسەندنی قوتابخانەکان سازاند. پێشکەوتنی ئابووری کە لە ئەنجامی بەهێزبوونی بارودۆخی شارەکانەوە بوو، بووە هۆی ئەوە کە دەوڵەتی ئێران، سورياییەکانیش کە هەرچەندە مەسیحیبوون لە ئامێزبگرێت و پشتیوانییان لێبکات.

لەگەڵ بوونی ناکۆکی و توڕەیی موبدە زەردەشتییەکانیشدا، سوریاییەکان توانییان قوتابخانەکانی خۆیان دامەزرێنن. ئەم قوتابخانانە نەك بە تەنها لە ژیانی سوریاییەکاندا بەڵکو لە ناو بەشێکی دانیشتوانی ئێراندا کە لە خاکی ئێراندا بوون ڕۆڵێکی گرنگیان دەبینی.

ئــەو سەرچـــاوانەی کـــە لـــە بەردەســـتدان ڕوخســـارێکی ڕوون و ئاشـکرای ئـەم قوتابخانانـەو بـــارودۆخی ژیـــانی پـــەروەردە و فێرکـــردن لـــەو قوتابخانانـە، نیشـان دەدەن. (بەرنامـەو پرۆگـرام و پـــەیڕەوی قوتابخانـــەی نســـیبین — ئەساســـنامەی مەدرەسـەی نصـیبین). لـەم زەمینـەدا گـەلێك بابـەتی سەرنج ڕاکێش و بەنرخی تێدایە. بەرنامەی ناوبراو گرنگییـــەکی تایبـــەتی هـــەبوو. نـــەك بەتـــەنها بـــۆ قوتابییەکان، بەڵکو مامۆستا و ئوستادو بەڕێوەبەر و ڕابـەرانی قوتابخانـەیش لـە سـەریانبوو پـەیڕەوی بکەن و ئەنجامیبدەن.

دەقـی (پرۆگـرام و پـەیڕەو و بەرنامـە) کـە بـە وردبینییەکی فراوانەوە لە ئەکادیمییەکەدا پارێزراو بوو. لـە دانیشـتنە گشـتییەکانی ساڵانی قوتابخانـە، بـە ئامـادەبوونی هـەموان دەخوێندرایـەوە. لـەوە دەچـێت کـە خوێندنـەوەی بەرنامـە و پـەیڕەو لـە دانیشـــتنە گشـــتییەکاندا لـــە ســـەرەتای ســـاڵی خوێندندا ئەنجامدرابێت.

وا دێتـە بەرچـاو کـە لـە یـەکێك لـە دانیشـتنە گشتیەکانی ساڵانەدا دەقی گوزارشـی (برحدبیشابا — عربایـا)یش خوێندرابێتـەوە، ئـەم دەقـە تـاکو ئـەم سـەردەمەش ماوەتـەوە. ئـەمجۆرە گوزارشـانە بـە تایبـەتی لـە سـەرەتای سـاڵی خوێندنـەوە لەلایـەن مامۆســتاکانەوە یـــان لـــە لایـــەن بەڕێوەبـــەرەوە دەخوێندرایەوە.

داهێنان و نوسینەوەی ئەم بەرنامەیە دەدرێتـە پـــاڵ (بەرســـۆما)، قوتابیـــان و مامۆســـتایانی (قوتابخانـەکانی ئێرانـی). لـە شـاری ئـەدس کـە لـە ساڵی 489ی زایینی داخرابوو بانگکران بۆ نسیبین، نـــەك بـــە تـــەنها ســـوریاییەکان و ئێرانییـــانی دانیشـــتوانی شـــارو دەوروپشـــتی بـــەڵکو دانیشـــتوانی ناوچـــە دوورە دەســـتەکانیش بـــۆ خوێنـــدن دەهـــاتن بـــۆ نســـیبین. چـــونکە نسـیبین شـارێکی گـەورە بـوو. لەگـەڵ ئەوەشـدا لـە ناوچـەیەکی سـەر سـنوردا بـوو. خـەڵکێکی زۆر لـە هەموو لایەکەوە ڕوویان تێدەکرد، سەرچاوەکان لە بـارەی زۆربـوونی قوتابخانـەکان و نوسـینگەکانی سوریانی لە ئێراندا دواون. برحدبیشا باعربایا، لە کۆتـایی گوزارشـەکەیدا لـە گوازتنـەوەی مامۆسـتا (نەرەسـە) بـۆ قوتابخانەکـەی خـۆی دواوە. ئـەوەی ڕاگەیاندووە کە شاری ئەدس بەرەو لاوازی دەڕوات بـەڵام نسـیبین ڕێگـای گەشەسـەندن و پێشـکەوتنی گرتووەتەبەر..

بەرسـۆما نـەك بـە تـەنها (فـەرمانی بـەوەدا کـە هـەموو کـارە بەسـوودەکان بـۆ قوتابخانـە ئامـادە و تـەرخانبکرێت)، بـەڵکو داوای ڕێکـوپێکی یاساشـی دەکـــرد. فەرمانـــەکانی نـــاو بـــراو لـــە پێشـــەکی بەرنامەکـــەدا نووســـرابوو (حەنانـــەی ئەدیابنـــە = هـــەولێری) پێنجـەمین بەڕێوەبـەری قوتابخانەکـەی نسـیبین بـوو. چـەند فـەرمانێکی نـوێی خسـتە سـەر پێشەکی دووهەمی بەرنامەکە.

بەپێی ئەم سەرچاوەی دواییـە، ئـەتوانین بـەم شـێوەیە بـۆ ئـەوە بچـین، کـە خـولی خوێنـدن لـەم قوتابخانەیـەدا تـەنها سـێ ساڵ بووە. هـەر ساڵێکی خوێندن بە دوو نیوەساڵ دابەش دەبوو، لە نێوانی هەردوو نێوە ساڵە کە دا قووتابخانە پشووی هەبوو، قوتابییەکان لە ڕۆژانی پشوودا مۆڵەتی کار کردنیان هەبوو تاکو داهاتێك بە دەستبهێنن. (وا بڕیاربوو کە خوێندن لە دوو خولی هاوینـە و زسـتاندا بێت، ئـەم کـارەش بـە ڕێکـەوت نـەبوو چـونکە مـرۆڤ خـاوەنی

لەشولار و ڕەوانە، لەش و ڕەوانیش لە یەکتر جیا نین. لەمڕووەوە باوکانی پیرۆ ڕایانگەیاند، بە هەمان شێوە کە خۆراکی ڕەوان پێویستە، دەبێت هەل بۆ قوتابیانیش بڕەخسێت تاکو بۆ خۆراکی لەشیان کار و کۆشش بکەن).

ئاشکرایە کە قوتابییان مافی ئەوەیا نەبوو هەموو جۆرە کارێك بکەن. بۆ نموونە سووخۆری قەدەغە بوو. بەلاّم قوتابی دەیتوانی دراوی دەسمایەی خۆی بۆ بازرگانی و ئاڵو وێڵ بخاتە کار. بەلاّم مافی ئەوەی نەبوو کە لەسەدا یەك زیاتر قازانج وەربگرێت. قوتابی مافی ئەوەی نەبوو کاری بازرگانی بکاتە پیشەی هەمیشەیی خۆی. لە پارێزگاکانی دیکە جگە لە نسیبین مافی کاری کڕین و فرۆشتنیان هەبوو. قوتابیان لە پشوی سالاّنە لە مانگی ئابدا تا مانگی ئۆکتۆبەر مافی کاری بازرگانییان هەبوو. لەم ماوەیەدا مۆڵەت بە قوتابییان دەدرا کە پیشەی دیکەش هەڵبژێرن، بە مەرجێك کە ئەو ئیشانە نەبنە هۆی شەرمەزاری. بە هۆی ئەو پەیوەندییە تایبەتییەی کە لە نێوان شار و قوتابخانەکەدا هەبوو. قوتابیان مۆڵەتی بازرگانییان هەبوو. یان پیشەیەکی دیکە بۆ خۆیان هەڵبژێرن. دەبێت ئەوەش بڵێین کە قوتابخانە لە ناو شاردا سەربەخۆییەکی تایبەتی هەبوو.

کشتیاری لە ڕیزی ئەو کارانەدا بوو، کە بە تەواوی مۆڵەتی پێدرابوو. چونکە لەگەڵ بارودۆخی ژیان و هەلومەرجی ئەو ڕۆژگارەدا سازگار بوو. زیاد لەوەش بڕیار درابوو لە کاتی بێکاریدا قوتابیان لە کێڵگەو باخەکاندا کاربکەن. (بۆ قوتابیان لە هەردوو خولی پشوودا دوو جۆرکاریان بۆ دیاری کرابوو. لە پێش هاویندا، درەوکردن، لە پێش دەستکردن بە خولی هاوینە چنینی هەنجیر و زەیتون. دوای ئەوەش دانیشتنی زستانی). بەم شێوەیە کۆمەڵێك قوتابی بێئەوەی کە باخ و کێڵگەکانی خۆیان بە جێبهێڵن، سەرگەرمی خوێندنیش بوون. چونکە لە ئێراندا کشتیاری بە گەورەترین کاروپایە و بناغەی ژیان دەژمێردرا.

لە ناو قوتابییەکاندا قوتابی هەژار و بێدار هەبوو. ئەمانەش ئەو کارانەیان دەکرد کە قوتابیانی هەموو ناوچەکان بە درێژایی ڕۆژگارە جۆراوجۆرەکان ئەنجامیان دەدا. کە ئەویش (وانە) وتنەوەبوو. لە قوتابخانەی نسیبین، مۆڵەت بە قوتابیان درابوو کەوانە بڵێنەوە، ئەویش بەو مەرجە بوو کە نابێت لە سێ قوتابی زیاتریان هەبێت. مۆڵەتی کردنەوەی پۆل و قوتابی زۆریان پێنەدرابوو. ڕابەرایەتی کاروباری خوێندن و چالاکی زانستی لە ئەستۆی ئەو کەسەنەدا بوو کە بەپێی ڕەسم و یاسا بە وتنەوەی وانە و بەرپرسییەتی وەکو مەسەلەکانی ڕێکخستنەوە و خەریك بوون. ئەو وانانەش کە گەلێك گرنگبوون لە قوتابخانەی ئایینی نسیبیندا هەر وەکو قوتابخانە ئاینییەکانی دیکە، لەگەڵ لێکدانەوە و شیکردنەوەدا ئەنجام دەدران. سورییاییەکان لە لێکدانەوە و شیکردنەوەی کەشیشە یۆنانییەکان بە باشی ئاگاداربوون. بەرهەمەکانی (یفرمی سوریایی) گەلێك بەرەوی هەبوو. لەم میانەدا بەرهەمەکانی (تیۆدور موپسواست *Theodor Mopsuest*) لەوانەش (تفسیری کائنات = لێکدانەوەی بوونەوەر)ی ئەو لە زمانی یۆنانی بۆ زمانی سوریانی وەرگێڕدرا بوو. ئەم کەسایەتیە بە بەرجەستەترین کەسایەتی ئایینی نەستۆری دەژمێردرا. لەم بوارەدا چەندین چیرۆك و

شیکردنەوەی تایبەتی خۆی هەبوو. ئەم چیرۆك و لێکدانەوەیە، لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە دەم بەدەم و (سینە بە سینە، و.ف) دەگوێزرایەوە. هەروەکو ئەوە کە لە سەرچاوەیەکدا هاتووە. (لە دەمەوە بۆ گوێ دەگوێزرایەوە). کە تاکو ئێستاش ماونەتەوە.

مپاشکانا = *Mepashkana*ی توێژەر بەپێی ڕەسم و یاسا و پایەی سەرۆکایەتی قوتابخانەی ئاینی لە ئەستۆدا بوو. ماکریانا *Makreyana* (قاری = خوێنەر). جۆرە خوێندنەوەیەکی تایبەتی بە زیرو بەمی دیاریکراو بە ئاگاداربوون لە پێویستی دەنگەکانی بە ڕەچاوکردنی هەموو هێماکان و ڕاوەستانەکانی بە قوتابیان دەوتەوە، سەفەرە. *Safra* شێوەی نووسین و خۆشنووسی بە قوتابییەکان دەوتەوە. لە قوتابخانەی بەرزی نسیبین هەروەکو هەموو زانکۆکانی سەدەکانی ناوەڕاست فەلسەفە و ڕەوانشناسی پلە و پایەیەکی تایبەتییان هەبوو. وەکو زانراوە گەلێك لە بەرهەمەکانی ئەرستۆ، لەگەڵ کتێبی ئیساغۆجی *Eisagoge* لە نووسینی پرقیریۆس *Porphyrios* (فرفوریۆس). خشتەی دابەشکردنی ناوەرۆکەکان و گەلێکی دیکەی بە زمانی سوریانیان هەبوو. لە چوارچێوەی بەرهەمی دانەرانی سوریای لە زەمینەی فەلسەفە و سروشتناسییان هەبوو.

بادۆکا *Badouka* مامۆستای ئوسوڵی فەلسەفە بوو. لە وتنەوەی ئوسوڵی ناو براودا (مەنتیق) پلە و پایەیەکی بڵندی هەبوو، هونەری مەعانی و بەیان، شێوەی وتار خوێندنەوە، گرنگییەکی تەواوی هەبوو. مهاگیانا *Mehagiana* ئەم رشتەیەی دەوتەوە.

لە ئەرکی وانە وتنەوەدا پەیوەندییان بە بەڕێوەبەری قوتابخانەکەوە هەبوو. وەکو باو بوو لە ناویانا بە (مامۆستای ئێمە) ڕەبان *Rabban* بانگییان دەکرد. ئوستادەکان لە کاتی نەخۆشیدا ئەیانتوانی بە تەنها بە مۆڵەتی بەڕێوەبەر لە پۆلی وانە وتنەوەدا ئامادە نەبن. بەڕێوەبەر ئەو دەستەڵاتەی هەبوو کە لە کاتی ئامادەنەبوونی مامۆستاکانا، لە پۆلەکانی وانە وتنەوەدا لۆمەی مامۆستاکان بکات و سزایان بەسەردا بسەپێنێت. بەڵام هیچ کەسێك لە دانیشتنە گشتییەکاندا یان لە بەردەم قوتابییەکاندا مافی لۆمەکردنی مامۆستاکانیان نەبوو. هەر کاتێك مامۆستای خوێندنەوە و (مەعانی و بەیان) بە بێ بەهانە و بیانوو، یان بە بێ داوای مۆڵەتی بەڕێوەبەر، لە پۆلی وانە وتنەوەدا ئامادە نەبوایە، لۆمەی دەکراو دەدرایە بەر توانج. (لە وەرگرتنی مووچەش بێبەشدەکرا). مامۆستاکان دەیانتوانی ئامادەی دانیشتنەکان و (بیستنی تیرو توانجەکان نەبن کە لە کۆڕی هەمە لایەنەدا ئاراستەی مامۆستایان دەکرا).

نزیکترین یارمەتیدەری بەڕێوەبەر، بەرپرسایەتی کاروباری ئابووری و دارایی لە ئەستۆدا بوو، بە (گەورەی یانە) دەژمێردرا. زاراوەی سریانی *Rabbaita* لە دوو بەش پێکهاتووە، ڕەب *Rab* بە مانای گەورە، وشەی (بیت *Baita* بە مانای یانە = ماڵ، هاتووە. ئەمەش ڕاست و ڕەوان بەرامبەرە بەم وشە لاتینییە *Majordome* هەموو کەلوپەل و کەرەسەکانی قوتابخانەکە، کە کەمنەبوون لە ژێر دەستی ئەودا بوون. هەروەکو پەرستگاکان و زەویوزار و دراو و دیارییەکانی دیکە لە ژێر دەستی قوتابخانەدا بوون. لە ئەنجامدا

قوتابخانــە توانــای کــڕینی مــوڵکی هــەبوو، ئــەم کەلوپەلانــە بــە بەشــێك لــە مــوڵکی قوتابخانــە دەژمێردران. لە سەرچاوەیەکەوە وادەر دەکەوێت کە یـەکێك لـە بەرپرسـانی کاروبـاری ئابووری و دارایـی قوتابخانە، بە دراوی قوتابخانە (خـانێکی کـڕی). بـە نوێکردنـەوەی ژوورەکـان و نۆژەنکردنـەوەیان تـوانرا هەندێ لەو ژورانە لەسەر شێوەی بەشی ناوخۆیی ڕێکبخرێن و قوتابیانیـان تێدا نیشتەجێ بکرێ. لـە شــوێنێکی دیکــەدا هــاتووە. بەرپرســی کاروبــاری ئـابوری و دارایـی قوتابخانـە، گـەرماوێکی گشـتی دروسـتکرد، کـە داهاتەکـەی بـۆ قوتابخانـە بـوو. بـە ڕێوەبـەری کاروبـاری دارایـی نـەك بـە تـەنها هــەر ئــەمجۆرە کارانــەی دەکــرد. بــەڵکو دامەزرانــدنی نامەخانەشی لە ئەستۆدابوو. تاکو قوتابیان سوودی لێــوەرگرن. کەســێك بەناونیشــانی میوانــدار *Xenodarqve* یارمەتیــدەر و هاوکــاری بەرپرســی کاروبــاری ئــابوری و دارایــی بــوو. بەرپرســایەتی کاروبــاری نەخۆشەکانیشــی لــە ئەســتۆدا بــوو. دەرمـان و خـۆراکی نەخۆشـەکان ئـەرکی سەرشـانی ئـەو کەسـایەتییە بـوو. بـەر پـرس یـان بەڕێوەبـەری کاروبــاری ئــابووری و دارایــی، چــاودێریکردنی ڕەفتاری قوتابیان و قوتابخانەی ئاینی و پاراستنی ڕەسم و یاسای قوتابخانەی لە ئەستۆدا بوو.

بەرپرســی ئــەم پلــە و پایەیــە لــە ڕێگــەی هەڵبژاردنـەوە لـە قوتابخانەکـەدا هەڵدەبـژێردرا، لـە بارەی دەستنیشانکراوان بۆ ئەم پلەوپایە وتوویژی لەســەر دەکــرا. ڕەزامەنــدی بەڕێوەبــەری گشــتی قوتابخانەکە بۆ دەستنیشانکردنی ئەم پلەو پایەیە، پێویسـتبوو هەڵبـژاردنی لـە کـاتێکی دیـاریکراوی سـاڵدا بـە پێـی ئـەو ڕەسـم و یاسـایە کـەباو بـووە. بەپێی ڕاسپاردەی بەڕێوەبەر و مامۆستای توێژەر و ئەنــدامانی دەســتەی زانیــاری قوتابخانــە.. هەڵدەبـژێردرا. ئەمانــە بــە چــەند کەســایەتییەکی ڕاســت و دڵســۆز بــۆ بــەڕێوەبردنی دانیشــتنەکانی قوتابخانە دەژمێردران.

توێــژەر، مامۆســتای لێکۆڵینــەوە لــە دوای بەڕێوەبـەر، گـرنگترین کەسـایەتی نـاو مامۆسـتاکان بوو. گەلێك جار مامۆستای لێکۆڵینەوە پلە و پایـەی بەڕێوەبەری وەردەگرت. لە میانەی وانە وتنەوەشدا قوتابخانەکــەی بــەڕێوەدەبرد. ئاشــکرایە کــە ڕەزامەنــدی بــۆ ئــەمکارە پێویســتی بــە دەستنیشــانکردن و وەرگــرتنی ڕای بەرپرســی کاروبـاری ئـابووری و دارایـی قوتابخانەکـە هـەبوو ڕاپەڕانــدنی هەڵبــژاردن بــە جــۆش و خرۆشــێکی فراوانــەوە ئەنجامــدەدرا. چــونکە لــە بەرنامــەی قوتابخانەکەدا بڕگەیەك هـەبوو کـە سەرپێچیکردنی تاکەکانی قەدەغە دەکرد. بڕگـەی نـاوبراو بەمجۆرە بوو: (هیچ کەسێك مافی سەرپێچی و دەستەبەندی و تووڕەیی و دەربـڕینی نـەفرەت سـەبارەت بـە کارێـك، کـە ڕاســت و شـەرافەتمەندانە ئەنجامـدراوە نییـە، هەرکاتێك هەر کەسێك دەستی بەمجۆرە کارانە کرد. لە دژی ڕاسـتی جولاَیـەوە و تـووڕەیی بەکاربێنێت و ناڕازیبێـت، شایسـتەی سـزادانە. کەسـایەتییەکی ئاوەهــا لــە خوێنــدنگادا، دەردەکرێــت. مــافی دانیشتنیشـی لـەناو شـاردا نابێـت. وەکـو زانـراوە سـزایەکی ئاوەهـا کـارێکی گرانبـوو. بـە دەرکـردن کۆتایی دەهات.

لەو بابەتانەوە کە نووسراون دەردەکەوێت، کـە پلە و پایـەی بەرپرسی کاروبـاری ئـابووری و دارایـی تـا چ ئەندازەیـەك گرنگبـووە. تـا چ ئەندازەیـەکیش

کارا بووە. هەموو لە هەڵبژاردنی بەرپرسی کاروباری دارایی و ئابووری بەشدار دەبوون. لەمڕووەوە دەستەبەندی ڕووی دەدا و چەندین کاری ناشرینی ڕوویان دەدا. تەنانەت دەبوونە هۆی لەکەدارکردنی هەڵبژاردنەکان. هەر کاتێك هەڵبژاردن، بە دروستی ئەنجام بدرابا دروستبوونی ئاڵۆزی و ناکۆکی بە قەدەغە دەکرا. وا دەردەکەوێت کە لە هەڵبژاردنەکانی قوتابخانە چەند نمونەیەکی ناکۆکی هەبووە. لە کاتێکدا کە بە شێوەیەکی نا دروست هەڵبژاردن ئەنجامدرابا. ڕەخنەگرتن ڕەوا بوو. قوتابییەکان و کارمەندانی زانکۆکە لە ناوچە جۆر بەجۆرەکانەوە هاتبوون و لەوێدا کۆبووبوونەوە. بە ڕەسمی لە زانکۆ وەرگیرابوون پێویستبوو لەسەریان کە بەپێی بڕیارەکانی زانکۆ بجوڵێنەوە. هەموویان لە کاتی وەرگرتنیاندا دەچوونە لای بەرپرسانی زانکۆ و برادەران *Kenusia* تاکو لە بەرنامەی دانیشتنەکەیان و لە ڕێکخراوی قوتابخانەش ناویان بنوسرێت. تا بناسرێن. زانکۆی نسیبین گەلێك شێوەی لە قوتابخانە ئاینییەکانی دیکە دەچوو کە لە ماوەی دەیان سەدەدا لە وڵاتانی پەیڕەوی ئایینی مەسیحیدا ڕۆڵێکی گەلێك گرنگییان دەگێڕا، بەرنامەی خوێندن و وانە وتنەوەی ئەم خوێندنگایە، یان زانکۆکانی سەدەی ناوەڕاست لێکچونێکی زۆریان لە نێواندا هەبوو. بە تایبەتی ئەوەی کە فەلسەفە (بە خزمەتگوزاری خواناسی) دەژمێردرا.

قوتابییە نوێکان دەبوایە خۆیان بە ئەندامی ئەم ڕێکخراوە بزانن. (برادەران) کە بۆ یەکەم جار دەهاتنە ناو ئەم کۆمەڵەوە، تا ئەو کاتە کە بەرپرسی دارایی و برادەرانی دیکە ڕەزامەندی خۆیان ڕانەگەیاندایە و تا ئەو کاتەش کە ڕێوڕەسمی درێژەدان بە ژیان لەم قوتابخانەدا فێرنەبوونایە بە ناوی ئەندامەوە وەرنەدەگیران. لە دوای ئەوە قوتابییە نوێکان لەلای قوتابییەکانی دیکەوە جێگەیان پێدەدرا. لەناو قوتابییەکاندا یەکێکیان پلەیەکی بەرزی هەبوو. ئەویش چاودێریکردنی هەڵسوکەوتی قوتابیان و بەرپرسی کاروباری ئەو قوتابیانەبوو کە سەر بەو بوون. چاودێریکردنی قوتابیان لەم ڕێگایەوە ئەنجام دەدرا. لەم ڕووەوە کاربەدەستانی زانکۆ ڕێکەوتبوون کە شوێنی بەشی ناوخۆیی سەربەخۆ بۆ قوتابیان لە دەرەوەی شاردا بێت. ئەو قوتابیانە کە وەرگیرابوون لەناو سنوری زانکۆدا ئازاد بوون. بەڵام مافی نیشتەجێبونیان لەلای دانیشتوانی شارا پێنەدرابوو. هەر کامێکیان لەلای دانیشتوانی شار جێیان هەبایە لە وەرگرتنیان لە قوتابخانە بێبەشدەکران.

ناچارکردنی قوتابیان بە ژیانی ناو سنوری قوتابخانە نیشانەیەك و هەوڵێکبوو بۆ دروستکردنی یەکێتی و پاراستنی ڕێکخراوەیی و پێکەوە گونجان. قوتابییەکان پێکەوە بە هاوبەشی دەژیان. لەسەر مێزی نانخواردن پێکەوە دادەنیشتن. هەر کاتێك یەکێك لە قوتابییەکان نەخۆشکەوتایە ئەوانی دیکەیان لەسەریانبوو چاودێری لێبکەن، بە وتەیەکی دیکە ئەو کەسانە کە لەگەڵ قوتابییە نەخۆشەکەدا لەیەك شوێندا پێکەوە دەژیان. ئەرکی چاودێریکردنی نەخۆشەکەیان لە ئەستۆدا بوو. ئەمەش هۆی لەیەك نزیکبوونەوە و بەڵێن و پەیوەندی نێوانیانبوو. هەندێك لە قوتابییەکان کە لە ژیانی هاوبەشی شادمانبوون، هەوڵیاندەدا تاکو بە جیا و ئازادانەتر بژین. ئەوانە بۆ گەیشتن بەم

ئامانجەیان چەندین بڕوبیانوویان دەهێنایەوە. ئەوانە بۆ گەیشتن بەم ئامانجەیان چەندین بڕوبیانوویان دەهێنایەوە. ئەوانەیان کە لەگەڵ برادەراندا دەژیان مۆڵەتی ئەوەیان نەبوو تەرکی شوێنەکەی خۆیان بکەن و بەجێی بهێڵن. بۆ خۆی لە شوێنێکی دیکەی شارا، یان لە دەرەوەی شار شوێنێك بۆ دانیشتنی خۆی بەدەست بهێنێت. لەسەری پێویست بوو کە لە شوێنەکەی خۆیا درێژە بە ژیان و خوێندن بدات. بۆ ئەم کارەش قوتابخانە چەندین شوێنی ناوخۆیی هەبوو، هەموو قوتابییەکان لەسەریانبوو کە لەناو بەشە ناوخۆییە گشتییەکاندا بنون.

هەموو قوتابییەکان لەسەریانبوو کە لە جلوبەرگدا لە یەکتربچن. وا دەکەوێتە بەرچاو کە جلوبەرگێکی سادەی تایبەتییان هەبوو بێت. دەبایە قژی سەریان بتاشن و کورتیبکەنەوە، بەم شێوەیە قوتابییان دەبا بە (ویقار) و هێمنییەك، کەشایستەی پلەوپایەی قوتابییان بێت بە ڕێدا بڕۆن. لەبەرنامەکەدا نوسرابوو کە قوتابی لە میانەی درێژەدان بە خوێندنیان دەبێت ئاگاداری بارودۆخی جلوبەرگی خۆی بێت، قوتابی نەدەبا ڕیشیان لە بنا بتاشن قژە سەریشیان وەکو کەسانی ئاسایی درێژ بکەن. دەبایە ئارایشت و پۆشاکی گەلێك سادە کە مایەی شەرمەزاری نەبێت لە ناو سنووری قوتابخانە و سەرشەقامەکانی شاردا بەڕێدا بڕۆن. تاکو بینەران بە بینینی ئەم نیشانانە (جل و بەرگ و ئارایشت). قوتابییان بە یەکێك لە غەیری خۆیان بزانن. واتە بە دەرەکییان بزانن.

قوتابی لە کاتی چونە ناو قوتابخانەوە پەیمانیدەدا کە لەسەر خۆ و شکۆمەند بێت. لەمڕووەوە پێیان ڕاگەیەنرابوو. کە لەگەڵ ژناندا بە تایبەتی مەلاژنەکاندا گفتوگۆ نەکەن و پێکەوە دانەنیشن. هەرکاتێك قوتابییەك دەستی بە گاڵتە جاڕی و بەدگۆیی بکردایە، لە قوتابخانە دەردەکرا. شاربەدەریش دەکرا. (کۆمەڵگا) یان بە وتەیەکی دیکە ڕێکخراوی قوتابخانە ئەندامەکانی خۆی بەشێوەیەکی تایبەتی کە (دروست) یان پێدەوت ناچار دەکرد.

بەرنامە بەناونیشانی بەڵگەی ڕەفتار، پەردەی لەسەر ڕەفتاری خراپەی قوتابی لادا بوو. بڕگەی هەشتەمی پڕۆگرام و پەیڕەو سەبارەت بە تەمەڵی کردن بوو، کە بە سەرچاوەی هەموو کارە ناشرینەکان ناونرابوو، داوا لە هەموان کرابوو کە بە بەردەوامییەکی تەواو تەمەڵی لە خۆیان دوور بخەنەوە، خەبات دژی سستی و نابووتی بکەن. (ئەوانەی کە ناونیشانی قوتابییان هەبوو، مافی ئەوەیان نەبوو کە نووسین و خوێندن و لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی بە کۆمەڵ بنێنە لاوە، مەگەر لە کاتێکدا کە فەرمانێکی بە پەلە و بێ ڕاوەستان لە ئارادا بێت). هەندێك بە بیانووی جۆراوجۆر، وەکو یارمەتیدانی کاری خێری هاوڕێکانی و چەند شتێکی دیکەی لەمجۆرە خۆیان دەدزیەوە و ڕێگای سستی و تەمەڵییان دەگرتە بەر. لە پڕۆگرامەکەدا ئەم شێوە فریوکاریانە و فێڵ و تەڵەکەیە ئاشکرا و قەدەغە بوو بە تاوان دەژمێردرا. (تەنانەت لە کاتی دەستکردن بە کاری خێریش هیچ کەسێك مافی ئەوەی نەبوو واز لە وانەکانی بێنێت و بڕوات بۆ ناو شار). هەندێکجار لەناو قوتابییانی قوتابخانەکەدا

کەسانی نەخۆش و لاواز هەبوون، کاربەدەستانی زانکۆ لەم کاتانەدا دەستییان بۆ یارمەتیدانی ئەو قوتابییە هەژارانە درێژ دەکرد: کاربەدەستانی قوتابخانە ڕازی نەدەبوون کە ئەم قوتابییە هەژارانە لە ژێر سۆز و یارمەتیدانی خەڵکیدا ژیان بەسەر بەرن، کاربەدەستانی بەرپرس، بە توندی بە گژی ئەمکارەدا دەچوونەوە و بە پێویستیان دەزانی. چونکە هەندێك قوتابی لە چوارچێوەی داخوازی یارمەتیدانا، ناوی بەڕێوەبەر و بەرپرسی کاروباری ئابووری و داراییان دەهێنا. هەر کاتێك قوتابییەك بە هۆی لاوازی و نەخۆشییەوە. توانای کار کردنی نەبوایە دەبوا بە ڕێکی و پێکی نیاز و پێداویستییەکانی خۆی، بە بەرپرسی کاروباری ئابووری و داراییی ڕابگەیەنێت. بەرپرسی ناوبراویش بەپێی توانا یارمەتیدەدا. قوتابی ماف داواکردنی لە ئیمانداران و لە درگادانی ماڵانی ساماندار و دەست پانکردنەوەو سواڵکردنی لای ژنانیان بە هیچ بڕوبیانویەکەوە نەبوو.

قوتابی ماف ئەوەی نەبوو، وا پیشان بدات کە گوایە لەلایەنی بەڕێوەبەرایەتی، یا بەرپرسی ئابووری و دارایی یان برادەرانی دیکەیەوە ڕەوانە کراوە و کەسێکی ناسراوی قوتابخانەیە.

هەندێکجار لەناو قوتابییاندا کەسانی ناساغ و نەخۆش هەبوون بەرپرسەکان تێدەکۆشان یارمەتییان بدەن. بەڵام بە درێژەدان بە ژیانی نەخۆشەکان و کەسانی لاواز لە ڕێگەی یارمەتیدانی گشتییەوە بە توندی ناسازگاربوون و پەسەندییان نەدەکرد. ئەمکارەش پێویست بوو. چونکە کەسانێك هەبوون لە میانەی داوای یارمەتیدان سوودیان لە ناوی بەڕێوەبەر و بەرپرسی کاروباری دارایی و ئابووری وەردەگرت. هەر کاتێك قوتابییەك بە هۆی لاوازی یان نەخۆشییەوە توانای کاری نەبوایە لەو کاتەدا دەبوو بە پێی ڕۆتین پێداویستییەکانی خۆی بە بەرپرسی کاروباری ئابووری و دارایی قوتابخانە، بگەیەنێت، بەرپرسی ناوبراو بەپێی توانا یارمەتی دەدان. بەڵام قوتابی ماف ئەوەی نەبوو لە ئایینداران و سامانداران و ئافرەتان داوای یارمەتی بکات، چونکە ئەمە وای دەنواند کە گوایا بە ڕەزامەندی بە ڕێوەبەر و بەرپرسی کاروباری ئابووری و دارایی و کەسانی دیکەی وەك برادەرانی ناسراوی قوتابخانە داوای یارمەتیدەکەن.

هەر چەندە لەم ڕۆژگارەدا وەرگرتنی کتێب بە تاوان ناژمێردرێت، بەڵام بەرپرسانی قوتابخانەی نسیبین ئەم کارەیان بە تاوان دەزانی، تاوانێکی دیکەش ئەوەبوو، کە ناوی کەسێکی مردوو کە لەسەر کتێبێك نوسرابوو گوایا لە کاتی ژیانیا خاوەنی کتێبەکە بووە و داویەتی بە قوتابخانە لەگەڵ ناوی دانەرەکەیا بکوژێننەوە، یان نوسینی ناوی خۆیان لەسەر کتێبەکان بە تاوان دەژمێردرا.

هەندێکجار کەسانێك سوودیان لە فەرامۆشکاری لە بیرچوونەوەی بەرپرسی کاروباری ئابووری و دارایی وەردەگرت. (هەر کاتێك کەسێك لەبەرپرسی کاروباری ئابووری و دارایی قوتابخانە کتێبێکی بۆ خوێندنەوە و نوسینەوە بە ئەمانەت وەردەگرێت. بەڵام لە حاڵەتی فەرامۆشی و لە بیرچوونەوەدا بەرپرسەکە ئاگادارنەکاتەوە سزا دەدرا و لە شاریش دەردەکرا). لەو ڕۆژگارەدا کتێبی دەستنوس گرانبەها بوو، دەستنوسێکی یاسانامەی سوریانی تاکو ئەم ڕۆژگارەی ئێمە ماوەتەوە، ئەم

یاسانامەیە کە بە خەتێکی گەلێك جوان، لەسەر پێستی سپی نووسراوەتەوە پەیوەندی بە سەدەکانی پێنجەم و شەشەمی زایینییەوە هەیە. ئەم جۆرە کتێبانە گەلێك بەنرخبوون، ئاشکرایە کە دەست بەسەراگرتنی ئەو کتێبانە سزایەکی توندی بەدواوە بوو.

وەرگرتنی کتێب و حاشالێکردنی بە تاوانێکی گەلێك گەورە دەژمێردرا. هەر کاتێك یەکێك شتێکی بزرکراوی دەدۆزییەوە، لەسەریبوو کە چۆنیەتی ئەو کارەی بە بەرپرسی کاروباری ئابووری و دارایی ڕابگەیەنێت، تاکو خاوەنەکەی بدۆزنەوەو شتە ونبووەکەی پێبدەنەوە. هەر کاتێك ئەو کەسە کەشتەکەی دۆزیوەتەوە و دەرینەخستبایە و بیشاردایەتەوە سزاکەی لە شار دەرکردن بوو.

بەدگۆکانیش بە توندی سزا دەدران. کەسانێکی ئاوەها بە هۆی هەڵبەستنی بوختان و درۆ یان خەوش دۆزینەوە لە خەڵکان و قسەی هەڵیتوپەڵیت وتن کە زیان بە ئاسایشی کەسانی دانیشتووی ناو بەشە ناوخۆییەکان و زیان بە درێژەدانی ژیانی ئاسایی لە قوتابخانە بگەیەنێت سزا دەدران.

ئەمەش سەرنج ڕاکێشە کە لە پەیرەو پرۆگرامدا لە دژی شێوەی بتپەرستان، بەرپەرچدانەوەیەکی توندو تیژ دیاریکرابوو. چونکە ئەو کارانەی بتپەرستانیان بە پیشەی جادووگەران ناودەبرد.

قوتابییانی سوریا هەر وەکو برادەرانی قوتابییانی ئەوروپایی خۆیان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا حەزیان لە مەیخواردنەوە و سکپەرستی بوو. خواردن لە میوانخانەکانا، یان لەو دەعوەتانەدا کە لە باخەکانی دەرەوەی شاردا سازدەدران قەدەغە بوو. ئەو برادەرانە کە لە زانکۆکەدا دەژیان مافی ئەوەیان نەبوو لە چێشتخانەکان و میوانخانەکان و سالۆنەکانی نانخواردندا لە (پێکنیك = ئاهەنگ)ی میوانداری ناو باخەکان و پارکەکانا، نانبخۆن. چونکە لەلایەکەوە گیرفانیان خاڵی دەبووەوە، لەلایەکی دیکەشەوە شەوق و خۆشی و بادە نۆشی بەشداربوانی دەعوەتەکان دەبووە هۆی ئەوەی کەلە پڕۆگرام و پەیڕەوەکە لابدەن، لە بارەی ئەو کەسانەوە کە حەزیان لەو کارانە دەکرد نوسرابوو ئەوانەی بە میوانی بڕۆنە ناو ماڵان بە سووکایەتییەوە ناویان دەبرێت.

لەناو زانکۆدا جوێندان و پەلاماردانی یەکتر بە کارێکی ئاسایی دەژمێردرا. لە هەموو کاتێکدا نووسەرەکانی سوریایی لە کاتی ناکۆکی و توندوتیژیدا شەرمییان نەدەکرد لەوەی نەیارەکانی خۆیان بە (سەگی هار) یان بە (گەڕۆل) ناوبەرن. بێگومان لە نێوان لاواندا گەلێك وشەی لەمانە ناشیرینتر باویان هەبوو. لە کاتێکدا کە پێکا هەڵدەپژان، و ئامبازی یەکتر دەبوون، کەسە تاوانبارەکەیان تەمێی جەستەیی دەکرد.

هەر کاتێك یەکێك لە برادەران بە هەر هۆیەکەوە بوایە کە دەست بۆ هاوڕێکەی درێژ بکات یان وشەی ناڕەوا بە زاریا بێت کە ڕێگای دڕاندنی پەردەی شەرم بگرێتە بەر، لە دانیشتنەکانا بە ئامادەبوونی هەموان و لەبەرچاوی هەمواندا سزای جەستەیی (بە لێدان) دەدرا، بەپێی یاسای ڕێکوپێکی زانکۆ بۆ چاککردنی کەسایەتی کەسی تاوانبار ئەنجام دەدرا. هەر کاتێك یەکێك لە برادەران لە بەردەم ئەندامانی دیکەی قوتابخانەدا سێجار سزای جەستەیی بدرێت

و چاك نەبێت و تاوانێکی دیکەی وەکو تاوانەکانی پێشەوەی ئەنجامبدات سزادەدرا و لە قوتابخانە دەردەکرا و شار بەدەریش دەکرا.

بەم شێوەیە سزادان لەبەرچاوی گشتیدا تەنها سێجار ڕوویدەدا و جاری چوارەم لە کاتێکدا کە دەستی بۆ کردارێکی ناشایستەی دیکەی درێژ دەکرد، کەسی تاوانبار شایستەی دەرکردن بوو. دەبا شاریش بەجێبهێڵێت. ئەم بابەتەی دواییە لایەنگری سەربەخۆبوونی زانکۆ و پەیوەندی نەکردنی زانکۆیە بە کاربەدەستانی فەرمانڕەواوە. قوتابخانەی نسیبین لە شاری ناوبراودا ئەوە نیشاندەدا کە بەرپرسانی قوتابخانە دەستەڵاتی ئەوەیان هەبووە کەسانی نارەسەن نەك تەنها لە قوتابخانە بەڵکو لە شاریشا دەربکەن.

## سەرچاوە

شهرهای ایران در روزگار پارتیان و ساسانیان، ل490-501.

# گفتوگۆ

## دیموکراسی تاکە مۆدێلێکی نییە

دیالۆگێک لەگەڵ "ریچارد رۆرتی"دا

لە فارسییەوە: کارزان محەمەد



# دیموکراسی تاکە مۆدێلێکی نییە

## دیالۆگێك لەگەڵ "ریچارد رۆرتی"دا

**لەفارسییەوە: کارزان محەمەد**

**ئاماژە:-**

رۆرتی بەبڕوای زۆرکەس، فەیلەسوفێکی گشتییە کە بۆ خوێنەرانێکی فراوان و دەربارەی لایەنی فراوان دەنوسێت لەبارەی بابەتەکانی پەیوەندیدار بەدادپەروەری کۆمەڵایەتی و دیموکراسی. رۆرتی ئەگەرچی بەدرکەو تەنزئامێزانەوە دەنۆڕێتە جیهان، بەڵام نیگەرانی دادپەروەریی هەیەو دەڵێت: " کاتێك لە قەفەزی تەنگی فەلسەفەی ڕەسمی و کۆتی چەمکگەلێکی وەك ئەقڵانییەت، هەقیقەت، بابەتییەت و بەڵگەهێنانەوە ئازادبووین، دەتوانین دەوڵەمەندییەکی نوێ بە کلتوری پۆست فەلسەفی لیبراڵ ببەخشین". رۆرتی پراگماتیست لە کەڵکەڵەی دۆزینەوەی ڕێگایەکدایە بۆ کەمکردنەوەی ئازارە مرۆییەکان. ئەو گێڕانەوەی کردۆتە ئەلتەرناتیڤی بەڵگەهێنانەوەو تیۆریی.

لەماوەی سەردانی ئەودا لەئێران و لەپەراوێزی کۆڕە گوتاربێژییەکانی ئەودا لەخانەی هونەرمەندان و ڕێکخراوی توێژینەوەو بەڕێوەبردن و بەرنامەڕێژی، گفتوگۆیەکی ڕاشکاوانەو بێئەرکم لەگەڵ ئەودا کرد کە پێشکەشی خوێنەرانی دەکەم.

مەسعود خێرخوا

***ئاغای رۆرتی! لەوبڕوایەدام ئەوەی کە فەلسەفەی سیاسی تۆ لەهاوشێوەکانت جیادەکاتەوە، لەجۆری تێڕوانینتان بۆ هەردوو چەمکی فەلسەفەو سیاسەتەوە سەرچاوەدەگرێت. لەدیدگای تۆوە، ئەرکی فەیلەسوفی سیاسی چییە؟**

**- بەتێڕوانینم ئەرکی فەیلەسوفی سیاسی دۆزینەوەی بونیادێکی عەقلانی بۆ دیموکراسی نییە، بەڵکو ئیلهام بەخشین و بزواندنە بەئاراستەی دروستکردنی "پاڵنەر، نوێیی و ئومێدی کۆمەڵایەتی".**

*** ئایا ئەمە بەو مانایەیە کە هەوڵەکانی فەیلەسوفان بۆ پاپەڕێژیی ئەقلانیی دیموکراسی بێسود و بێبەرهەم بووە؟**

—بەڵێ! چونکە ململانێ لەگەڵ نەیارانی دیموکراسییەوە لەڕێگەی دروستکردن و دارشتنی بە "بەربەستێك بە بەڵگەکان" لەسەربنەمای تێزە سەرەکییەکان، مومکین نیە. فەیلەسوفی سیاسی دەبێ لەبیری خستنەڕووی ئەو گوتە ئیلهامبەخشانەدا بێت کە زەمینە بۆ دروستکردنی ئایندەیەکی یۆتۆپیایی فەراهەم دەکات.

*** ئایا بەرەچاوکردنی گۆڕانکارییەکانی جیهانی هاوچەرخ کە تیایدا هەندێ لەگروپەکان —ناوزەدکراو بە فەندەمێنتالیستەکان- بەمەترسییەکی گەورە بۆ دەوڵەتە دەسەلاتدارەکان دەژمێردرێت، خستەڕووی باسگەلێکی وەك ئایندەی یۆتۆپیایی، جولان بەئاقاری بڵاوبوونەوەی ئومێدی کۆمەڵایەتی و بابەتەکانیتری لەوشێوەیە چ پێگەیەکیان هەیە؟**

—ئەوەی کە ئەمرۆ گروپگەلێکی بچوك کارەسات دروست دەکەن کە لەڕابردوودا تەنها لەلایەن دەسەلاتە گەورەکانەوە ئەنجام دەدرا، ناکرێ بەڵگەیەکی ئاراستەکراو بێت بۆئەوەی کە ئێمە پرۆژەی ئایدیالانەی خۆمان، واتا گەیشتن بەکۆمەڵگایەکی فیدراتیوی دیموکراتی جیهانی، بخەینەلاوە یاخود چاوپیادابخشێنینەوە. ئەو یۆتۆپیایە هێشتا بەنرخە بەڵام چانسی بەدیهاتنی زۆر کەمترە وەك لەڕابردوو.

*** رۆڵی فەیلەسوفانی سیاسی لەم نێوانەدا چییە؟**

—ئەوان پێویستە بەهۆی گەڕان بەدوای بونیادەفەلسەفییەکاندا، ئایدیای ئیلهامبەخش پەرەپێبدەن تا هەلومەرجی فۆرمەڵەبوونی ئایندەیەکی یۆتۆپیایی فەراهەم ببێت.

*** پێموایە تۆ لەگەڕاندا نیت بۆ دۆزینەوەی پایەو بنچینەی فەلسەفی بۆ تیۆرە دیموکراسییەکەی خۆت؟**

—بەڵێ وایە. چونکە لەوباوەڕەدام دیموکراسی بەتەنها دەتوانێت بەبێ گەڕانەوە بۆ بیانو وبەڵگەهێنانەوە یاخود تەنانەت پێشمەرجێکی فەلسەفی" دابهێنرێت.

ئەمرۆ، دیموکراسییەکان دەتوانن زۆرێك لەو ئامرازانەی کە بۆ پێکهێنانی خۆی بەکاریانهێناوە" بەرکەنار بکات. دیموکراسی مەیدانی رووبەڕووبوونەوەی رای جۆراوجۆرە دەربارەی دادپەروەری، کامەرانیو ژیانی باشتر.

*** تۆ لەشوێنێکدا وتوتە کە ئایدیاکان شیاوی گۆڕانن و لەم بابەتەوە گەیشتویتەتە ئەو ئەنجامەی کە هەقیقەت بونیادێکی فەلسەفیانەی نییە. ئایا لەمبارەیەوە روونکردنەوەی زیاترت هەیە؟**

—ئایدیاو هزرەکان هەروەك چۆن لەسەربنەمای زاراوەکان دروست دەکرێن" شیاوی گۆڕانیشن. لەسەرئەم بنەمایە، سروشتی نەگۆڕاوی مرۆڤ بوونی نییە. و هەقیقەتیش لەو رووەوە کە لەلایەن فەیلەسوفانەی بنیادنراوە، بونیادێکی فەلسەفیانەی نییە. دووبارە هەمان وتەی پێشووی خۆم دەڵێمەوە، ئەگەر وای دابنێین کە "هەقیقەت تایبەتمەندیی رستەکانەو رستەکانیش وابەستەی زاراوەکانن و زاراوەکانیش مرۆڤەکان دروستیان دەکەن، ئەوا دەتوانم بڵێم کە هەقیقەتەکان داهێنانی مرۆڤەکانە".

***لەتێڕوانینی تۆوە ئامانج لەکۆمەڵگای لیبراڵ چییە؟ و کۆمەڵگای لیبراڵی ئایدیال، کامەیە؟**

—لیبرالیزم تەنها فەلسەفەی سیاسییە کە پێکەوەژیانی تەواوی تاکەکانی کۆمەڵ بەتێڕوانینە جۆربەجۆرەکانیانەوە" بەدیدەهێنێت. لیبرالیزم بەم هەنگاوەی بەدوای دۆزینەوەی هاوسەنگییەکدایە لەنێوان ئازادی، سامان، دادپەروەریو ئاشتیدا.

لیبرالیزمی سیاسی تەنها بنچینەی کۆمەڵایەتیەکی پتەوە بۆخۆپارێزیی لە بن بەستی کۆمەڵایەتی.

كۆمـەڵگای لیبراڵـی ئایـدیال، جیهانێکـە کـە تیایـدا توندوتیـژی کـەم ببێتـەوەو پێکـەوەیی کۆمەڵایەتی بەرەو زیادبوون بچێت و هەمووان بەهەر ئایدیاو هزرێکەوە بتوانن لەتەك یەکتردا بژین.

*** لەم نێوانەدا ڕۆڵی ئایین و ئایندەی مرۆڤ چۆنە؟**

– مـن لەدیـدی عەلمانیەتـەوە دەنۆڕمـە ئـەم بابەتـە. مـن بـڕوام بەبـەکارهێنانی ئـایین نییـە بـۆ دەسـتبەرکردنی کامـەرانی مرۆیـی. چـونکە لەوبڕوایـەدام بونیـادی کامـەرانی‌و وابەسـتەیی مرۆڤەکان، بەهۆی تاکەهەقیقەتێکەوە وەدینایەت.

ئاینـدەی مـرۆڤ! نـازانم. ڕەنگـە تـەنها دەبـێ ئومێدەواربین. ئومێدەوار بـەوەی کـە ڕێککەوتنێکی پایـەدار لـەنێوان بەشـێکی زۆری تاکـەکان بەدەسـت بهێنرێت. من بەوەی کە ڕۆژێك "تـاکێتی مرۆڤەکان" بتوانێت بەشێوەیەکی تەواو لەتەك یەکتردا ژیـانێکی هاوبەش وبەکۆمەڵ بێتەدی" گەشبین نیم و تەنانـەت ڕەتی دەکەمەوە.

*** من بەداخەوە لەهەردوو کتێبی "فەلسەفەو ئاوێنـەی سروشـت" و "پەیامـەکانی پراگمـاتیزم"ی تـۆدا تـەنها ڕاپۆرتێکم ڕاڤەکردووە. دەمەوێ هەڵوێسـتی تـۆ دەربـارەی هەقیقەت و دۆزینەوەی بەڕوونی بزانم.**

– لەدیـدی پراگماتیزمـەوە، مـن لەوبڕوایـەدام زمـان ناتوانێـت واقیعیەتـەکان وەك "ئاوێنـەی سروشت" پیشانبداتەوە. بەڵام لەم نێوانـەدا زانست دەتوانێـت ئامرازگـەلێکمان بـۆ فەراهـەم بکـات تابەشـێوەیەکی کـارا دەرەقـەتی دنیـای "واقیعی" بێین.

*** و هەقیقەت؟**

–هەقیقـەت! هەقیقـەتێك "لـەدەرەوەدا" بـوونی نییـە. چ جـای ئـەوەی کـە بمانـەوێت بـەدوای دۆزینەوەیدا بگەڕێین. بەدڵنیاییەوە لەوبڕوایەدام کە هیچ ڕێگایەکی مسۆگەر بۆ گەیشتن بۆئەولای زمان و بینینـی جیهانـەوە، وەك ئـەوەی کـە لەڕاسـتیدا هەیە، بوونی نییە.

*** مەبەستی تۆ لە فەنداشـنالیزم (*Fandaionalism*) چییە؟**

– فەنداشنالیزم گوزارشتە لەگەڕانی دەستپێك و بونیادی مەعریفە و سوڕانەوەی ئەو "مەعریفەیە" بەدەوری بنەماکان و چوارچێوەکاندا کە لەوەڵامی چییەتی مەعریفەدا بەکاردەهێنرێت.

***واتا تۆ بەئەولەویەت ڕازیبوون بۆ "دیموکراسی بەسەر فەلسەفەدا" دەتەوێت بڵێیت،فەلسەفە نابێ بکرێتە بنچـینە و بنەمای هرز و لەڕاستیدا دەتەوێت فەنداشنالیزمێکی لەوجۆرە ڕەت بکەیتەوە. و بەوهۆیەوەیە کە هەندێك تۆ بە "دوژمنـی فەلسەفە" دەزانن!**

–"پێ‌دەکەنێت" بەڵێ! ڕاستە.

***بـەپێی ئایـدیای تـۆ لەسـەربنەمای "ئەولـەویتی دیموکراسـی بەسـەر فەلسـەفەدا"، پێداویسـتی گەشـەی دیموکراسی چییە؟**

–جێگیرکردنی چەمکی قوڵی "هاوبەستبوون" لەبری "بابەتیبوون".

*** هەست دەکەم تێڕوانینی تۆ بـۆ ژیـان و جیهـان – بەتایبەتی لـەکتێبی "ئیمکـان، درکـەو هاوبەسـتەیی" زۆر درکەئامێزو تەنزئامێزانەیە. بەڵام لەهەمانکاتـدا سـەبارەت بەئاشتی، دادپەروەری و ئازادیش زۆر بەرپرسیارانەیە. ئەمـە لەڕاستیدا لەخۆگری هەمان هزری لیبرالیستی تۆیە؟**

–"پێ‌دەکەنێت". من ئەهلی درکەم بەومانایەی لەوبڕوایـەدام پێویسـتە تـەوەرەیترین بیروبـاوەڕو تێڕوانین و تەنانـەت ئینتماکـانی خۆشمـان بەدیـدی تـەنزەوە لـێ‌ی بنـۆڕین و هەرشـتێك تەنانـەت پتەوترین، بونیادیترین و ڕاوەستاوترین باوەڕەکانی خۆشمـان بەشـیاوی گـۆڕان بـزانین. ئـەهلی تـەنز، درکەو لەهەمانکاتدا لیبراڵ کەسانێکن کە پێیانوایە دژوارییـەکان سـەرئەنجام کـەم دەبنـەوەو ئـەوان

بێگومان هاوكات "گەنجینەی زاراوەكان"ی خۆیان دەخەنەبەردەم گومانەوە.

*** چەند كەسێك لەبیرمەندانی لیبراڵ و ئەهلی تەنزودركە ناونابەیت؟**

—ستایشی (جۆن) دیویی، راولز و (یۆرگن) هابرماس دەكەم ئەوان نمونەی بالاَو پێشڕەوی لیبرالیزمن بەلاَم نێتچە، هایدگەر، فۆكۆ و دریدا بە خەڵكی دركەو تەنز دەزانم.

*** تۆ فەیلەسوفێكیت كە خوێنەرانێكی بەربلاَوت هەیە، ئایا پێتوایە كە ئەم كارە بەهۆی "گەنجینەی زاراوەكان"ی تۆوەیە كە توانیویەتی لەگەڵ ئەم چینە بەربلاَوانەدا سازش بكات.**

– "پێدەكەنێت" نازانم.

***تۆ دیموكراسیت وەك ڕێبازێك بۆ گەشەی كۆمەڵگا ناوبرد، ئەگەر ئەمە بەمانای ئازادی ڕاگەیاندن و سوڕانەوەی ئازادانەی زانیاری و...ە، ئەو كۆمەڵگایانەی كە ئەم تایبەتمەندیانەیان نییە پێویستە چی بكەن تا بگەنە دیموكراسی؟**

—فۆرمۆڵێكی تایبەتی بۆ گەیشتن بەدیموكراسی نییە. پێموایە تەنها (چانس)ی كۆمەڵگاكان دەتوانێ ڕۆڵی هەبێت. "بەدەنگی بەرز پێدەكەنێت"

كاتێك كە كۆمەڵەڕاپەرینێك دژ بەدەسەلاَتدارانی كۆمەڵگایەك فۆرمەڵەدەبێت و دەبێتەمایەی شكستدانیان، دەسەلاَتدارە نوێیەكە، بیروباوەڕەكانی خۆی بەڕەسمی دەناسێنێت و دیموكراسی بەفەرامۆشی دەسپێردرێت. هەندێك كاتیش ئەم دۆخە نایەتەپێشەوەو دیموكراسی دەبێتە دەسەلاَتدار. بەتێڕوانینم ئەمریكا لەڕاستیدا چانسی باشی هەبووە. چونكە هیچكام لە ڕێبەران و بنیاتنەرانی بەهۆی ڕاپەرینەوە سەرەنگون نەكراوە.

دیموكراسی لەزۆرێك لەولاَتاندا بەبەرهەم دێت بەلاَم لەزۆرێكیتری ولاَتاندا ڕێگاكە ناگاتە شوێنێك. پێموانییە بتوانین یەك مۆدێل بۆ بەدیهێنانی دیموكراسی ڕاسپاردەبكرێت.

*** پێتوانییە كە دەستەبەركردنی دیموكراسی لەئەمریكا دەرئەنجامی لێكدانی ڕاكان، بوونی پێداویستی بەكاپیتالیزم بووە؟**

—كۆمەڵگای ئەمریكا ئەگەری هەڵبژاردنی ئەلتەرناتیڤانەی جگەلە كاپیتالیزم نییە.

*** هەنوكە دەمەوێت دەربارەی یەكێك لەمەسەلە گرنگ و ئاستەنگ بزوێن لەكۆمەڵگای ئێران و تەنانەت لەجیهانی ئەمرۆشدا پرسیار بكەم. دەزانم كە تۆ تێڕوانینێكی هاوكارت لەبارەی ئاینەوە نییە، بەلاَم دەمەوێت وەك فەیلەسوفێك وەلاَمی پرسیارەكانم دەربارەی ئایین بدەیتەوە. پێناسی تۆ بۆ ئایین چییە؟**

—بڕوابوون بەهێزێكی میتافیزیكیانە و پەرستنی ئەو.

***كێشەو زیانەكانی ئایین لەجیهانی مۆدێرنی ئەمرۆدا چییە؟**

—خۆزگە ئایین كارێكی تاكەكەسی بوایەو بەشێوەی بەكۆمەڵ و گشتی لەكۆمەڵگادا نەخرایەتەڕوو. لەزۆرێك لەولاَتاندا، ئایینی تاكەكەس كارێكی تاكەكەسیو پەیوەندیدارە بە ژینگە تایبەتییەكەیەوەو تا لەكەسێك نەپرسن كە ئایینەكەی چییە، لێدوان دەربارەی ئایین نایەتەئارا. تەنها كاتێك ئایین مەترسیدارە كە دێتە سیاسەتەوە.

*** ڕۆڵی ئایین لەكلتوری پۆست مۆدێرندا چییە؟**

—من بڕوام بەئۆقیانوسی كلتوری پۆست مۆدێرن نییە، لەكۆمەڵگامەزنە خاوەن دیموكراسییەكاندا، جۆرە كلتورێكی پێكەوەژیانی

ئاینیانـە هەیـە چـونکە ئـایین خـۆی لەسیاسـەت بەدوورگرتووە. پۆست مۆدێرن پەیوەندییەکی زۆری لەگـەڵ ئـەم بابەتـەدا نییـەو تـەنها نیشـانەیەکی مۆدێرنێتەیە.

***رۆڵی کاریگەر بۆ ئەگەرو بەدیهاتنی گفتوگۆی نێوان ئاینەکان چییەو پێویستە چۆن ئەنجام بدرێت؟**

–پێموانییە رێبـازێکی تایبـەتی بـۆ گفتوگـۆی نێوان ئایینەکان هـەبێت. باوەڕداران بـەخودا هـەموو رۆژێـك لەگـەڵ بـێ بـاوەڕان بـەخودا بـاس و گفتوگـۆ دەکەن. ئەم کـارە دەتـوانرێ بەشێوەی گفتوگۆیـەکی دۆسـتانە ئـەنجام بـدرێت و پێویسـتییەك بـۆ بـوونی رێبازێك بۆ ئەنجامدانی" بوونی نییە.

***گرنگـی گفتوگـۆی ئاینـەکان لەچـەرخی نـوێ و جیهانی مۆدێرندا تاچ ئاستێکە؟**

–باشـە، جیهـانی مـۆدێرنی ئـەمڕۆ جـەنگی ئـاینی تیـادا ڕەنـگ ناداتـەوە. بـەم پێیـە گفتوگـۆ دێنێتەمەیدانـەوە. پێموایـە گفتوگۆیـەك دەکـەین تاوەکو بەربە دەرئەنجامە مەترسیدارەکانی نەبوونی ئەو گفتوگۆیە بگرین.

*** دەرئـەنجامی گفتوگـۆی نێـوان ئاینـەکان چۆن دەبێت؟**

–پێکـەوەژیان، و کاربەیـەکتر نـەبوون. تـەواوی ئـەوەی کـەدەکرێ چـاوەڕێی بکرێـت، ئینتمـا بـۆ قبوڵکردنی یەکتر.

***بڵاوبوونـەوەی مەعنەوییـەتی خـاڵی لـە بـاوەڕبوون یاخود نەبوو بەخوداوەند ئایا بەتێڕوانینی تۆ پۆزەتیڤە یاخود نیگەتیڤ؟**

–پێموایە گۆڕینی بۆ تیۆرێکی سیاسی دەکرێ ببێت بەپۆزەتیڤ.

*** چ شـتێك بۆتەمایـەی کەمبوونـەوەی بڕوابـوون بەخوداوەند لەجیهانی مۆدێرندا؟**

–تیۆری کامڵێتی داروین، شۆڕشی فەرەنسا و تەواوی ڕەگەزی ڕووداوە مێژووییەکان، لەڕیزی ئەو نمونانـەدان کـە بۆتەمایـەی ئـەوەی کـە بـڕوا بەخوداوەندبوون کەم ببێتەوە.

***کلتوری یەکترقبوڵکردن چۆن بەدەستدێت؟**

–بـە گفتوگـۆ. گفتوگـۆو هەرشـتێك کە ببێتەمایەی بەهێزبوونی کلتوری تەحەمولکردن" پەسـەندە. بـەڵام، کلتـوری تەحـەمولکردن بەرهـەمی بەرگرتن لە تێکەڵاوکردنی ئایین و سیاسەت بووە.

***پراگماتیزم بۆتەمایەی فۆرمەڵەبوونی چ سیستەمێکی ئێتیکی؟**

–پێموایـە پراگمـاتیزم دەڵێـت کـە هـیچ شـوێنگەیەکی ناچاریانەی نابـەجێ بـوونی نییـە و تـەنها فێربـوونی ئـەوەی کـە چـۆن کۆمەڵگایـەك سـازبکەین بـەمانای خۆشـبەختییە. مەسـەلەی بنچـینەیی پراگمـاتیزم، دۆزینـەوەی ڕێگایەکـە بـۆ کەمکردنـەوەی ئازارەمرۆییـەکان و زیـادکردنی یەکسانی لەنێوان مرۆڤەکاندا.

***پەیوەندی پراگماتیزم و عەلمانییەت چییە؟**

– پراگمـاتیزم جـۆرە هیومانیزمێکە کە دەڵێت رێککـەوتنی ئازادانـەی نێـوان مرۆڤـەکان زۆرتـرین دەسـەڵاتی هەیـەو ئەمـەش بـەمانای دەسـتوەرنەدانی ئایینە لەسیاسەتدا.

**سەرچاوە**

مجله (ناقد)، شماره سوم، سال اول،
ص (159–166).

# لە ئەدەبی گەلانەوە

- لە گیانەڵلای دونیادا

کریستینا پیێر ڕۆسی

لە سویدییەوە: عەبدوڵڵا قادر دانساز

- چەند دەقێکی شیعری بیانی

لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن

- سەربازە بچکۆلەکە

جەنگیز ئەیتماتۆڤ

لە ئینگلیزییەوە: توفیق عەبدول

# له گیانەڵڵای دونیادا

کریستینا پێر ڕۆسی
لە سویدییەوە: عەبدوڵڵا قادر دانساز

### کورتەیەك لەسەر ژیانی نووسەر

کریستینا پێری ڕۆسی ( *Christina Peri Rossi*)، ژنە نووسەرێکە، لە ساڵی 1941 لە مۆنتیڤێرۆی پایتەختی ئۆرگوای هاتووەتە دنیاوە، لە ساڵی 1972وەوە بە پەناهەندەیی بۆ ئیسپانیا چووە و لەوێدا نیشتەجێبووە. ئەو وەکو ڕۆژنامەنووس و وانەووتنەوە کاریکردووە. ووتارەکانی لە ڕۆژنامە گەورەکاندا بڵاوکردونەتەوە و کتێبەکانی بۆ زۆربەی زمانەکانی دونیا وەرگێڕدراون. شاعیر، چیرۆکنووس و ڕۆمانووسە. بەرهەمێکی زۆری لە هەرسێ بابەتکە هەیە. ئەم چیرۆکانە لە کۆی چیرۆکەکانی کتێبی "لە گیانەڵای دونیادا"وە وەرگێڕدراون.

### کۆمپانیای پشکداری خۆکوشتن

دەوڵەت ناوزەدکراوانی خۆکوژی دەپارێزێت. بۆ ئەوەی خۆکوژان سەرکەوتوو بن لە کۆمپانیاکەیاندا، مرۆ بە مەبەستەوە پردی سەرشەقام، پرد و قەمە شاخ دروست دەکات بۆ ئەوەی ئەو پیاو و ژنانەی بڕیاری خۆکوژیان داوە. گەورەترین دەستەبەری خۆکوژییان دەستگیربێت.

یەکەمجار مرۆ پردێکی سەر شەقامی کۆنکرێتی ئێجگار گەورە دروستدەکات. پردی سەرشەقامەکە درێژ دەبێتەوە بەسەر ئەلی[1] پڕ لە ژاوەژاوەکە، وەك ئەوەی دەستەبەری ئەوە بکات ئەو خۆ فڕێدانە خێرایە بەنێو حەوادا وای بکوژێت کە هیچ یارمەتییەکی پێنەگات. بەلام هاکا دوو گرفت سەریان قوت کردەوە، یەکەمیان، وای لێهاتبوو کە هاتوچۆی قەرەباڵغی ماشینەکانی ئەلێکە سەرنجی خۆکوژە ناوزەدکردووەکان بەلای خۆیدا کێشبکات، بە تایبەتیش ئەو کاتەی ئەوان دەبوا خۆیان فڕێبدەنە خوارەوە بۆ یەکەمین جار بریقەدانەوەی شینی چرای سەر جادەکانیان بە قیرتاوەکەوە دەبینی و، یان کاتیان بەوە بەسەردەبرد کە گرەو لەسەر خێرایی ئەو ماشێنانە بکەن کە لە ترافکلایتەکانەوە تێدەپەڕین. ئەم وردە سەر لێشێوێنەرانە هاوسەنگی هۆشی ئەوانی دەشێواند یا وەکو بڕیاردانی ئەوانی دوادەخست. گرفتی

دووەم ناڕەزایی ئەو کەسانە بوو بە ئەلێیەکەدا ئۆتۆمبیلیان دەئاژوو، چونکە ئەو کاتەی خۆکوژە ناوزەد کراوەکان بەردەبوونە خوارەوە، بە خوێنی ئەوان جامی پێشەوەی ئۆتۆمبێلەکانی ئەوانیان پیسدەکرد، بە ناوزگی هەڵدڕاوو چامرلغی ئۆتۆمبیلەکانی ئەوانیان سوواقدەدا. لەگەڵ ئەوەشداپاشماوەی لەشی مرۆڤەکان بەسەر قیرەکەوە پێشیان لە هاتوچۆی خەڵکی دەگرت. بەڵام شارەکە زۆر وردەکار و پێشبینیکەرە: بۆ ئەوەی هەردوو گرفتەکە چابکرێت بڕیاری جێبەجێکردنی خشتەیەکی زۆر وردیاندا: خۆکوژە ناوزەدکراوەکان دەتوانن ڕۆژانی دووشەممە، پێنجشەممە و یەکشەممە — کە خەمگینترین ڕۆژانی هەفتەن — لە کاتژمێری پێنجی دوای نیوەڕۆوە تا کاتژمێری دوانزەی شەو — کە بێزارکەرترین کاتی ڕۆژانن — پردی سەرشەقامەکە بەکاربهێنن و لەو کاتانەشدا هاتوچۆی ماشێن بە ئەلێیەکە قەدەغەبوو.

پردی سەر شەقامە کۆنکرێتەکە غەمگینییەکی سەیر و پرسە ئاسایە کەبە تەواوەتی لەگەڵ ئەو کاتانەی مەرگدا دەگونجێت. ئەو پردی سەرشەقامە هەڵواسراوە، هەر بە شریتێکی خۆڵەمێشی دەچێت، هەندە درێژە کە ئەگەر بێتو پیاو لەسەرێکی پردە هەڵواسراوەکەوە بووەستێت ناتوانێت کۆتاییەکەی بەدیبکات و پردە هەڵواسراوەکەش شێوەیەکی وای هەیە وەك بڵێی هەر لە ئێستاوە بەشێك بێت لە گابەرانی[2] مەرگستان. جگە لەمانە پۆلیسی شار فەرمانیان پێدرابوو ئەو فزولییانەی خۆیان بە تەنیشت پردی سەرشەقامەکانەوە خەریك دەکەن دووربخەنەوە، بۆ ئەوەی نەوەکو بەهۆی بژی بژی و بابژیکانیان، بە چەپڵەڕێزانیان یان فیکەکێشانیان باری ئاسایی هەستی خۆکوژە ناوزەدکراوەکان وەرز بکەن یا سەریان لێبشێوێنن. بە پێچەوانەی ئەوەشەوە ڕێگە دەدرێت بە وێنەگرتن و لە هەموو جێگایەکیشدا مرۆ دەتوانی تابلۆ لە بەرزیدا ببینێ بەوەی لەو جێگایانەدا پۆستکارتی وێنەی ئەو پردی سەرشەقامە جوانەی کە هەروەکو گەلە تاوێرێک پەلی هاویشتووە لەگەڵ وێنەی پیاوێک یا ژنێک کە خۆهەڵدانە خوارەوەیان دەستپێکردووە.

هەروەها مرۆ نیو دەرزەن پردی دروستکردووە، بەر لە هەموو کەسێکیش بەکارهێنانیان بۆ خۆکوژانە. شوێنی پردەکان بە گوێرە هەڵنەبژێردراوە. ئەو پردانە بە پێی ئامار دروستکرابوون، لە جێگای وەهادا کە لەلایەن کەسانێکی زۆر لە نەوەی جیاجیا لە خۆکوژە ناوزەدکراوەکانەوە هەڵبژێردراون، لەگەڵ ئەوەشدا هۆی هەڵبژاردنی جێگاکە ئەوەندە ڕوون و ئاشکرا نییە. هەر چۆنێك بێت، بە هەمان شێوەش ئامار ئەوەی ئاشکرا کردووە کە لە نێو خۆکوژە ناوزەدکراوەکاندا ژمارەیەکی زۆریان پیاون، خۆکوشتن لە زستاندا ئاساییترە وەك لە هاوین، لە پایزدا وەك لە بەهارا، لە خۆرئاوابووندا باشترە وەك لە شەبەق، هەروەها ئەوەش بە بەڵگەوە سەلمێندراوە کە تاوانی خۆکوژی لە هەندێ جێگای شاردا زیاترە وەك لە جێگاکانی تری شار. بۆ نموونە مرۆ ناچار بوو پردێك دروستبکات بەلاشانی ئەو ئۆتۆبانەی دەچووە نێو شارەوە، هەندێ شۆفێر وا ڕاهاتبوون — و ئیتر ئەم کارە کرا بە خو، هەروەکو چۆن ئەم گۆڕانکارییە بەسەر گەلێك هەڵسوکەوتی ئاساییەوە دێت — یەکسەر پێش ئەوەی بچنە نێو شارەوە، بە کەناری ئۆتۆبانەکانەوە لەو جێگایەی دەبووە هۆی ئالۆسکانی هاتووچۆ ئۆتۆمۆبیلەکانیان بە جێبهێڵن و بە ناچیزەترین شێوە و دووریش لە

لێپرسراوییەوە — بە حەپی خەو یا وەکو ژەهر — هەوڵی خۆکوشتن بدەن.

ئێستا شارەوانییەکان، هەر لەو جێگایەدا، ڕێگایان بە هەڵواسینی تابلۆیەکداوە کە تیایدا نووسراوە: "ئەگەر ئێوە دەتانەوێت خۆتان بکوژن، ئەوا تکایە لای دەستە چەپتان بەکاربهێنن" لەبەر هۆیەك لە هۆیەکان، تەنها سەر جولاَنەوەیەکی چکۆلانە — تەنها جولاَنەوەیەکی چکۆلانە — بەسە بۆ ئەوەی ئەو کردارە شۆفێرەکە پەرێشان بکات، چەند مەترێکی کەم دوور لەو جێگایەوە پردێکی سەر شەقامی کۆنکرێت بەدی دەکەن — بۆ ئەوەی خۆکوژە ناوزەدکراوەکان بپارێزرێن پێکهاتەی ئەو پردە ماددەیەکی گونجاوترە لە ئاسن، چونکە ئەو شتە فەنتازیا دەجولێنێت بە هۆی ئەوەی ئەو پردە هەڵواسراوە لە نێو تاریك و نتوکی و بێدەنگیدایە، نقوم بوونیش لە نێو دۆخی سڕبوونێکی ئاوەهادا هەر بە مردن دەچێت.

ئەو نەریتە کۆنەی خۆکوشتن بەوەی بە دارێکەوە خۆت هەڵواسیت، کاتی بەسەرچووە، لە پێش هەموو شتێکەوە لەبەر ئەو هۆیەی نە هیچ دارێك لە نێو شاردا هەیە و نە بە تەنیشت هیچ خانوویەکیشەوە دار هەیە. بۆیە کە مرۆ بڕیاری دروستکردنی باخچەیەکی گشتی چکۆلانەی داوە، لەو جێگایەدا هەر دارە و پەتی تایبەتی خۆی پێوەیە و شارەوانیش خۆکوژە ناوزەدکراوەکان دڵنیادەکات بەوەی گومان لەوەدا نیە کە پەتەکان تایبەتین، چونکە ئەو پەتەی جارێك بەکارهێنرابێت دەدرێت بە میراتگرانیان یاوەکو بە نزیکترین کەسوکاریان و لە جێگای پەتە بەکارهێنراوەکەش پەتێکی نوێ هەڵدەواسرێت. مرۆ دەتوانێت بەبێ هیچ دوودڵییەك بڵێت هیچ کەسێك لە نێو شاردا خۆی بە پەتێکی بەکارهێنراوەوە هەڵنەواسیوە. بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت بە تایبەتی خۆیان بکوژن و هەموو شێوەیەکی خۆکوشتنی ئاشکراش ڕەتدەکەنەوە، ئەوا کارخانەیەکی میری هەیە بەرهەمەکانی گەلێك جۆرن و لە ناواخن و نرخدا جیاوازن، کەم تا زۆریش دڵنیایان دەکات بەوەی خۆکوژییەکەیان لەسەرخۆ بێت، تا ڕادەیەکیش شێوەیەکی هەست پێنەکراو بێت، بۆ ئەو کەسانەی قێزیان لە بڕیاردانی خێرایە یا لەبەر هۆی گۆڕانکارییەکی زۆر دڕندانەوە لە باری تەندروستییان یا وەکو خودی بارەکە.

چوکلێتی پرالینی[3] ژەهراویی زۆر بە تام، شۆربای بە تەواوەتی بکوژی هومەری[4] بەبەزەیی، جگەرەی شیرینی ژاراوی کراو، بۆنی خۆشی ئینتیم[5] و نەرم و بکوژ هەیە. ئۆتۆمۆبیلی تازەی تازە دروستکراو هەیە بەوەی بۆڕی ئەکسۆزەکانیان بۆ دیوی ناوەوە بردراوە، بوتڵی شەمپانیا هەیەو لەگەڵ بێلادۆنەدا[6] ئاوێتەکراوە و قاوغە شقارتە هەیە لەسەر قاوغەکانیان بە نەقشو نیگارێك کە لە چیرۆکەکانی هانز کریستیان ئەندەرسین هێنراون ڕازێنراوەتەوە و لەو شوێنەدا ئەگەر تەڵەشقارتەکانیان داگیرسێنرێت گازێکی بکوژی لێپەیدا دەبێت.

بۆ ئەو کەسانەی لە تواناياندا نییە سێکس لە خۆکوشتن جیابکەنەوە ئەوا هەمان کۆمپانیای دەوڵەت جۆرە ئامرازێکی گرانبەهای وای هەیە کە بە تایبەتی بۆ خۆکوژە ناوزەدکراوەکان دروستکراوە. فەرشی گەرمی وا هەیە هەر بە زێی ئافرەت دەچێت، مادەیەکی ژەهراوی تیایە و دەڵە ناکات" مرۆ دەتوانێت دوو مەمك، ڕەزیلی لە دروستکردنی نەکرابێت بکڕێت — بەو ڕەنگەی خۆت حەزت لێیە، زەرکەش یاوەکو ڕەش بێت — بەوەی لوویەکی پێوە کرابێت ژەهرێکی کوشندەی لێوە

دەربچێت و هاوەڵە بوکێی[7] گەورەش هەیە — بە هەردوو ڕەگەزی نێرینە و مێینەوە — ئەو کەسەی کە لە ئان و ساتی ئەوپەڕی ڕەحەت بوون گەیشتووە بە حاڵلێهاتن هاوەڵە بووکەکە کاریگەرانە دەست لە بینەقاقای گیر بکات و بیخنکێنێت. لەگەڵ ئەوەشدا کارامەیی وەستایانی پیشە دەستییەکانمان دەتوانن ئەو شتەش بلوێنن، بەوەی تەنها بەهۆی فۆتۆیەکەوە، کۆپییەکی پڕاوپڕ واقعی ئەو ژن و پیاوانە بکەن بۆ ئەوەی شێوەی ئەو وێنانە ببن بەو ئامرازە لە دڵاشیرینەی کە خۆکوژەکان بتوانن چێژی لێ وەربگرن و بمرن.

بۆ هەموو ئەو کەسانەیش کە خۆویستیان کەسایەتیەکی لاوازیان هەیە و هەست بەوە دەکەن توانای خۆکوژییان نییە، بۆ داخوازی ئەوان شار خزمەتێکی یەکاویەك و نهێنی جێبەجێ کردووە، ئەو خزمەتەش پێکهاتووە لە پۆلیسی خانەنشین، سەربازان، لاوانی بێکار و شۆڕشگێڕە سەرنەکەوتووەکان.

تاقە یەك تەلەفونێ کورت بەسە بۆ ئەوەی گرووپێکی چکۆلە لەو کەسانە — پاش ئەوەی ئەو نهێنیە ئاشکرابوو کە ئەو خۆکوژانە ئامادە نین تاکە و تاك هەڵسن بەو کارە - بۆ ئەوەی ئەوان خۆیان بگەیەننە ماڵی خۆکوژە ناوزەدکراوە بێدەسەڵاتەکە و بۆ ئەوەی مەرگێکی خێرا و دڵنیای بدەنێ، بەبێ ئەوەی بەرپرسی لە هەڵبژاردنی ئامرازی خۆکوشتنی خۆی بکات.

بەڵام هێشتا ئەو کەسانە هەن کە ئەوەیان پێ باشترە بەوەی لە پڕێکدا لە پەنجەرەیەکەوە خۆیان هەڵبدەنە خوارەوە یاوەکو خۆیان فڕێبدەنە نێو دەریاوە، بەشێوەیەکی خۆپەرستانە و زۆر ناکۆمەڵایەتییانەش ئەو کارە دەکەن. پیادەکان و هەروەها ماسیەکانیش ڕقیان لەو کەسانەیە.

## شەهیدەکە

لە دوا کۆبوونەوەی کۆمیتەکەماندا، کە لە بیست و دووی مانگی حوزەیراندا هاتە ئەنجامدان، بە بەشداربوونی هەموو ئەندامان و هەڵاوێردکردنی ئەندامی ژمارە سەد و پەنجاو هەشت، کە تووشی هەڵامەتێکی پیس بوو بوو، بە ئامادەنەبوونی ئەندامی ژمارە دووسەد و سیویەك بەهۆی مردنییەوە، بەشێوەی جیاجیا یەکەمین خاڵی خشتەی کارەکانی ڕۆژمان شیکردەوە، کۆبوونەوەکەیش لە ژێر ناوی: "باری ئێستای بزاوتەکەمان لە بەرامبەر دوژمندا" بوو. لەبەر ئەوەی ئەو خاڵە دەربارەی بابەتێکی ئێجگار ئاڵۆز بوو، ئەو تاقە خاڵە مانایەکی بەرفراوانی بۆ دوا ڕۆژمان دادەنا، خاڵەکە هەر هەموو سەرنج و خۆتەرخانکردنێکمانی گرتبووە خۆی.

یەکەمین ڕاپۆرت کە خوێنرایەوە بەرهەمی یەکێك بوو لە بە تەمەنترین ئەندام و دامەزرێنەری بەڕێزی کۆمیتەکەوە لەلایەن هەموانەوە بەیەك دەنگ دەنگی پێدرا. ئەو جەختی دەکردە سەر ئەمەکداری بێسنووری لایەنگران، خۆڕاگری و خۆنەویستیان لەبەرامبەر خەباتدا، هەستی ڕەسەنیان بۆ خۆبەختکردن بەشێکی زۆری کردارەکانیانی گرتبووەوە، بەخشندەییان لە ڕەفتارەکانیان و دەستپاکیان لەبەرامبەر پرەنسیپەکاندا، ئەوانەی بە هیچ شێوەیەك دوو دڵ نین لە باوەڕهێنانیاندا بە دواڕۆژ و دوا سەرکەوتن لە کارەکەماندا. بە هەمان شێوە ڕاپۆرتەکە ئەوەی ئاشکراکرد کە تەنها باوەڕهێنان بە سەرکەوتنی کۆتایی بەس نییە چونکە ئێمە تەنها بەشێوەیەك دەگەین بەو سەرکەوتنە ئەگەر بێتو بە قارەمانێتی خۆمان و بەڕەسەنایەتی یەکە بە یەکەی هەستی

خۆبەختکردنمانەوە خۆڕاگرتووبین. ڕاپۆرتەکە لەسەر ئەوە بەردەوام بوو کە جەخت بکاتە سەر ئەوەی ڕێگای گەیشتن بە ئەنجام گەلێك درێژە، بەڵام مرۆ هەر لە ئێستاوە تاڵی ڕووناکی ئامانجەکەی بەدیکردووە. ڕاپۆرتەکە یەکسەر چووە سەر ئەوەی باس لە باری ئێستای بزاوتەکەمان و ئاستی توانامان لە بەرامبەر دوژمندا بکات.

ئەوە ڕاستە کە ئێمە توانیومانە لەم دواییەدا دەستکەوتی گەورە بەدەستبهێنین. بزاوتی ئێمە بەرەو پێشەوە چووە، لەسەرەخۆ بەڵام بە دڵنیاییەوە، ئەم کارەش ئەو شتە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت کە بزاوتمان شێوەی هێزێکی ڕاگر و بەرچاوی بەخۆوە گرتووە. پێویستە سەرکەوتن و ژێرکەوتن لە خەباتماندا وەکو پشکێك لەو پرۆسە درێژەی دەستمان پێکردووە تەماشا بکرێت و کۆتاییەکەیشی زۆر لێمانەوە دوور نییە. بەڵام ئێمە پێش ئەو سەرکەوتنەی کۆتایی پێویستە بە شێوەیەکی زۆر باش سەر لە نوێ جەخت لە خۆمان بکەینەوە.

هەروەکو هەموو دەزانین ئێمە دوژمنێکی زۆر زۆر بەهێزمان هەیە. هەندێ جار خۆیان لە تویێ جلوبەرگی تەرەوە دەشارنەوە، یاوەکو لە سێبەرەکاندا خۆیان دەشارنەوە. بەڵام بەسەریاندا زاڵ نەبین کۆڵنادەین. ئەم بەشەشیان بە با بژی ستایش کرا.

ڕاپۆرتەکە یەکسەر دوای ئەوە توانای هێرش بردنی دوژمنی شیکردەوە. لەگەڵ ئەو سەرکەوتنانەی لەم دواییانەدا بەدەستمان هێناوە ناچارین دان بەوەدا بنێین کە بەراوردکردنی هێزەکان بە قازانجی ئێمە ناشکێتەوە. ئێمە دەبێ لەوە زیاتر خەبات بکەین و جەخت لە خۆ کردنمان تەرخان بێت بۆ بارێکی چاکتر، لەو جێگایەی ئێمە لە تواناماندایە پێگەمان لە دوژمن چاکتر بکەین. بۆ ئەوەی بگەین بەم پێگەیە و باری ئێستامان بگۆڕین، پێویستە هەنگاوێکی گەورە بنێین. خۆلادان لەو هەنگاوە کارێکی ئەستەمە و ئەو کارەش دەرگای ترمان بۆ باری تازەتر لێ دەکاتەوە، ئەو بارەی لەوێوە ئەنجامی کۆتایی بە هەموو ڕەونەقیەکیەوە تیایدا دەدرەوشێتەوە. کەواتە ئەمە باس لە خێرایی کردن دەکات لەو پرۆسەیەی کە ئێمە دەگەیەنێتە دوا سەرکەوتنە مەزنەکە. بەڵام ئەو هەنگاوە کامەیە کە بەبێ ئەوەی شارەزایی زۆر و پێشکەوتنەکانی پێشومان لە دەست بدەین، پەڕینەوەمان بۆ بارێکی تر ئاسان دەکات.

ئێمە دەبێت دان بەوەدا بنێین پرسیارەکە هیچ وەڵامێکی ڕاستەوخۆ و دڵنیای تێدا نییە. ئەندامە ئازیزەکانمان هەموو هێز و توانای خۆیان بۆ داڕشتنی ستراتیژی ئەو بارە تەرخانکرد. ئەو بارەی جیاوازە لە پێش خۆی، ئەمە هەڵوێستەیەکی زۆری دەوێت.

پاش ئەوەی بە وردی و بە شێوەیەکی گشتی دەستمان بە شیکردنەوەی باری ئێستامان کرد دوا پێکدادانمان، توانای دوژمن لە بەرگەگرتن و ڕاونان، مێژووی پڕ سەروەری بزاوتەکەمان هاوکاتیش هیواخواستن بۆ دوا ڕۆژ، گەیشتینە ئەنجامێکی گشتی هاوڕا کە ئێمە پێویستیمان بە شەهیدێك هەیە. ماوەیەکی خایاند تا توانیمان ئەو بەرەنجامە بخەینە بەردەم، بەڵام هەر کە ئەو سەرەنجامە بوو بە ڕاستی، ڕاستییەك بە ڕێك و ڕەوانی خۆیەوە هەر هەموو ئێمەی دەرخست، لەم پشکەی خەباتەکەمان پێویستیمان بە شەهیدێك هەیە. شەهیدێك دەتوانێت هاوسەنگی هێزمان لە بەرامبەر دوژمن بگۆڕێت، بەهۆی تازەکردنەوەی هێزەکان، هێزە پەرش و بڵاوەکەمان لە چەقێکدا کۆبکەینەوە و

چاویشمان لەوە بێت کە ئێمە بە خێرایی خۆمان لە مەبەستەکەمان نزیک دەکەوینەوە. شەهیدێک سومبولێکی تازە بە مەسەلەکەمان دەدات و کار دەکاتە سەر ناخی لاوەکان، ئەوانەی پێویستییەکی زۆریان بە بزواندن هەیە. شەهیدێک بە تازەکردنەوەی هێز کاریگەری دەکاتە سەر کێشەکەمان، هانی لاوازەکان دەدات و عەشقیش لای ئەوانەی ئێستا ئەندامن دروست دەکات.

پاش چەندین گفتوگۆ دەربارەی ئەو شتانەی بۆ شەهیدێک دەگونجێن، سیفەتە تایبەتییەکانی و ڕێکەوتی ڕاستینەی هەڵبژاردنی ئەو کەسە بوو بەو پڕۆژەیەی لەلایەن هەر هەمووانەوە دەنگی پێدرا. یەکسەر چووینە سەر ئەرکە سەختەکە، ئەرکی هەڵبژاردنی شەهیدێک. ئێمە وا بۆی دەچووین گونجاوترین شت ئەوەیە کە بڕیاری ئەوە بدەین دەبێت شەهیدەکەمان خاوەنی چی سیفاتێکی تایبەتی بێت، تاوەکو کردارەکەی کاریگەرتر بێت. ئێمە بەهۆی شارەزایمانەوە دەزانین ئەوانەی لە خۆیانەوە کاری شەهید بوون لە ئەستۆ دەگرن کاریگەرییەکی کەمتریان هەیە لەوانەی شایستەن بەو کارە، چونکە ئەوانەی بە خۆیان هەڵدەستن بە شەهیدبوون هەڵە دەکەن و لە نرخی خۆبەختکردنەکانیان کەم دەبێتەوە. شەهیدی وا هەیە تەنها ناوهێنانیان بۆ خەڵکی ئاسایی سەختە، ئەمەش وا دەکات هەر زوو ناویان کوێربێتەوە. بە خۆمان بڕیارماندا کە دەبێت شەهیدەکەمان ناوێکی هەبێت، بەڵام بێ ئەوەی ناوەکە دەنگدار یان جووت دەنگی تیا بێت.

بۆیەکە بەوردی بە لیستی ناوی ئەندامەکانماندا چووینەوە و ئەو کەسانەی نێوی سلاڤی یا ساشی[8] و هی تری لەو بابەتەیان هەبوو هەلمانبوارد، ئێمە بە پێی شارەزایمان بەوە دەزانین بۆ ئەوەی شەهید، کردارەکەی بەنرختر بێت دەبێت تەمەنێکی هەبێت، دەبێت تەمەن مەرجێک بێت. بەداخەوە گەلێک جار لە نێو ئەو شەهیدانەی لە خۆیانەوە شەهیدبوون هەڵدەبژێرن، پیاوی کامڵ، ژنی بە تەمەن و منداڵی شیرەخۆرەی تێدایە. خۆبەختکردنیان ئەنجامی خراپیان داوە بە کێشەکەمان، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کارەیان پڕ شکۆ بووە، چونکە هیچ کەسێک هاوخەمی نییە بۆ پیاوێکی تەمەن مامناوەندی، ئەو کەسە لە قۆناغێکی ژیانیدایە کە جێگیربوونی نییە و ئیتر مردن بۆ ئەو شتێکی سەیر نییە لە بەردەم تەمەنی جوانی یاوەکو چێژ وەرگرتن لە سوودەکانی تەمەنێکی پڕ سەروەری خۆیدا. هەرچی منداڵی شیرەخۆرەشە ئەو تەمەنە تایبەتییەیان نییە، ئەوەندەی بەش بکات ئایدیاکانیان بۆ خۆیان ڕوون و ئاشکرا بێت بۆ ئەوەی بە نموونەیی خۆیان ڕێنیشاندەر بن بۆ بڕیارنەدەرەکان، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو شیرەخۆرانە زۆر باشن بۆ زیندوکردنەوەی هاوخەمی لەلای هەموو کەسێک. کەواتە ئێمە پیاوانی بە تەمەن، ژنانی بە تەمەن و منداڵی شیرەخۆرەمان هەڵاوێرد کرد. ئێمە پێمان گونجاوتر بوو بەوەی تەمەنی شەهیدەکەمان لە نێوان بیست و پێنج تا سی ساڵ بێت، چونکە ئیتر ئەو کەسە لەوە بەدوا هەندە هەستیار نابێت لە بەرامبەر یەکەمین خوێن گەرمی سەردەمی لاوێتیدا و تەمەنیشی نەگەیشتووەتە تەمەنی مەسیح، ئەو تەمەنە تەمەنێک بوو کۆمەڵەکەمان وا بۆی دەچوون لە نێو شەهیدەکانماندا کەوتبووە قۆناغێکی زۆر بە تامەوە. شتێکی تر کە ئێمە ڕێزمان لێی دەگرت ڕەگەزی نێر و مێ بوو. ئێمە وا بۆی دەچووین چونکە سیاسەت کارێکە بۆ پیاوان گونجاوترە ژنان هەڵاوێرد بکەین، بگرە ئەگەر بێتو ئەوان لەبەر

پاشەقولیشدا بن، هەندە باش شەهیدبوونیان لێ ناوەشێتەوە، لەبەرئەوەی بێ خەوشی سیاسیەتی ئەوان چاکترین سیاسەت نییە، هەرچی پەیوەندی بە جۆری کارەوە هەیە بڕیارماندا ئەو کارە لەگەڵ قوتابیەتیدا ناگونجێت، چونکە زۆربەی جار ئەوان لەلایەن ڕای گشتییەوە وەکو شەڕانی، سەر پێچیکەر و سەرەڕۆ لێیان تێدەگەن، نابێ کرێکارێکی ئاساییش بێت، مۆرکی مانگرتووی پێوە دەنرێت. ئێمە پێویستیمان بە فەرمانبەرێك هەیە، کارەکەی زۆر باش تەماشا دەکرێت و بە هیچ شێوەیەك مەیلی لاناداتە سەر سۆز و پێچکردنەوەی سیاسەوە. هەروەکو خۆتان دەزانن، پاش ئەو هەموو ڕایانەی دەرمانبڕین لیستی ناوزەدکراوەکان، کەمتر و کەمتر دەبووەوە و ئێمەش هەر هەموومان گەلێك ڕازی بووین. لە کۆتاییدا سەختترین پرسیارمان شیکردەوە، مەبەستم ئەوەیە بڵێم خۆبەختکردن. ئێمە وا بۆی دەچووین باشترین شت ئەوەیە شەهیدەکەمان لە ماوەی خۆپیشاندانێکی ئاشتیخوازانە لەلایەن پۆلیسەوە بکوژرێت و ئەو کوشتنەش بە ئامادەبوونی هەموو ئەندامانی کۆمیتەکەمان بێتە ئەنجام. ئەمەش ڕێگا خۆش دەکات بۆ ئەوەی کامیرەکانی تەلەفیزیۆن بتوانن وێنەی هەموو ئاهەنگەکە بگرن و ئیتر دوای ئەوە هەر هەمووی زۆر بە باشی لەلایەن ڕۆژنامە و ڕادیۆوە بلاوببنەوە. ئەندازەی گوللەکە زۆر گەورە بێت و لەلایەن پۆلیسەوە زۆر بە وردی بتەقێندرێت، دەبێت گوللەکە سەری شەهیدەکە بپێکێت بەلام لەو دیوەوە دەرنەچێتە دەرەوە.

ڕاپۆرتەکە بەیەك دەنگی هەمووان قبوڵکرا، بە تەواوەتیش هەروەکو بڕیاری کۆتایی لەلایەن هەموانەوە دەنگی بۆ دراو لەلایەن ئامادەبوانیشەوە چەپڵەی گەرمی بۆ لێدرا.

ئەم نامەیە مەبەستێتی ئاگادارتان بکاتەوە کە "ئێوە" شەهیدە هەڵبژێردراوەکان و، ئێمەش چاوەڕوانی هەموو خۆشەویستییەکی ئێوەین بۆ کێشەکەمان، توانستی ئێوە بۆ خۆبەختکردن و خەباتکردنتان لە وەفاداریتان بۆ بە ئەنجام گەیاندنی بڕیاری کۆمیتە ئازیزەکەمان.

## پەراوێز

1–ئەلێ: شەقامێکە لەمبەر ئەو بەریەوە درەخت ڕوێنرابێت.

2–گابەران: لیستی خوارەوەی نێو دەرگا.

3–چوکلێتی پرالینی: چکولاتەیەکی چکۆلانەی جوانە و ناویشی بە شتی تر پڕکراوە.

4–هومەر: بە لاتینی پێی دەوترێت *Homarus vulgaris* جۆرێکە لە کوللەی دەریا.

5–ئینتیم: نزیك، هەروەك پەیوەندی زۆر نزیکی نێوان ژن و پیاو.

6–بێلادۆنەدا: بە لاتینی پێی دەوترێت *Atropa bella-donna* جۆرە ڕووەکێکە گوڵێکی مۆر دەگرێت و زۆر ژەهراویە.

7–هاوەڵە بوکێ: بووکی یاری یا ئەو بووکانەی لە دووکانەکاندا جلی لەبەردەکەن.

8–ساشی *Saxisk* یان *Sachsisk*: بۆ زمانی ئەو میللەتەیە کە جێرمانی دێرین بوون و لە باکوری ئەڵمانیای ئێستادا دەژیان و پێیان دەوترا ساکسییەکان *saxare* یان *sachsare*.

## سەرچاوە

***Christina Peri Rossi, Kosmoagonier, 1990, Pieksamaki***

# چەند دەقێکی شیعری بیانی

لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن

### "ئەم ژیانەی سەر زەوی درەختێکی ژەهراوییە"

شیعری: کالیداسا

ئەم ژینەی سەر زەوی درەختێکی ژەهراوییە
کەچی تەنها بە دوو میوەی شیرین ماوەتەوە:
تامی خۆش و خواهانەی شیعر،
خۆشـــبەختی ئـــەو کاتانـــەی دۆســـتەکان یەکـــدی دەبینین.

### "گوێبیستی ئەوەی کە هاورێکەی لە جەنگ دەگەڕێتەوە"

شیعری: وانگ چیان

لە ڕۆژانی زۆر زوودا ئەوانەی کە دەچوونە جەنگ
لە سێ ساڵدا تەنها ساڵێك مۆڵەتیان بوو
بـەلأم لـەم جەنگـەدا سـەربازەکان جێگۆڕکێیـان پـێ نەکرا
دەبوو بجەنگن تاوەکو دەمرن
تاوەکو لە شەڕگەکاندا دەکوژران.

من دڵم لای تۆ بوو کە ئەوەندە لاواز و سستی،
نا ئومێدانە تەقەللات دەدا ڕێ بکەیت و سەرگەرمی مەشق بیت
بەوەی کە دەبوو کوڕێکی گەنج بگەڕێتەوە ماڵەکەی
وەك ئەوە وابوو کە ئاسمان دەبوو بتەپێ.
هەر کە بیستم تۆ دەگەڕێیتەوە،
دوو جار چوومە سەر دیواری بڵندی خانووەکەتان.
براکـــەتم بـــینی کـــە تەویلـــەی ئەســـپەکەتی پـــاك دەکردەوە"
دایکتم بینی کە جل و بەرگی نوێی بۆ تۆ دەدووری.
نیوەم ترسە.. لەوانەیە ڕاست نەگەڕێ و نەیەیتەوە"
کەچـی هـەرگیز مانـدوو نـابم کـە لەسـەر ڕێگاکـان چاوەڕێت بم.
هـەموو ڕۆژێـك تـا دەروازەی گـەورەی دەرەوەی شـار دەڕۆم
بـە خـۆم و شووشـەیەك شـەرابەوە، نـەبا بێیتـەوە و تینووت بێ.
ئـۆە.. خۆزگـە دەمتـوانی وا بکـەم زەوی بچـێتەوە باریەك و..

ئەم دونیایە بچوك بکەمەوە
تاوەکو ئان و سات، لە ناکاو، تۆ ببینم شان بە شان..
لەتەك مندا وەستاوی!

## "هاوڕێیەتی"

شیعری: ئۆکتاڤیوپاز

ئەوەتا سەعاتێکی[1] چاوەڕوانکراو
لەسەر مێزەکە دەکەوێ
بەردەوام و بێ کۆتایی
لەگەڵ قژی پەرش و بلاوی لامپاکە
شەویش ئەم پەنجەرەی گۆڕیوە بە فرەهی[2]
کەسیش لێرە نییە
(بوون)[3]ێکی بێ ناویش گەمارۆی داوم.

## "خەو زڕان"

شیعری: ئۆم ئویگل (سەدەی حەڤدەم)

دۆڵێکی کپ.. بێ جێی پێی کەسێك لەو ناوە
باخچەیەکی چۆڵ و.. ڕۆشن بە تریفەی مانگ
لەناکاو سەگەکەم دەوەڕێ و.. ئیدی من دەزانم
برادەرێکمەو.. خۆی و بوتڵێك دێ و..
دەرگاکەم دەکوتێ..!

## "وێنە تێکشکاوەکان"(4)

شیعری: ڕۆبرت گرەیڤس

ئەو خێرایە.. وێنەکانی ڕوونن کە بیر دەکاتەوە"
من سستم و وێنەکانم تێکشکاون کە بیر دەکەمەوە.

ئەو تەمبەڵ و گێل دەبێ کە بڕوا بە وێنە پاکەکانی خۆی دەکا"
من ڕژد و زیرەك دەبم کە بڕوام بەو وێنە تێکشکاوەکانی خۆم نامێنێ.

کە بڕوا بە وێنەکانی دەکا، وای دەنوێنێ کە پەیوەستن بەیەکەوە"
کە گومان لە وێنەکانم دەکەم، گومان لەو پەیوەستبوونە دەکەم.

سەلماندنی ئەو پەیوەستبوونە، سەلماندنی حەقیقەتە لای ئەم"
پرسیارکردنم لەو پەیوەستبوونە، گومانکردنە لە حەقیقەت.

کە حەقیقەت ناپێکێ، پرسیار لە هەستەکانی خۆی دەکات
کە ناگەم بە حەقیقەت، ستایشی هەستەکانی خۆم دەکەم

ئەو هەمیشە خێراو گێلە لە مەڕ هەڵبژاردنی وێنە پاکەکانی"
من هەمیشە سست و وردبینم لە مەڕ وێنە تێکشکاوەکانی خۆم

ئەو دەنێو شلەژان و تێکچوونێکی تازەدایە کە تێدەگا"
منیش وام دەنێو تێگەیشتنێکی نوێدا کە دەشڵەژێم.

## پەراوێز

1-سەعات: مەبەستی کاتەکەیە نەك کاتژمێر وەك ئامێرێك.

2-فرەهی: فراوان، گەورە و مەزن.

3-بوون: ئامادەگی، یان پێشچاڤی.

4-لە سەرچاوەی دووەمەوە وەرگێراوە.

## سەرچاوە

*1-Friendship Poems*

*Selected and Edited by Peter Washington*

*Everymans Library Ltd., 1995*

*2-The Faber Book of Modern Verse*

*Edited by Michael Roberts – London*

*Reprinted 1970 – Page (204)*

# سەربازە بچکۆلەکە

جەنگیز ئەیتماتۆڤ

لە ئینگلیزییەوە: تۆفیق عەبدول

بۆ یەکەمین جار کە باوکی خۆی بینی لە سەر شاشەی سینەما بوو. ئەو کاتە تەمەنی نزیکەی پێنج ساڵان بوو.

ئەمە لە گەلەخانێکی سپی گەورەدا ڕویدا، کە ساڵانە مەڕەکانی لێ ئەکەنە پەچەوە بۆ ئەوەی بیانبڕنەوە. گەلەخانەکە هێشتا ماوە لەپشت گوندێکی کێڵگەیەکی هەرەوەزیەوە لە دامێنی گردەکان، نزیکی ڕێگاکە. لەگەڵ دایکیدا ڕایانکرد بۆ ئەوێ.

جاینگوڵی دایکی لە فەرمانگەی پۆستەی گوندەکە وەکو کارمەندی تەلەفۆن کاری ئەکرد، بەڵام هەموو هاوینێک لە سەرەتای وەرزی مەڕ برینەوەدا لەگەلەخانەکە وەکو کرێکاری کاتیی بە برێنگچی دائەمەزرا. لە فەرمانگەکەی خۆی مۆڵەتی ساڵانەی وەرئەگرت و تا دواڕۆژی مەڕبرینەوە لەوێ ئەمایەوە. ئەو بەپێی خوری کرێی وەرئەگرت، لەبەر ئەوە شتێکی باش بوو ئەو کارەی لەوێ دەست کەوتبوو.

بە نیسبەت ئەوەوە وەکو بێوەژنی سەربازێك تا دواین کۆپێکی پێویست بوو– هەرچەند خێزانەکەی زۆر گەورە نەبو– تەنیا هەر خۆی و کوڕەکەی بوو، بەڵام جیاوازی نییە خێزان هەر خێزانەو پێویستی بە جل و پێڵاو و هەموو شتێکە.. بەڵێ، زۆر شت هەیە کە تۆ پێویستتە. کوڕەکەی ئەبوایە بە تەنیا لەماڵەوە بوایە, لەبەر ئەوە لەگەڵ خۆی ئەیهێنا بۆ سەر ئیشەکە. ڕۆژ تا ئیوارە لەو ناوەدا بەدەم و چاوی پیس و دڵی خۆشەوە لەناو شوانەکان و سەگەکانیاندا هەڵئەخولا. ئەو یەکەمین منداڵ بوو ئەو فیلمە ببینێ کاتێك کە سینەمایەکی گەڕۆك بەلۆرییەك هاتە گۆڕەپانی گەورەکان و یەکەمین کەسیش بوو کە هەواڵی ئەو ڕووداوە سەرسوڕهێنەرەی بڵاو کردەوە:

-سینەما هاتووە! سینەماکە هاتووە! هاواری کرد.

فیلمەکە دوای ئیشکردن دەستی پێکرد, کە

تاریك داهات, فیلمێك بوو دەربارەی جەنگ. خۆی و دایکی ڕاست لەپشت خەڵکەکەوە جێگەیەکیان بۆ خۆیان دۆزیەوە لەسەر باڵە خورییەکان. لەوێوە شاشەکە باشتر دیار بوو. ئەو, بێگومان, ئەیویست لە یەکەم ڕیز لەگەڵ هەندێ کوڕوکاڵی ئاواییدا دابنیشێت کە لەبەردەمی شاشەکەدا کۆبووبونەوە, ویستی بچێتە لای ئەوان بەڵام دایکی گرتی.

-دانیشە, تۆ لە بەیانییەوە ئارامت نییە, تاوێکیش لای من بە.

ئەمەی ووت و لە کۆشی خۆیدا داینیشاند. مەکینەکە هەڵکراو جەنگ دەستی پێکرد، هەموو بەخرۆشەوە سەیریان ئەکرد. دایکی کوڕەکە کە سەیری فیلمەکەی ئەکرد، هەناسەی هەڵئەکێشاو تاو نا تاوێك لە ترسا ڕائەچەنی و توند کوڕەکەی ئەگرت.

ڕوداوەکان بۆ ئەو ترسناك نەبوون، بە پێچەوانەوە هەندێ جار دڵخۆشکەر بوون کاتێك ئەیبینی فاشستەکان لە شەڕەکەدا ئەکوژران. کاتێکیش سەربازەکانی خۆمان ئەکەوتن ئەو هەمیشە وای بۆ ئەچوو لە دوایدا هەڵئەستنەوە.

بە گشتیی شتێکی خۆشە کە خەڵك لە شەڕدا ئەکوژرێن ئەو کاتەی منالآن بە یارییەوە جەنگ ئەکەن. ئەم خۆی ئەتوانێت وەکو ئەوان بکوژرێت. کە ئەکەوێت و خۆی ئەتلێنێتەوە هەندێك ئازاری پێئەگات، بەڵام یەك جار وانییە. ئەبێت خێرا هەستێتەوەو جارێکی تر هێرش بەرێت. بەڵام ئەو پیاوانە هەرگیز هەڵنەئەستانەوەو لەوێدا لە سەر ئەو خاکە ئەکەوتن.

ئەو ئەکرا بە چەند جۆرێك بکوژرێت بەپێی شوێنی ئەو گوللانەی کە بەر سك و شوێنەکانی تری ئەکەوتن و دوایی ڕایئەگەیاند: حساب نییە و نەکوژراوەو دەست ئەکاتەوە بە شەڕ. بەڵام ئەو پیاوانە هەرگیز شەڕی تریان نەئەکردەوە. جەنگ بەردەوام بوو ئامێرەکە ئیشی ئەکرد. ئینجا پیاوانی تۆپخانە هاتنە سەر شاشە. شەش حەوت کەس بوون بەیەکەوە، بەڵام یەکێکیان لە ڕوسی نەئەچوو.

لەوانەیە منالّەکە هەستی بەوە نەکردایە ئەگەر دایکی نەبوایە.

سەیرکە. ئەوە باوکتە. چپاندی بە گوێی کوڕەکەیدا.

ئیتر لەو چرکەیەوە پیاوی سەر شاشەکە باوکی بوو. لە ئێستاوە هەموو فیلمەکە لەسەر ئەوە، دەربارەی باوکیەتی. باوکی دەرکەوت کە تەواو گەنجە، ڕێك وەکو لاوەکانی ئاوایی. زۆر کەڵەگەت نەبوو، بەڵام دەموچاوی خڕو چاوەکانی زیتەڵەبوون.

-دایە، ئەوە باوکمە؟. ئەڤاڵبەك لە دایکی پرسی.

-چی؟. بێدەنگ دانیشە سەیری فیلمەکە بکە.

-ئەی تۆ نەتووت ئەوە باوکتە؟.

-با، باوکتە، ئەی چۆن! بەڵام قسە مەکە با خەڵکەکە بێزار نەبن.

بۆچی وای وت؟ بۆ؟ لەوانەیە کاتێك ئەوەی لە دەم دەرچوو بیری لای خۆی نەبووبێت، یان ئەوەندە خۆی بە بێکەس زانیبیّ، مێردەکەی بیر کەوتبێتەوە. بەڵام ئەو بڕوای پێکردو ئەوەندە پێی شادمان بو وایئەزانی لەو خۆشیە چاوەڕوان نەکراوەو نەزانراوەدا لە تەنیشتیەوەیەتی. وەك هەر مندالێکی تر بوایە، ئەمیش شانازی بەوەوە ئەکرد ئەوە باوکیەتی، کوڕی ئەو سەربازەیە.

بەڕاستی ئەوە باوکە! بەکوێرایی چاوی هەموو ئەوانەی گاڵتەیان پێئەکرد کە ئەو باوکی هەر نییە، با ئێستا بێن ببینن! شوانەکانیش!.

ئەو شوانانەش هەرگیز ئەو منالّەیان بە

تەواوی نەئەناسی، هەمویان دانە دانە بەردەوام لێیان ئەپرسی:

-ئەریّ کوره ناوت چییە؟

-ئەڤاڵبەك. وەلاّمی ئەدانەوە.

-ئەی کوڕی کێی؟.

-کوڕی توکتاسەن.

شوانەکان تەقەی سەریان ئەهات باسی کیّ ئەکات.

-توکتاسەن؟! پیاهەڵئەشاخان.. ئەم توکتاسەنە کێیە؟.

ئەویش دوبارەی ئەکردەوە "من کوڕی توکتاسەنم".

دایکی فێری کردبوو کە لێیان پرسی وابڵێت، نەنکە کوێرەکەشی ئامۆژگاریی کردبوو ناوی باوکی لەبیر نەچێتەوە.

"ئا، تۆ ڕاوەستە، تۆ کوڕی ئەو ژنەیت کە لە فەرمانگەی تەلەفۆنەکە کار ئەکات، وانیە؟."

-نەء من کوڕی توکتاسەنم. بەردەوام ئەبوو پەشیمان نەئەبووەوە.

"باشە تۆ کوڕی توکتاسەنیت. خوات لەگەڵ. پێت ناخۆش نەبێت، ئێمە بە درێژی ساڵ لەو کێوە شوانین، ئێوەش لە ناو دێ ئەڵێی تۆو کراون چین چین شین ئەبن. ئێمە ئەم هەموو منالە ناناسین.

ئەوجا شوانەکان لەناو خۆیاندا هەولیان ئەدا بیریان بکەوێتەوە کامە باوکی بوو؟!.

بەئەسپایی بەیەکترییان ئەوت، بەستەزمانە ئەوەندە گەنج بوو کە ڕۆیشت بۆ بەرەکانی جەنگ کەس هەر بیریشی ناکەوێتەوە کامە بوو!.

بەس نیە ئەم منالێکیشی لەپاش بەجێما، ئەوەندە گەنجمان لەو جەنگەدا تیاچوو کە ژنیان نەهێنابوو، یەکێکیان بەجێنەهێشت وەجاخیان ڕۆشن بکاتەوە.

لەو چرکەیەوە دایکی چپاندی بە گوێیداو وتی"سەیرکە ئەوە باوکتە."پیاوەکەی شاشەکە بوو بە باوکی، کە بەڕاستی هاوشێوەی سەربازە لاوەکەی ناو وێنەکە بوو. ئەو وێنەیەی کە گەورەیان کردبوو گرتبویانە شوشەو بە دیوارەکەدا هەڵیان واسیبوو.

لەو کاتە بە دواوە ئەڤاڵبەك بە چاوی کوڕ سەیری باوکی ئەکردو لە ڕۆحیەوە کانیاوێك سۆزو خۆشەویستی جگەرگۆشانە بۆ باوکی هەڵقولاّو تا ئێستاش بەردەوامە. وەکو ئەوەی باوکی لەسەر شاشەکەوە ئاگای لێ بێت کوڕەکەی سەیری ئەکات و بە جۆرێك خۆی ئەنواند لەگەڵ ئەو خەیاڵەدا بگونجێ کە کوڕەکەی لە مێشکیدا دروستی کردبوو، بە جۆرێك ئەجولاّ کە کوڕەکە هەرگیز لە یادی نەچێت و وەکو سەربازێك هەمیشە شانازی پێوە بکات.

ئیتر لەو چرکەیەوە جەنگ شتێکی خۆش نەبوو بەلای منالەکەوە، هیچ چێژێکی تیا نەبوو کە خەڵك ئەمردن. جەنگ بوو بە شتێکی بێزراو و ترسناك. بۆ یەکەمین جار هەستی کرد مەترسیە بۆ سەر نزیکترین کەسی، بۆ سەر کەسێك کە هەمیشە بیری ئەکات. ئامێرەکە لە کاردایەو جەنگ بەردەوامە. لە بەردەمی خۆیانەوە بینیان تانکەکانی دوژمن دێنە پێشەوە. ژمارەیان زۆر بوو، دۆخەکە تۆقێنەر ئەبوو.

منالەکە وای هەست ئەکرد ئەویش لەوێیە لە تەنیشت باوکیەوە لە ناو جەرگەی ئاگرو دوکەڵ و چەخماخەی جەنگەکەدا. کە سەربازەکان ئەکوژران پەست و بێدەنگ ئەبوو. ژمارەیان کەمترو.. کەمتر ئەبوەوە... دایکی ئەگریا، فرمێسکی گەرم بە ڕومەتیا ئەهاتە خوارەوە.

ئامێرەکە لە کاردایەو جەنگ بەردەوامە.

شـەڕەکە بەرامبـەر هێزێکـی کـەمی تـازە دامـەزراو قورسـتر ئـەبوو، تانکـەکان زیـاترو... زیـاتر ئەهاتنـە پێشـەوە. سـەربازێکی تـر کـوژرا. تـەنیا دوو سـەرباز مابونەوە، باوکی و یەکێکی تر. تەقینەوەیەك. گڕێك و تاریـك بوونێـك. تـەنیا یـەك سـەرباز هەسـتایەوە. بـاوکی بـوو. هێشـتا مـاوە. بـە هێواشـی لـەناو تەپوتۆزەکـەدا هەسـتایەوەو بـەرەو ڕووی تانکەکـە ئەچوو، نارنجۆکێکی بەدەستەوە بوو.

دایکـی ئەوەنـدە بەتونـدی دەسـتی گوشـی ڕاچـەنی. ئەیویسـت هەسـتێت و ڕابکـات بـۆ لای بـاوکی، بـەلاّم بـاوکی وەکـو درەختێـك بیبڕیتـەوە، ڕووووووخـا. باوکی ویستی هەستێتەوە، تـەنیا بـۆ ئـــەوەی هـــەردوو دەســـتی بـــە هـــەردوو دیـــودا بلاّوبکاتەوەو بکەوێتەوە.

ئامێری سینەماکە بێدەنگ بوو، شەڕەکە لـە پـڕ بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو وەستا. ئەوە کۆتـایی بەشی یەکەم بـوو. کارمەندی سینەماکە گلۆپـەکانی داگیرسانەوە. کە پەچەی گەلەخانەکـە ڕونـاك بـوەوە، خەڵکەکـە چـاویان ڕێشکەوپێشـکەی ئـەکردو خێـرا خێرا ئەیانتروکاندو لە جیهانی فیلمەکەو بـارودۆخی جەنگەکـەوە ئەهاتنـەوە نێـو ژیـانی ڕاسـتەقینەی خۆیـان. لـەو کاتـەدا منداڵەکـە خلیسکاو لەسـەر بالـە خوریەکـــە کەوتـــە خـــوارەوە، هەســـتایەوەو بـــە سەرکەوتوییەوە هاواری کرد:

"هێـی کوڕینـە، ئـەوە بـاوکم بـوو، بینیتـان؟ ئەوەی کوشتیان باوکم بوو."

نە کـەس چاوەڕوانی ئـەوەی ئـەکردو نـە کـەس ئـەیتوانی لێکـی بداتـەوە، چـی ڕویـدا. منداڵەکـە بـە هـاواری سـەرکەوتوانەوە بـەرەو شاشـەکە ڕایکـرد، بەرەو شوێنی ئەو یەکەم ڕیـزەی لاوەکانی ئـاوایی لێ دانیشتبون، بەوردیش بۆ شوێنی نزیکترین کەسـیان لـــە شاشـــەکەوە. کپـــی و بێدەنگیـــەکی ســـامناك گۆڕەپانەکەی گرتەوە.

ئـەو هەسـتکردنە نابەجێیـە بـە خۆشـیی کـە منداڵەکـە بـۆ یەکـەم جـار بـاوکی خـۆی بینـی هێشـتا نەگەیشـتۆتە خـەڵکانی تـر. هـیچ کەسـێك لـەوە نەگەیشت،بە حەپەساویەوە بێدەنگ بوون و شانیان هەڵئەتەکاند. کارمەنـدی سـینەماکە کەرەسـتەکانی کۆئـەکردەوە. بـەلاّم سـەربازە بچـکۆلەکە، کـوڕی ســـەربازە کوژراوەکـــە بـــەردەوام هـــەوڵی ئـــەدا قەناعەتیان پێبکات.

"چاوتان لێبوو! ئەوە باوکم بوو... کوشتیان. هەتا زیاتر سووربوایە، خەڵکەکە بێدەنگتر ئەبوون. نەیئەزانی ئەو خەڵکە بۆچی بەقەد ئەو دڵخۆش نین و وەکو ئەو شانازی بە باوکیەوە ناکەن!.

منـاڵێکی دراوسـێیان کـە دەرگایـان بەیەکـەوە بوو، یەکەم کەس بوو ئەو ڕاستیەی پێووت:

-ئـەو دەنگـە دەنگـە چـییە؟. ئـەوە بـاوکی تـۆ نەبوو. ئەوە ئەکتەرە. پاڵەوانی فیلمە. حـەز ئەکـەیت لە پیاوی سینەماکە بپرسە.

لاوەکـان نەیانئەویسـت خەیاڵـە کارەسـاتبارو بەنرخەکـەی منداڵەکـە بـڕوخێنن، بۆیـە ئەیانویسـت میوانە سینەماکارەکە خۆی ڕاستەوخۆ حەقیقەتەکە لـە منداڵەکـە بگەیـەنێت. هـەمویان چـاوەڕوانی وتـەی ئـەویان ئـەکرد، بـەلاّم ئـەویش وەلاّمـی نەدایـەوەو دەنگـــی نـــەکرد، دەســـتی کـــرد بـــە کۆکردنـــەوەی کەرەستەکان، بۆ ئەوەی وانیشان بدات سـەری قاڵەو ئاگای لە پرسیارەکە نەبوو.

"نـەخێر، ئـەوە بـاوکم بـوو!.. ئـەی چـۆن!" منداڵەکە هێور نەبوەوەو لە جموجوڵ نەکەوت.

کامـەیان بـاوکی تۆبـوو؟ کامـەیان؟ منداڵەکـەی دراوسێیان کۆڵی لێ نەدا..

"ئـــەوەیان کـــە بـــە نارنجۆکەکـــە پـــەلاماری تانکەکـەی دا. بـە ڕاسـت نەتـدی ئـەها... کـە ئـاوا

کەوت !" لەو کاتەدا خۆی فڕێ دایە سەر زەویەکەو تلایەوە, هەڵسایەوەو خۆی خستەوە وەکو ئەو کاتەی باوکی کەوت. مناڵەکە, چۆن ڕویدا بوو, وەکو خۆی دوبارەی کردەوە, لەبەر شاشەکەدا کەوت و هەر دوو دەستی بەمەدیوودیودا بڵاوکردەوە..

ئەوانی تر نەیانتوانی هیچ بکەن، ئەوە نەبێت پێبکەنن. ئەو پێنەکەنی! لە شوێنی خۆیدا کەوتبوو وەکو ئەوەی کوژرابێت. جارێکی تر خامۆشیەکی سامناک باڵی کێشایەوە بەسەر گۆڕەپانەکەدا.

-ئەرێ ئەوە چییە؟ جانیگوڵ ئەوە بۆ ئاگات لە کوڕەکەت نییە؟ پیرێژنێکی کۆچەری هاتە پێشەوەو ڕووی دەمی تێکرد. هەمویان سەیریان ئەکرد کە دایکەکە بە ڕوویەکی گرژو خەمناک و بە چاوی فرمێسکاویەوە بەرەو کوڕەکەی چوو. کوڕەکەی لەزەویەکە بەرز کردەوە.

"هەستە کوڕم با بڕۆین. ئەوە باوکت بوو" بە هێمنیەوە پێووت و دەستی گرت و لە گەلەخانەکە چوونە دەرەوە. مانگ بە قوڵایی ئاسمانەوە بوو، لوتکەی چیاکان لە شەوێکی شینی تۆخدا دەرکەوتبون، شیو و دۆڵەکانیش لە خوارەوە تاریک و ئەنگوستە چاو و قووڵ و فراوان ئەبینران. ئا لەو کاتەدا مناڵەکە بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا تالاوی لە کیسچوونی چێشت.

لەپڕ هەستی کرد، بە کوشتنی باوکی، نا بەرامبەر بێبەزەییانە لێی دراوەو زوڵمی لێکراوەو دڵتەنگ کراوە.

لەپڕ ئەیویست دەست بکاتە ملی دایکی و تاوێک بگری. حەزی ئەکرد دایکیشی لەگەڵیدا بگری. بەڵام ئەو بێدەنگ بوو. لەبەرئەوە ئەمیش دەنگی نەکرد. دەستی توند نوقاندبوو، فرمێسکەکانی لە گلێنەکانیدا بەند کردبوو نەیەنە خوارەوە، نەیئەزانی لەم هەناسەیە بەدواوە، باوکی کە ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر لەجەنگدا کوژراوە، لەمدا دەستی کردەوە بەژیان و لەگەڵیدا گەورە ئەبوو بۆ ئەوەی ببێتەوە بە شوان.

# فایلی ژماره
# سەبارەت بە مۆدێرنە

# مۆدێرنه

زیگمان باومان
له فارسییەوە: ڕێبین هەردی

**مۆدێرنه چییه؟**

زاراوەی مۆدێرنه له سەدەی حەڤدەهەمدا هاتە ناو وتوێژی رۆشنبیرانی رۆژئاوای ئەوروپاوە (گەرچی بەشێوەی پەرشوبڵاو و بەتەنیا لەسەدەی پانزەهەم بەم لاوە بەکارهێنراوە و سوودی لێوەرگیراوە) لایەنی بەرجەستە و ئاشکرای بەمانای شتێکی هاواتای "باو"، هەبوو یان (شتێکی خاوەن خاڵی دەرچوون یان سەرچاوەی کۆتای و هاوچەرخ) بوو. بەڵام زەمینەی دەرکەوتن و بەناوبانگ بوون و بایەخی روو لە زیادبوونی، ئاشکراکەری ئەوەیە مانایەکی فراوانتر و قوڵتری لە مانا تەکنیکیەکەی هەیە. چۆنایەتیەك یان حاڵەتێك کە دەلالەت لە "هەبوونی خاڵی دەرچوونی هاوچەرخ بوون" و "تازە خەڵق بوون" کە لەناکاو وەك بابەتێکی جێی سەرنجی لێهاتبوو، وە بەروکەش گرنگ و بایەخێکی هەمەلایەنە و نایابی پەیداکردبوو. ئەم گرنگی و بایەخە لەو بەها روو لە گۆڕانانەوە سەرچاوەی دەگرت کە هەنوکە بەپێچەوانەی سەدەکانی پێشووەوە پشتگیری لە وتەزای"نوێ" و "تازە" لەبەرامبەر "کۆن" و "دێرین"دا دەگرت. نکوڵی لەهەرجۆرە دەسەڵات و بایەخێك بۆ رابردوو دەکرد، هیچ حورمەت و رێزێکی بۆ نەریت و رابردوو دانەدەنا، و پشتگیری لە ئارەزوو و ئامادەیی بۆ داهێنان و نوێکردنەوە و "رۆیشتن بەرەو ئەو شوێنانەی کە پێشتر کەس تەنانەت لە خەیاڵیشدا جورئەتی پێتێنانی نەبوو". ئایدیای مۆدێرن رێك لە ساتەوەختی هاتنی سەرکەوتوانە و شکۆمەندانەی خۆیەوە بۆ بواری گوتاری شتی، کەوتە لە قاڵبدانی سەرلەنوێ و هێنانە ئارا و دوبارە نوسینەوەی دیاردەی "کۆن" وەك روداوێکی بەجێهێڵراو و سڕاوەو بێکەڵك و پەککەوتە. روداوێك کە بەراستی لەسەر لێواری لەبیرکردن و فەرامۆشی راوەستابوو، وە دەبوو جێگەی خۆی بە دیاردەیەکی تازە و نوێ بدات، ئایدیای مۆدێرن لە سەدەی حەڤدەهەمدا وەك چەمکێکی پڕ لە حەماسەت و ناکۆك، وەك ناوەندی ململانێ و رکەبەرایەتی لە روداوی بەناوبانگی "خەبات و ململانێی دێرینەکان و مۆدێرنەکان" کە بەگشتی ماوەی سەدەیەك لە فەرەنسا و ئینگلتەرادا

درێژەی کێشا، سەری دەرهێنا. هونەر و ئەدەبیات وەك یەکەم بواری ململانێی و مەیدانی رکەبەرایەتی دێرینەکان و مۆدێرنەکانی لێهات: دوا بەدوای دەستکەوتە بەرچاوەکانی زانایانی وەك نیوتن و دیکارت و ئامادەبوونی ئەنجومەنی سەڵتەنەتی لە ئینگلتەرا و ناوەندە فکریە کاریگەر, بەڵام تارادەیەك پەرشوبڵاو لە فەڕەنسادا، کە ئازایانە هیممەتیان بۆ پێشخستن و پەرەسەندنی باڵادەستی چاوەڕواننەکراوی زانست و فەلسەفە کرد، دەبوو درەنگ یان زوو ئەم پرسیارە بێتە پێشەوە کە ئایا ئەم جوڵەو بازدانە بەرەو پێشەوە تەنها بەرهەمی هەوڵەکانی زانست بووە، یان کۆی بوارەکانی دی چالاکی مرۆیی بەشداریان تیاکردووە؟ بەتایبەتی داهێنانەکانی وەك وێنەکێشی و هۆنراوە. نەریتخوازان (وەك نیکۆاس بۆلیاو *N. Boileau* و ژتن دۆلافونتن لە فەرەنسە، سێر ویلیام تەمپڵ و جۆناتان سوئیفت لە ئینگلتەرا) بەرگریان لەو بڕوا دێرینە دەکرد کە لوتکەی دەستکەوتەکانی مرۆڤ دەکرێ لە یۆنان و رۆمی دێریندا بدۆزرێتەوە، و ئەوەی کە دەستکەوت و کاڵا و بەرهەمە بەناچار دزێو و سوکەکانی نەوەکانی دوایی، جگە لە خەباتێکی بێهودە و بێ بەرهەم بۆ نزیکبونەوە لە قۆناغی کەماڵ و پێگەیشتوو خۆی نەیدەتوانی هەوڵ یان هەنگاوێکی دی بنێت.

پێشتر ئەمجۆرە گریمانەیە بەشێوەیەکی ئاسای وێکخراو پێشکەشدەکران و تاڕادەیەك بە راستگۆ و هەقیقی دەزانران و هیچ جۆرە نەیارێتی یان رەخنەیەکیشی لێنەدەگیرا. بەڵام هەنوکە بە ئیلهام وەرگرتن لە دۆزینەوە سەرسوڕهێنەرەکانی زانستی تازە، دیدە ناکۆکەکان بڵاو بونەتەوە و پەرەیان سەندووە و بونەتەوە خاوەن ناوبانگ و بایەخپێدان. بڕواداران و پارێزەرانی دیدە کلاسیکیەکان لەراستیدا بە پەرەسەندی دێرینەکان . چەمکێك کە لەدیدی مۆدێرنەکانەوە هەمیشە هاوکاتی سوکایەتیپێکردن و ئیهانەکردن و گاڵتەجاڕی بوو ـ دەژمێرران .شارل پرۆ و برناندۆ فۆنتێنلێ بە کەسانێك لە سەرسەخترین و پڕئاژاوەترین پارێزەرانی مۆدێرنە دەژمێرڕان کە دیدی و تێڕوانینی ئازایانەیان دەخستە روو، مایەی دڵنیای و بڕوابوونیان بریتی بوو لەوەی یەکەم ئەو بڕوایەی کە لەبواری زانست و هەموو بوارەکانی داهێنانی مەعنەویدا، نوێ چەندانجار لە کۆن (هەقیقیتر، بەسودتر، راستر و جوانترە)، دوهەم ئەوەی توانست، هێزی داهێنان و کارکردنی عەقڵ و لێزانی مرۆڤ بێ کۆتاییە و دواجار ئەوەی کە مێژووی مرۆڤ هەمیشە هەنگاوی نەوەستاوە بەرەو سەرەوە و پێشەوە.

ململانێ لەنێوان مۆدێرنەکان و نەریتخوازاندا هەرگیز بەشێوەیەکی بڕاوە و بە شێوەیەك کە جێی ڕەزامەندی هەموو لایەك بێت نەخرا بەلایەکدا (سەدەیەك دوای ئەوە بزوتنەوەی رۆمانیك بووە هۆی زیندوبوونەوەی بیروبۆچوون و بڕواگەلێك کە مۆدێرنەکان هەوڵیاندابوو بۆ یەکجار و بۆ هەمیشە رایبگرن). مملانێی ناوبراو تەنها هەوڵێکی قوربانیکەرانە بوو، چونکە نوکی فەلسەڤ مەسەلەکە لەئەنجامی هەنگاوە خێرا و پەلەکانی گۆرانکاری کلتوری عەمەلی خاو بوو بۆوە. بەڵام لەسەیرکردنێکدا بۆ دواوە ململانێی ناو براو دەکرێ وەك دەربڕین یان تەعبیرێکی کورتی شۆڕش بزانرێت کە لە زیهنیەتی ئەوروپیدا خەریکبوو روویدەدا، دەربڕینێك بۆ هەستی نوێ تێڕوانینێکی تازە بۆ دڵنیایی لە خۆ و پشتبەستن بە خود، ئارەزو و ئامادەیی بۆ گەڕان و ئەزمونکردنی رێگەچارە نارەسمیەکان بۆ کێشەکان و نیگەرانیە هەبووەکان،

بڕوابوون بەمەیلی روولەزیادبوون بەرەو مێژووی مرۆڤ، ودڵنیایی روو لەزیاد بە توانای عەقڵی مرۆڤ. لەسەدەی نۆزدەهەمدا خودی دیاردەی مۆدێرن وەك زیهنیەتی تازە دەرکەوتوو، وەك دیاردەیەکی مۆدێرن تەماشا دەکرا و باڵادەستی ئەم زیهنیەتە وەك یەکێك لەدەرئەنجام و نیشانە بڕاوە و دیاریکەرەکانی قۆناغی تازەی مۆدێرنە دادەنرا.

مۆدێرنە بە باشترین شێوە دەکرێ بە سەردەمێك وەسفبکرێ کە خەسڵەتی سەرەکی بریتیە لە گۆڕانی هەمیشەیی . بەڵام سەردەمێك کە هوشیارە بەم خەسڵەتەی خۆی، سەردەمێك کە شێوە یاساییەکانی خۆی، داهێنانە مادی و مەعنەویەکانی خۆی، زانست و بڕواکانی خۆی بە روداوێکی دینامیکی و تێپەڕو گۆڕاو و ناسەقامگیر و نەبڕاوە دادەنێت، روداوگەلێك کە دەبێ تا "ئاگاداری دوایی" بڕوایان پێبهێنرێ و کاریان پێبکرێ، روداوگەلێك کە دواجار بایەخ وبەهای خۆیان لەدەستدەدەن و جێگەی خۆیان بە روداوی تازە و باشتر دەسپێرن. بەدەربڕینیکی تر مۆدێرنە سەردەم یان قۆناغێکە و هوشیارە بە مێژوویی بوونی خۆی. دەزگا مرۆییەکان بە روداوی دروستکراو و خۆ خوڵقێنەر و ملکەچی پێشکەوتن و باشتربوون دادەنرێن، تەنها لە حاڵەتێکدا دەکرێ پارێزگاریان لێبکرێ، کە بتوانێ خۆی لەگەڵ روبەروبونەوەی خواستە ورد و سەختگیرەکانی عەقڵدا بگونجێنێ و ئاراستەی بکات. ئەگەر توانای ئەم ئەزمونەشیان نەبێت، دەکرێ بخرێنە لاوە. دەکرێ جێگرتنەوەی پرۆژە تازەکان لەبری پرۆژە کۆنەکان بە بزاوتێکی پێشکەوتوخوازانە بزانرێ، هەنگاوێکی تازە بەرەو فراوانبوون و زیادبوونی رەوتی پەرەسەندن و گەشەکردنی مرۆڤ.

پێشکەوتن لەبنەرەتدا هەنگاوێکی مرۆڤانەیە. پێشکەوتن هەڵگری بەکارهێنانی عەقڵی مرۆڤە لەبواری ئەرك یان پەیامی دروستکردنی دنیایەکی باشتر کە لەگەڵ پێداویستیە مرۆییەکاندا گونجاو بێت. هەموو ئەو شتانەی کە بە پێداویستی مرۆڤ دەستنیشان دەکرێن، یان وەك هەلومەرج و بارودۆخی گونجاو لەگەڵ ژیانیدا دادەنرێن، ئەوەلیەت لە هەموو سەرنجەکانی دی دەگرن: بەشی نامرۆیی جیهان (واتە سروشت) بەتەنیا هیچ چەمك و مانایەکی نیە، هەر مانا یان چەمکێکی کە بۆی دیاری بکرێت یان پێی بدرێت، تەنها لەدید و لە رووی ئەو سودوەرگرتنە مرۆییەوەیە کە لێی وەردەگیرێ. نەخشەکێشان و دروستکردنی رێکخستنێکی دروستکراو و عەقڵانی لەبارەی جێنشینی مرۆڤەوە هەڵبژاردنێکی ئیرادی نیە. بەڵکو پێویستیەکە، هەلومەرجێکی ناچاری مرۆییە، چونکە جیهان بۆئەوەی جێگەیەکی قابیلی نیشتەجێبوون بێت، دەبێ بۆ بەدیهێنانی پێداویستیەکانی مرۆڤ لەرێگەی تەکنەلۆژیایەکی پشتبەستوو بەزانستەوە، ئامادە بکرێت. لێرەوە زانست و بابەتەکانی بەکارهێنان و سودوەرگرتنی تەکنەلۆژی لێی، بە سەرچاوە و ئامرازە سەرەکیەکانی پێشکەوتنی سیاسی، کۆمەڵایەتی و کلتوری و ئەخلاقی دەژمێرێت. زانست و تەکنەلۆژی و بەکارهێنانەکانیان، هەم بەدەرکەوتی زاڵبوونی مرۆڤ بەسەر سروشتدا و هەم بە دینامۆی دەژمێرێن. بۆ ئەوروپای مۆدێرن هوشیاربوون بە مێژووی بوونی خود، شێوازەکانی ژیان، شێوەکانی ژیان و دەزگاکانی خۆی کە لەگەڵ مێژوویی بوون، شێوازی ژیان و شێوەی ژیان و دەزگاکانی کە پێشتر گرتبویە خۆی، بەتەواوی جیاواز بوو، تەنها هەنگاوگەلێك بوون کە ئەوروپای مۆدێرنی بەرەو هەلومەرج یان بارودۆخێکی بڵندتری تایبەت،

ڕێنماکرد. کلتورەکانی دی وەك کۆمەڵێك شكڵ تەماشادەکران کە بەشێوەیەکی کاتی لەپرۆسەی گەشەکردن و پەرەسەندنیاندا توشی ڕاوەستان بوون وە لەم هەلومەرجە "وەستاو و بەستوەدا". توشی دواکەوتووی بوون و پرۆسەی گەشەکردن و پەرەسەندنیان دواخراوە و دواکەوتووە. ئەم بڕوایە بووە هۆی ئەوەی ئەوروپای مۆدێرن تایبەتمەندی یان خەسڵەتی بڕوابوون بە خۆی وەك هەڵگر و کارگوزاری چارەنوسی مێژووی خۆی بدۆزێتەوە: لیژنەیەکی تەبشیری و پڕوپاگەندەی گشتی کە ئەرکی بریتی بوو لە ڕاگەیاندن، بڵاوکردنەوەی مژدەی عەقڵ و عەقڵانیەت و ڕاکێشانی بەشەکانی تری جیهان بۆ ئیمان و شكڵ و ژیانی ئەوروپایی بوو. لەحاڵەتی دەرکەوتنی بەرگیردا، کەسانێك کە دەبوو ئەم گۆڕانانەیان بەسەردا بێت، بە ڕوداوی دواکەوتوو، سەرەتایی و قوربانیانی جەهل و خورافە دەژمێران و هەر لەپێشەوە نکوڵی لە توانای عەقڵانیان (بەتایبەتی دەسەڵاتی بڕیاردانیان لەبارەی ئەوەی چ شتێك بۆیان باشە) دەکرا. بەمشێوەیە سەردەمی مۆدێرن لە مێژووی ئەوروپادا (لەو وڵاتانەشدا کە پرۆسەی سەرەتای ئەوروپاییبونیان تەواوکردووە) سەردەمێکی حیزبی و مەسلەکی بوو، سەردەمێك کە خەسڵەتی بریتی بوو لە کۆلۆنیالیکردنی دنیایی نا ئەوروپی و دوبارەکردنەوەی جەنگە سەلیبی و کلتوریەکان کە ئامانجەکەی ڕووی لە نەریتە ناوچەیی، ئەتنی، ڕەگەزیی یان چینایەتی لەناو خودی کۆمەڵگا ئەوروپییەکاندا بوو.

دەوڵەتی مۆدێرن بەرپرسیاری کارکردن و ئەرکگەلێك بوو کە هەرگیز حوکمڕان و فەرمانڕەوایانی پێشوو بیریان لێ نەکردبۆوە و هەرگیز بە خەیاڵیاندا نەهاتبوو. دەوڵەتی مۆدێرن دەبوو ڕێکخستنێکی یەکتا و هاوئاهەنگ بۆ بوارە فراوانەکان جێبەجێبکات کە پێشتر بە هاوکاری شێوە کلتوریە ناوچەییەکانەوە ئەنجامدەدرا. سەرەڕای ئەمە دەوڵەتی مۆدێرن دەبوو داهێنان و پارێزگاری ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی بەشێوەی بابەتێکی قابیلی بیرلێکردنەوە بکات. و وەك پرۆژەیەکی هوشیارانە، ورد وچاودێریکراو وبەڕیوبردنی ڕۆژانەی بژمێرێت، نەك ئەوەی خۆی بە ڕەچاوکردن و سەرنجدان لە داب و نەریت و ئیمتیازاتە نەریتیەکان، سنوردار بکات. (دەکرێ بگوترێ دەوڵەتی مۆدێرن دەبوو دەوری باخەوانی کۆمەڵگا بگرێتە ئەستۆ نەك پاسەوان) ئەرك و پەیامە تازەکان، یەکدەستکردنی یاسا و دەزگا یاساییەکانی لەپەیوەندیدا بە دەوڵەت و حکومەتەوە دەگرتەوە: هاوئاهانگ کردن و بەگشتی بەڕێوەبردنی ڕاستەوخۆی پرۆسەی پەروەردەی گشتی، دابینکردنی ئەوەلیەت و لەپێشەوە بوونی دیسپلینێکی یاسایی یەکتا بەسەر هەموو شێوەکانی تری پەیمان و وەفاداری لاوەکی. هەرلەبەرئەمەش دەوڵەتە مۆدێرنەکان کە سەرقاڵی پرۆسەی دروستکردنی نەتەوە بوون، بەگشتی شكڵ و قاڵبی دەوڵەتە نەتەوەییەکانی بەخۆیەوە گرت نەك شێوەی زنجیرەی و سەڵتەنەتی. دەوڵەتە مۆدێرنەکان یەکێتی نەتەوەیان لەبەرامبەر جیاکاریە ئەتنیکیەکاندا بەهێزکردووە، ناسیۆنالیزمیان خستۆتە خزمەت دەسەڵاتی دەوڵەتەوە و پەرەسەندن و پێشخستنی بەرژەوەندیە نەتەوایەتیەکانیان وەك پێوەر و ئامانجی سیاسەتەکانی دەوڵەت گرتۆتە بەر. هەر لەبەرئەمەشە کە دەوڵەتی مۆدێرن هەقی حاکمیەتی کلاسیکی (وەك دێرینەیی و هەمیشەیی بوونی مافەکان) و حاکمیەتی کاریزمی (کە لەسەر بناغەی

چونایەتی و خەسڵەتە تایبەتیەکانی کەسایەتیەکی تایبەت و نایابی فەرمانڕەواییەکی دیارکراو ڕاوەستاوە) نەفی دەکات و خوازیاری ڕێکخستن و دیسپلین و ملکەچی لەو یاسا و فەرمانانەی خۆیەتی کە لەسەر بناغەی زەمینە ڕەسمی و یاساییەکانە، واتە گەڕانەوە بۆ ئەو ڕاستیەی کە یاسا و فەرمانەکان لەلایەن کەسانێکی خاوەن توانا و دانراو لەلایەن ناوەندەکانی بەڕێوبەرایەتی و پلە و پایەکانەوە دانەنراوە کە خاوەن مافی حاکمیەت و بەڕیوبردنی مەسەلە ناوچەیە دیاریکراوەکانن.

بەپێی هەموو پێوەرە مێژوویەکان، مۆدێرنە (کە زۆرجار وەك "شارستانێتی مۆدێرن" ناوی دێت تا بەمشێوەیە جێگەی وەك تایپێکی سەربەخۆ لە ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیی و کلتورییەکان لەنێوان شارستانیە کلاسیکییەکان، سەدەی ناوەڕاست و یان هاوچەرخ دیاربێت) بە سەرکەوتنێکی درەوشاوە دەژمێرێت. مۆدێرنە یان شارستانی مۆدێرن بەر لەهەر شارستانیەتێکی ناسراوی تر لە جێگەی هەمەکیبوون و گەردونیبوونی واقعی و ڕەسەن نزیکبۆتەوە. مۆدێرنە خەریکە دەبێت بە یەکەم شارستانیەتی گەردونی لە مێژوودا. دەکرێ دەوڵەتە دنیاییەکانی مۆدێرن لەرووی سیاسی و ئایدۆلۆژیەوە پۆلێنبکرێن و تەنانەت لەهەلومەرجێکی ناکۆکدا بەرامبەر یەك دابنرێن، بەڵام هەر هەموویان کۆدەنگن لەسەر پێشکەوتن و باڵاتربوونی شێوەی مۆدێرنی بەڕێوبردنی مەسەلە مرۆییەکان و سود لە شێواز و ئامرازە مۆدێرنەکان بۆ سەقامگیری پێگەی خۆیان و بەدواداچوونی ئامانجەکانیان، دەگرن. پێدەچێ شێوەی مۆدێرنی ژیان هچ ڕەقیبێکی جدی لەو شێوانەدا نەدۆزێتەوە کە بۆتە هۆی جیگۆڕکێ و جیگرتنەوەیان. سەرەڕای ئەمە ژیانی مۆدێرن لەروبەروبونەوە لەگەڵ ئەو کێشانەی روبەروی دەبۆوە، هەروەها لەروبەروبونەوەی مەسەلەکانی پەرەسەندن هێندە سەرکەوتوو بووە کە بۆتە هۆی بەهێزبوون و سەقامگیری باڵاتربوونی جیهانبینی و هەڵوێستی پراگماتیك کە بە خەسڵەتە تایبەتیەکانی مۆدێرنە دەژمێرێن. لێرەوە مۆدێرنە بەشێوەیەکی ئاسایی وەك شکڵی ئایدیالی پرۆسەی پەرەسەندن و گەشەکردن وەسفدەکرێت. شارستانیەتی مۆدێرن کە خۆبەخۆ دینامیکی و چالاکە، بەردەوام شوناسی خۆی پاراستووە. شارستانیەتی نوێی دروستکەری داهێنان و خوڵقاندنی بەردەوامە و بە پێچەوانەی شارستانیەتیەکانی ترەوە، توانای و قابیلیەتی روبەروبونەوەی داهێنەرانە و خوڵقێنەرانە خۆی بۆ ناکۆکی و هەڕەشە تازەکان لەدەست نەداوە. بە هاتنە ئارای شارستانیەتی مۆدێرن جیهان دابەشبوو بۆ دوو بەشی مۆدێرن و باقی جیهان کە روبەروی هەرەشەی نوێکردنەوەیە.

زوربەی نمونە تیوریەکانی مۆدێرنە، دینامیکیەت و جوڵەی دەروونی و قابلیەتی گۆڕان و خۆ پەرەسەندن یان چاککردنی خۆی، بە خەسڵەتی سەرەکی و سەرچاوەی کۆتایی بڵندبوون، و باڵاتربوون و جەزابیەتی مۆدێرنە دەژمێرن. ئەم نمونانە لەو خاڵەشدا کۆدەنگن کە رونکردنەوە و شیکردنەوەی دینامیکیەت و جوڵەی ناوبراو، گرنگترین پەیام و ئەرکی هەر تیورەیەکی مۆدێرنەیە. زوربەی شیکەرەوان بە بنەمای دانانی سەدەی نۆزدەهەم وەك خاڵی دەستپێکردنی شیکردنەوەکانی خۆیان، بەدوای دۆزینەوەی نهێنی دینامیکیەتی مۆدێرن لە ئازادی و رزگاربوونی کرداری مرۆیی لە رێگر و تابۆکانی دابونەریت و پەیمانی کۆمەڵایەتی و لە ملکەچی پاوانخوازانەی بۆ پێوەری جێبەجێکردنی کاریگەری ئەرکەکاندا،

دەگەڕان. بەدەربڕینە جوان و بێوێنەکەی کارل مارکس هەموو شتێکی جامد دەتوێتەوە و دەبیٚ بە دوکەڵ و هەر شتێکی پیرۆز، ئەتکی حورمەتی دەکرێت. کاتێك دەسەڵاتی نەریت لاواز ونکوڵی لێکرا، هیچ شتێك ناتوانێت ڕێگە لە شەهامەتی مرۆڤەکان بۆ قبوڵکردنی پەیامە بەرزەفڕەکان و لەبەرچاوگرتنی شێوە کاریگەرەکان بۆ جێبەجێکردنیان، بگرێت. هەنوکە هاوئاهەنگی و هاوسەنگی نێوان ئامراز و ئامانجەکانە کە ئەوە دیاریدەکات کام شێوە کردارە دەبیٚ هەڵبژێرێت. وەك تالکۆت پارسنۆزی زانای کۆمەڵناسی ئەمەریکی گوتویێتی (تیورەکانی پارسنۆز لەسەر بناغەی تێڕوانینەکانی فردیناند تۆنیز بونیادنراوە) لە ڕۆژگاری مۆدێرندا شێوە کلاسیکیەکانی هەڵسەنگاندنی کارکردن و ڕەفتاری گەمەکەرەکان و کردارەکانیان پێچەوانە بۆتەوە. هەنوکە کردار "لەدەرەوەی بازنە" و سەربەخۆ لە کۆمەڵەی کۆمەڵایەتی. کلتوری هەڵدەسەنگێنریٚ، کە کرداری ناوبراو تیایدا ڕوودەدات و پێگەی کۆمەڵایەتی بابەتە مرۆییەکانیشی تەنها گونجاو لەگەڵ ڕێسا گشتیەکانی سەلاحیەت و کارایی، هەڵدەسەنگێنرێن. لەبری ئەمە گەمەکەران بەپێی کارکردن و شێوەی جێبەجێکردنی تایبەتی خۆیان کە پەیوەندی بە پەیامی خێرای ئەوانەوە هەیە، هەڵدەسەنگێنرێن. نەك لەسەر بناغەی خەسڵەتە گشتیەکانی خود. ئەو شتەی کە گرنگی هەیە ئەوەیە چ شتێك ئەنجامدراوە یان لە دۆخی بەئەنجامبونداییە و چۆن و بەهۆی چ کەسێکەوە و بۆچی. هەڵبژاردنی کردار سەربەخۆ لە هەموو پێوەرەکانە_ بۆنمونە وەفادارییەکان و پەیمانە شەخسیەکان، بەرپرسیاری و ئیلتیزاماتی سیاسی و سروشتە ئەخلاقیەکان. کە پەیوەندی بە ئەنجامدانی پەیامە خێراکانەوە نییە.

تەفکیك و دابەشبوون و جیابونەوە لەراستیدا بە ناوەڕۆکی نەگۆڕ لە گوتاری تیوری مۆدێرنەدا دادەنرێن. ماکس فیبەری کۆمەڵناسی ئەڵمانی بڕوایی وابوو کە جیابونەوە و تەفکیکی ئابوری و کارکردن لە بواری خێزان، بە کرداری سەرەکی ئابوری مۆدێرن دەژمێرێت. بەهۆی ئەم جیابونەوەیە بڕیارە ئابوریەکان لە فشاری پەیمانە ئەخلاقی و وەفاداریە شەخسیەکان کە ژیانی خێزانی بەڕێوە دەبرد و ڕێنمای دەکرد، ڕزگاری بووە. دیارە بە دەربڕینێکی وردتر گرنگی ئەم جیابونەوەیە بەهۆی ئیمانویل کانتەوە دەربڕا و نوسرا. زۆرێك لە تیوریزەنانی مۆدێرنە (لەهەمویان بەرجەستەتر یورگن هابرماس لە ئەڵمانیا و ئەرنست گلنەر لە بریتانیا) لەگەڕانە بۆ دابەشکردنە سێ ڕەهەندیەکانی کانت لەنێوان عەقڵی پەتی و عەقڵی عەمەلی و عەقڵی داوەری (هەڵسەنگاندن)، جیابونەوە و سەربەخۆی دولایەنەی گوتارەکانی هەقیقەت، خەسڵەتە ئەخلاقیەکان و داوەری یان حوکمی ستاتیکی (بەدەر لە بوارەکانی زانست و ئەخلاقیات و هونەر) بە دیارترین و بڕاوەترین خەسڵەتی زیهنیەت و کارنامەی مۆدێرن دەزانن. دابەشکردنی کار و دابەشکردنی کارکردنەکان و ئەرکە ئاڵۆزەکان بۆ ئەرکی بچوکتر، سادەتر و زیاتر قابیلی کۆنترۆڵکردن کە بە ئادام سیمس دەستپێدەکات، بە بەهێزترین و بەرجەستەترین هۆکاری کارایی و داهێنانی مۆدێرن دەژمێرێت. ئەمیل دۆرکایمی کۆمەڵناسی فەرەنسی ساڵەکانی دەیەکانی 1900، لەپرۆسەی دابەشکردنی کاری روو لەپێش و چەندان جار وردتر و ناسکتردا، جەوهەر و هێزی بزوێنەری هەموو لایەنەکانی پەرەسەندن و گەشەکردنی مێژوویی دەبینێ.

هەرچەن دابەشبوونی کار ئاڵۆزتر بێت بەهەمان ئەندازە ئەرکەکان، کارەکان و کارکردنەکانیش سادەتر و راستەوخۆ تر دەبن. لێرەوە دەکرێت باشتر بەڕێوە ببرێن، ئیدی پسپۆران و کارشناسان کە لەهەنوکەدا دەتوانن بەتەواوی تەرکیز بکەنە سەر چارەسەرکردنی کێشەکان، بەشێوەیەکی کاریگەر دەتوانن جێبەجێی بکەن. راگەیاندنی تیڕوانینی تەکنیکی و کارشناسانە وەك نیشانەی بازرگانی ئابوری مۆدێرن، زانستی مۆدێرن، هونەر و سیاسەتی مۆدێرنی لێدێت.

کۆی بوارەکانی ژیانی مۆدێرن وەك فیبەر جەختی لێکردووە، ئارەزویەکی روو لەزیادیان بۆ عەقلانیبوون هەیە. کردار کاتێك عەقلانیە (بەمانا ئامێریەکەی عەقڵ) کە رووی لە ئامانجێکی روون و باش وەسفکراو و دیاریکراو بێت و دواجار لەسەر بناغەی حسابکردنی کارایی و بەسبوونی رێژەیی هۆکارە ئەڵتەرناتیڤەکان بۆ گەیشتن بەو ئامانجە بێت. کرداری عەقلانی لەژێر رێنمایی ئەنگیزە و ئامانجەکاندایە، و لە رووی بنەماکانەوە ملکەچی چاودیرکردنی ورد و هوشیارانە و راستکردنەوە و ریفۆرمە. و بەهۆی هیچ هێزێکەوە دیاری ناکرێت کە گەمەکەر یان بکەر هیچ جۆرە هوشیاری یان کۆنترۆڵێکی لەبارەیانەوە نییە. کرداری عەقلانیی بازنە و بواری جێبەجێکردن بۆ بواری ئامانجەکان و بواری ئامرازەکان دابەشدەکات و تەنها هەوڵ بۆ هاوتاکردنی دووهەم لەبەرامبەر یەکەمدایە کە رێنمایی دەکات. کردار کاتێك عەقلانییە (لێرەشدا هەر بەمانا ئامێرییەکەی عەقڵ) کە هەڵگری بڕیاردان و هەڵبژاردن بێت ئەگەرچی هەڵبژاردنێکی تایبەت لەلایەن گەمەکەرێکەوە قبوڵکراوترین بڕیار نەبێت یان تەنانەت هەڵەی پەتی بێت. لەراستیدا زوربەی هەڵبژاردنەکان لەئاستێکی ئایدیالدا ئەنجامنادرێن. بەهۆی کەمی ناسین یان هەڵەوە رەنگە بەووردی حساب بۆ ئامڕازەکان یان هۆکارەکان نەکرابێت. لێرەوە چالاکی ئاراستەکراو بەرەو ئەرك یان پەیام، زۆر بەدەگمەن لە دەستکاری هۆکاری "ناڕەسەن" بەدوور دەبێت، واتە لە دەستێوەردانی هۆکارە ناعەقلانیەکان کە پەیوەندی یان نزیکایەتیەکیان لەگەڵ پەیامی خێرا و لەبەردەستدا نییە، وەك رەفتار و خوی کۆنترۆڵ نەکراوی گەمەکەر و وەفادارییە نەریتیەکان، هەستیاری و کاریگەریەك کەوەك رێگرێك دێنە پێشەوە، یان پەیمان لەبەرامبەر ئەو بەهایانەی کە دەستدەخەنە ناو جێبەجێبوونی کاریگەری پەیامێکی دیارکراوەوە. کەوابوو عەقلانیەت جۆرێك مەیل و ئاراستە وەرگرتنە تا جۆرێك واقعیەتی ئەنجامدراو یان تەواوبووی مۆدێرنە، مەیلێکی بەردەوام و هەمیشەیی کە لەهەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا قابیلی دەستنیشانکردنە. بۆنمونە بەگونجان لەگەڵ تیڕوانینی فیبەردا دەزگا رێساڕێژەکانی سەر بە بەرپرسیاری کە بە شێوەیەکی ناشەخسی کاردەکەن سەر بە دابەشکردنی کاری ورد، زنجیر پلەی توندی فەرمانەکان و هاوئاهەنگکردنی وەسوسانەی لێهاتوویی شەخسیەکانی بکەرانن لەگەڵ پێداویستیە مادی و بەرجەستەکاندا، بە شکڵی دیاریکراوی مۆدێرن و عەقلانی حکومەت دەژمێرێن.

دیارە لایەنێکی تری عەقڵگەری (راسیۆنالیزم) بریتیە لە سڕینەوە یان سەرکوتکردنی هەر شتێکی ناعەقلانی، هەر شتێك کە دەست لە کاری عەقڵەوە بدات و ببێتە هۆی کەمبونەوەی کارایی پراگماتیکی کردار. ئەم رەگەزە ناعەقلانیە لە رەفتاری مرۆڤدا ناوی شەهوەت کە بە رێگری سەرەکی لەبەردەم فەرمانڕەوایی عەقڵدا دەژمێرێت. شارستانێتی

مۆدێرن بەهەمان ئەندازەی لەرووی سەرکوتکردنی شەهواتەوە گرنگە، بەهەمان ئەندازەش لەرووی گەشەکردن و پەرەسەندنی عەقلانیەتی رەفتاری مرۆڤیشەوە، سیمایەکی دیاری هەیە. رێکخراوە عەقلانیەکانی کۆمەڵگا بەر لەهەر بوارێکی دی لەبیری کرداری چاودێری و کەمکردنەوەی توندی، لەکارخستن و بە لاڕێدا بردنی ئاراستەی ئەنگێزە و تەوژمە غەریزیەکان و زەمینە پێشوییەکانە: شیکردنەوە و تاوتوێکردنی ورد و سەرتاپاگیری ئەم لایەنەی مۆدێرنە کە رویەکی بەرچاو وروژێنەرە، بەرلەهەر شتێك تێکەڵ بە بەرهەمەکانی فرۆید بووە. بەپێی تێڕوانینی فرۆید شارستانێتی مۆدێرن "بنەمای واقعی" خستۆتە جێگەی "بنەمای لەزەت"، بنەمای واقعیەت بە مەرجی پێویست بۆ پێکەوە ژیانی ئاشتیانە و ئاسایشانە دەژمێرێت، و بنەمای لەزەت زەمینە یان دەستمایەی سروشتی مرۆڤەکانە کە لەبەرامبەر بنەمای واقعیەتدا رادەوەستێت. بەدەربڕینێکی عەمەلی ئەم جێگرتنەوەیە بە مانای سنورداڕێتیە: لەئەنجامی سەرنجدان لەوەی چ شتێك بێ دانی بەهایەکی زۆر بۆ وەرگرتنی هەوڵ و هەنگاوەکان وەك هەوڵێکی بەنرخ مومکینە، هەوڵدان و گەڕان بۆ بەختیاری روبەروی رێگر و بەربەستگەلێك دەبێتەوە. ئاسایشیی رێژەیی تا رادەیەك بە بەها یان لە ئاڵوگۆڕکردن لەگەڵ لایەنیکەمی بەشێك لە ئازادی فەردی، بەدەست دێت. یەکێك لە خەسڵەتەکانی رەفتاری گونجاو لەگەڵ نمونەی شارستانیەتدا بریتیە لە خۆ سنورداركردن، کۆمەڵگا بەشێوەیەکی گشتی لەشکڵی ویژدان یان هەستی فەردی و هوشیاری فەردی کە بەشێوەیەکی کۆمەلایەتی دروستبوون و تاکەکەس بۆ سەرکوتکردنی ئەنگێزەکان هاندەدەن کە رەنگە بکەونە ناکۆکی لەگەڵ خەسڵەتە کۆمەڵایەتیەکاندا، (بنکەیەك لەناو شاری داگیرکراودا بەجێدەهێڵن).

فرۆید لە لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا لەبارەی هەلومەرجی مۆدێرنەوە. لەژێر ناونیشانی "شارستانێتی و ناخۆشیەکانی" لەسەر ئەو بڕوایەیە کەشارستانێتی مۆدێرن بەناچار ناڕازیبوون و بەرگری دروستدەکات، و بەردەوامبوونی هەڵگری رەگەزی قەهر و ناچارکردنی زیهنی یان جەستەی (دەرونی یان فیزیایی)یە. ئەو وێنەیەی مۆدێرنە کە لە شیکردنەوەکانی فرۆیدەوە دێتە دەرێ، وێنەیەکی ئەوەندە ئاشتیئامێز، ئارام و میهرەبان نییە. فەرمانڕەوایی عەقڵ چەندان دەرئەنجامی زیانبەخشانەی (*traumatic*) دەرونناسیانەی هەیە. لەدیدی فەردیەوە عەقڵ ناتوانێت موهیبێکی نائاڵۆز بێت، چونکە بۆ بەشێك لە پێداویستیە مرۆییەکان گرنگی و بایەخێکی ئەوتۆی دانەناوە، ئەو پێداویستیانە بەکەم دەگرێت بە بێ نرخیان دەزانێت و هیچ جۆرە سەرنجێك لەم پێداویستیانە نادات و بەمشێوەیەش زەمینە بۆ لەناوبردنیان، ئامادە دەکات. هەر لەبەرئەمەشە فەرمانڕەوایی عەقڵ هەمیشە بابەتی توڕەیی و بێزاری بووە و هیچ کاتێك ناتوانێ کامڵ بێت، لەئەنجامدا دەبێتە هۆی ئەوەی شۆڕش دژی خۆی بکرێت. مرۆڤەکان کە ناچارن بەرگەی دەسەڵاتی فەرمانڕەواییە سارد و بێ هەستەکانی هەزینە و دەرئەنجامەکان بگرن، دوبارە بۆ بەرگری لە هەست و سۆزە سەرکوتکراوەکان، ئەنگێزە سروشتی و پێویستی پەیوەندی مرۆیی، رادەپەڕن.

تەفسیرێکی تر بۆ ناکۆکی دەرونی و کاریگەری ئاڵۆزی شارستانیەت (بەتایبەت شارستانێتی مۆدێرن) دەکرێ لە تێڕوانینی فردریك

نیتچەدا بۆ شۆڕشی ئیرتیجالی و غەریزی دیونیزی وەك هەڕەشەیەکی هەمیشەیی بدۆزینەوە، شۆڕشێك کە چەندان جار روبەروی هەوڵی ئاپۆلۆنی بۆ دروستکردنی رێکخستنێکی جیهانی لۆژیکی، عەقلانی و هاوسەنگ و هاوئاهەنگ بۆتەوە. ئەم ناوەڕۆکە لە ریوایەتی فرۆیدی . نیتچەییەکەیدا، بەشێوەیەکی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ لە هەموو ئەوجۆرە رەخنانەدا ئامادەیی هەیە کە لە مۆدێرنە گیراوە و مۆدێرنە بە پرۆژەیەکی بەرزەفڕ، بەڵام لەزۆر ڕووەوە کەموکوڕو پێنەگەیشتوو دەزانیٚ کە ئامانجی عەقلانیکردنی هەموو لایەنەی رێکخستنی کۆمەڵایەتی و رەفتاری فەردی مرۆڤە. بەتایبەتی دوو جۆر رەخنە لەهەموویان زیاتر گرنگە: یەکێك لەم رەخنانە (کە نوێنەرەکانی دەکریٚ لە بواری جیاوازدا ببینین: لەوانە تیورەی "سیاسەتی مێگەلی" ئەو تیورەزەنانەی کە ئیلهامیان لە "تیورەی دەستەبژێرەکان"ی دیلفرد دو پارتۆ وەرگرتووە، تیورەی "شۆڕشی مێگەلەکان" کە بەهۆی خۆزی ئۆرتێگا دی کاستەوە بەناوبانگ بوو، وە تیورەی "یاسایی ئاسنینی ئۆلیگارشی" کە بەهۆی رابرت میخڵزەوە دارێژرا) دڵنیامان دەکات کە بەپێچەوانەی ریتۆریقا و دەربڕینی بڕواداران بە عەقلانیەتی مۆدێرنە، هەلومەرجی مۆدێرن بۆتە هۆی زیادبوونی سیاسەتی مێگەلی زیاد لە سنور ناعەقلانی و بەتوندی لەژێر کاریگەری ستاتیکادا دەبێت و لەبری پەرەسەندن و پێشکەوتنی هەڵبژاردە عەقلانیەکان، بۆتە هۆی دواکەوتن، و دواجار نەزۆکی عەقلٚ. رەخنەیەکی دی (کە بەشێوەیەکی سەرەکی لەژێر کاریگەری نەریتی رەخنەگرانەی قوتابخانەی فرانکفۆرتدایە کە بە بەرهەمەکانی تێۆدۆرۆ ئادرنۆ و ماکس هۆرکهایمەر دەستی پێکرد، بەڵام رەگوڕیشەی زۆرێك لەم بیروبۆچونانە دەگەڕێتەوە بۆ تیڕوانینەکانی گزرگ زیمیلی کۆمەڵناس سەرەتاکانی سەدەی بیستەمی ئەڵمانیا) ناکۆکیە چارەسەر هەڵنەگرەکانی نێوان ئەنگێزە و تەوژمی پەیوەندیدار بەعەقلانیکردنی بونیادە دەزگاییەکانی سەرو تاکەکەس و مژدەی بونیادنراو لەسەر لەئەستۆنانی بڕیارە فەردیەکان بۆ ئەستۆی هەڵبژاردە عەقلانیە ئازادەکان، ئاشکرا دەکات.

بەکورتی بەرگری لەبەرامبەر عەقلانیبووندا، بەئەندازەی خودی عەقلانیبوون بە خەسڵەتی دیاری مۆدێرنە دەژمێرێت. مێژووی مۆدێرنە هاودەمی رەخنەگرتنە لە زیادەرەویەکان، یان تەنانەت بیکاری، بێهودەیەکان و زیانە ئەنگێزەیەکانی و بەرزەفڕینە مێژووییەکانی (مۆدێرنە). لەپالٚ هەموو تەعبیرێکی رۆشنبیریدا لەبارەی شەوق و تامەزرۆی زۆر بۆ ئەو روانگە فکریی و ناوەرۆکە وروژێنەرانەی کە زانستی مۆدێرن، تێڕوانینی پسپۆری تەکنیکی و بەرژەوەندی سیاسی بەروی مرۆڤدا کردویٚتیەوە، هەمیشە نارازیبوون دژی لەناوچونی فەردی و هەستیاری و سۆزی رەسەنی مرۆڤ، ئەنجامدراوە. رەخنەگران لەبەرامبەر مژدەی مۆدێرندا بۆ داهێنانی شێوە مرۆڤێك کە خاوەن دەسەڵات بێت بۆ خەباتکردن لەپێناو دنیایەکی باشتر و میهرەبانتردا، بە خێرایی دڵنیایان کردووین کە تەنانەت گەر ئەم شێوانە بتوانن وەك یەك هەمەکی بەئازادی بگەن، ئەوا ئەندامە تاکەکانی ئەم هەمەکیە ناتوانن ئەمکارە ئەنجامبدەن. ئەوان بە زیندانبوون لە چوارچێوەی "کردارەکاندا " و بوون بە "چەرخی دانەکانی" ئامێر، توانای ئەنجامی هەڵبژاردنی راستەقینە و عەقلانی لەدەستدەدەن. لەبەرامبەر بانگەشەی سود و خوازیاری رێگەچارە عەقلانیەکاندا، رەخنەگران دەستیانکردووە بە بەرگریکردن لە بەها فەردیەکان،

هەمەکیەك کە قابیلی دابەشکردن نیە، و مافی هەموو مرۆڤەکان بۆ جیاوازبوون، قابیلی پێشبینی نەکردن و تەنانەت ناعەقلانیبوون. ئەنگێزە و تەوژمی عەقلانیبوون یان بەدەستهاتنی عەقلانیەتی مۆدێرن بە ئاگادارکردنەوەی رۆمانتیکیەکانی سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم دەستی پێکرد، قۆناغێکی دارمانی بەجێهێشت، و پاشان لەقاڵبی رووداوە پێشڕەو و ئاڤانگاردی خەباتگێرانی سەرەتاکانی سەدەی بیستەم، دادایزم، سوریالیزم، تا بگەین بە کلتوری پۆستمۆدێرنی ئەمڕۆ (کە بێ سروشتی و نەبوونی بەهاکانی بە تەنها سروشتی کلتوری زانیوەو هەموان بۆ بەرگریکردن لەبەرامبەر هەموو شێوە هەمەڕەنگەکانی دەسەڵاتدا بانگ دەکات، بەڵام تەنانەت توانای دروستکردن یان پێشکەشکردنی بنەمایەك بۆ کارکردنی خۆی نییە) سەری دەرهێنا. تەوژمی عەقلانیبوونی مۆدێرن هاودەمی جۆرێك کلتوری ئۆپۆزسیۆن و ناڕازی بوو کە هەموو خەم و گرنگی خۆی بۆ بەرگریکردن لە ئازادی فەردی و ئەزموونی سۆزداری تەرخانکردبوو. لێرەوە راپەڕین و نارازیبوونی کلتوری دژی واقعیەتی کۆمەڵگا، ناکۆکی قابیلی ئاشتنەکردنەوەی بەڕاستی هەمیشەیی نێوان کاربەدەستە کۆمەڵایەتی و سیاسی و داهێنانی کلتوری پێشکەوتوو، چ لەبواری فەلسەفە، هونەر یان ئەدەبیاتدا، بە بەرجەستەترین، سەرسوڕهێنەرترین و گیژکەرترین و پێدەچێ هەمیشەیترین، خەسڵەتی مۆدێرنە بژمێرێت.

یەکێك لە رونکردنەوەکانی ئەم پاردۆکسە دەکرێ لە بونیادی مۆدێرنی ژیانی رۆژانە و ئەزمونە فەردیەکاندا بدۆزینەوە. بەرجەستەترین خەسڵەتی ئەزمونی فەردی چەند پارچەیی و لە جەستە راکردنێتی. تاك لە کۆمەڵگای مۆدێرندا کە لەفەزایەکی قەرەباڵغی شاریدا راوەستاوە و ناچارە بەشێکی گەورەی ژیانی خۆی لەنیوان غەریبە و بێگانەکاندا بەسەربەرێت، ئەستەم و رەنگە مومکین نەبێت بۆی کە ئەزمونەکانی خۆی لە قاڵبی ئەزمونەکانی هەمەکیەکی ماناداردا تێکەڵبکات. لەبواری ئاسۆی وێنەکراو بەهۆی ئەزمونە فەردییەکانەوە، زەمەن دابەشدەبێت بۆ روداوگەلێك کە پەیوەندیان پێکەوە نیە، و شوێنیش بۆ کۆمەڵێ خاڵ و جێگەی زۆر پەیوەندیدار بەیەکەوە. ئەگەر پەیوەندیەك کە دەلالەت لە پێکەوە گرێدانی دوولایەنە بکات کە لە هەمەکیەکدا پێکەوەیان دەبەستێتەوە و یەکیان دەخات، بوونی هەبێت، ئەوا پەیوەندیەکی لەم چەشنە تاکی تەماشاکەر لەبەرچاو ناگرێت و کەمترین بایەخی پێنادات ، لەبری ئەمە روبەرووی قۆناغ و پارچەی کورت و سنوردار لەروی شوێنی درامای ناوبراو، دەبێتەوە. یەکەمجار شارل بۆدلێری شاعیر و رەخنەگری فەرەنسی ئاماژەی بۆ ئەو خاڵە کرد کە ئەزمونی مۆدێرن لەراستیدا دیمەنێکی تەماشایی ساتەوەختێکی تێپەرە. هونەر بەمەبەستی هاوهەنگاوی و هاوئاهەنگی لەگەڵ ئەزمونی مۆدێرندا دەبێت جیهان بەشێوەی دیاردەیەکی دابەشبوو، چەند پارچە، جیابۆوە، گواستنەوەیی، بزێو و تێپەر. وەك کۆمەڵێك "ساتی مەلەکردن" وێنە بکات.

وەك گۆرگ زیمیل پیشانیداوە خەسڵەتی دیاری ئەزمونی مۆدێرن هاوئاهەنگی و پەیوەندیە لەنێوان شارستانێتی وەك بەرهەمێکی کلتوری گشتی و وردە دەستکەوتە کلتوریەکان کە تاکەکان توانای تیکەڵکردن و گونجانیانی لەگەڵ یەکدا و سود وەرگرتن لێیان وەك بەرژەوەندی بونیادی لە بیناکردنی شوناسەکانی خۆیاندا، هەیە. کۆی

گشتی بەرهەمە کلتورییەکان چەندانجار فراوانترە لە توانای راکێشانی تاکەکان. ئەم راستییە لەلایەکەوە داهێنانی کلتوری لە کۆتوبەندی پەیوەندیەکانی بە ژیانی رۆژانەوە رزگار دەکات و بەمشێوەیە ئەگەری پسپۆڕیبوون روو لە زیاد و بێ سنور و هەروەها پەرەسەندنی بێ سنوری بوارە پسپۆڕییەکان ئامادە دەکات (هەر بەمشێوەیە پەلەی لۆگاریتمی لە ئاهەنگی پەرەسەندنی زانست، تەکنەلۆژیا و هونەرەکاندا چەندانجار لەپێشوو زیاتر ناکۆکیەکان تونـد دەکات). بەڵام لەلایەکی دیەوە پەیامی مەترسیداری جوتکردن و پێکەوەگرێدانی "ژیانە ماقوڵەکان" یان "ژیانە مانادارەکان" بەجیا لە وردەکاریە پوچەکان و بەشە نامەفهومەکانی هەمەکیەکان و شوناسە نەناسراو یان نادیارەکان، دەخاتە ئەستۆی تاکەکان. تاکەکان هاوکات لەگەڵ قبوڵکردن و جێبەجێکردنی ئەم پەیامە مەترسیدارە، دەبێ بتوانن ئەو رەگەزانەی قابیلی بەراوردکردن نین، بەراورد بکەن و ئەو رەگەزانەی کە بەروکەش پەیوەندیان بەیەکەوە نییە، بەیەکەوە گرێبدەن. بۆ ئەم مەبەستە پێویستیان بە ستراتیژێك هەیە کە بەشێوەیەکی گشتی بەراوردکاری و جێبەجێکردن لەنێوان ئەزمونە زۆر جیاوازەکاندا بکات، و لەم رێگەیەشەوە ئەو ئەگەرە دێنێتە پێشێ تا ئەوان هاوکات لەگەڵ لەبەرچاو نەگرتنی جیاوازییە چۆنایەتیەکانی نێوان ئامانجەکانی هەڵبژاردن، دەست بە هەڵبژاردن بکەن. بەمشێوەیە هێزی قسەکردن، زیهن یان عەقڵ (هێز یان توانای بیرکردنەوەی ئەبستراکت و وێنەیی) و پارە لەیەك کاتدا بە بەرهەمی ناچاری و هۆکاری پێویست بۆ ژیان لە هەلومەرجی مۆدێرندا دەژمێرێن. هەردوو وتەزای پارە و عەقڵ تەنها رەهەندی چەندایەتی دیاردە ئەزمونیەکان تاوتوێدەکەن و لایەنە چۆنایەتیەکەی لەبەرچاو ناگرن.

ئەم خەسڵەتانە و خەسڵەتەکانی تری پەیوەندیدار بە ژینگەو جیگەی نیشتەجێبوونی مرۆڤەکان، لەسەرتاسەری قۆناغی مۆدێرندا بەردەوام بووە و بەردەوام هێزی خۆی زیاد کردووە. ئەم خەسڵەتانە تا ئەمڕۆش بە لایەنی دیاری کۆمەڵگا رۆژئاواییەکان و کۆمەڵگا بە رۆژئاوایبوەکان دەژمێرێن و تەنانەت لەحاڵەتی بڵاوبونەوەدان بۆ بەش و ناوچەکانی تری جیهان کە تا ئەم دوایانەش بە بەشێك لە ناوچە "کلاسیکیەکان" یان "پێش مۆدێرنە"کان دەژمێران. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێك لە چاودێران بروایان وایە مۆدێرنە لەشکڵە کلاسیکیەکەی خۆیدا رەوتی خۆی بڕیوە و قۆناغەکەی کۆتایی پێهاتووە و جێگەی خۆی بە شکڵبەندییەکی کۆمەڵایەتی . کلتوری دی سپاردووە یان لەحاڵەتی ئەوەدایە بیسپێرێت، سیمایەك کە چاودێرانی ناوبراو ناویان ناوە "پۆستمۆدێرنە". وەسف و پێناسەکانی ئەم بەناو شکڵبەندی تازەیە (بەمانای پیشاندانی تازەیی و نایابی و جیاوازی چۆنایەتی لەگەڵ مۆدێرنەدا) بەگشتی لەگەڵ وەسفی سەرەوەدا بۆ مۆدێرنە و هەلومەرجی مۆدێرن، جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە. بەڵام جیاوازییەکی بەرجەستە و بەرچاو هەیە کە بانگەشەکەرانی "کۆتایی مۆدێرنە" و سەرەتای پۆستمۆدێرنە هەوڵدەدەن تا بایەخی بانگەشەکانی خۆیانی لەسەری بونیاد بنێن، ئەم جیاوازیەش ئەوەیە کە : ئەگەر لەسەرتاسەری قۆناغی مۆدێرنەدا "پەرێشانی" "هاروهاجی" " بێ سەروبەری" "هەژان" "دڵەڕاوکێ" "دینامیکیەت" "مەلەکردن" "تێپەڕوکاتیبوون" ئاڵۆزی و چەند رەهەندی، هەمەڕەنگی و مەزاجیبوون، ئیرتیجالی و هەڵەشەیی و نەبوونی شتێکی بڕاوە کە بە خەسڵەتە

جەوهــەری و خودییــەکانی ژیــانی کۆمەڵایــەتی و تاکەکەســی دەژمێــررا، بــە هۆکــاری بزوێنــەر و ئازاربەخشــی کــاتی و تێپــەڕ دادەنــران کــە دواجــار دەکەوتنــە ژێــر کــۆنترۆڵی مــەیلی عــەقڵانیبوون و باڵادەســتی عەقڵانیەتــەوە، هەنوکــە چــیدی بــە دیارەدەی ناچاری و قابیلی هەڵنەکەندن و تێنەپەڕ دەژمێرران، نەك بە هۆکاری بزوێنەر. هەنوکە هەموو ئەوەیان قبوڵە کە یەکەم پرۆسە مێژووییەکان ئامانج، مەبەست و یان ئاراستەیەکی دیاریکراویان نییە، دووهەم فرەیی و هەمەڕەنگی بەها و شێوەکانی ژیان دەمێننەوە، و سێهەم ناوەندەکانی دەسەڵاتی سیاسی بەتایبەتی حکومەتە ویلایەتییەکان، هەم سەرچاوەکان و هەم ئەو بەرزەفڕیانەی کە خەسڵەتی "پایەی باخەوانیە"، لەدەستداوە. پرۆژە هەمەگیر و هەمەلایەنەکان لەبارەی "کۆمەڵگای عەقڵانییەوە" پڕۆژەکانی پەیوەندیدار بە ئەندازیاری کۆمەڵایەتی جیهانی و جەنگە سەلیبیە کلتوریەکان کە پشتیوانیان لێدەکرد، لەلێواری ڕیسوایی و بەدناویدان و هەر هەموویان خراونەتە لاوە. کەوتن و داڕمانی ڕژێمە ئابوریە کۆمنیستیەکان و دەوڵەتە دەستێوەر دەرەکان لەهەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤدا، وێنەیەکی دیار و بەرچاوی ئەم مەیلەی کێشاوە.

### سەرچاوە

مدرنیته و مدرنیسم: ترجمه و تدوین: حسین علی نوزری تهران، نقش جهان 1378. ص22.

# سێ شەپۆلەکەی مۆدێرنە

**لیو ستراوس**

**له عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد**

له کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەمدا، کتێبێکی شپینگلەر (*spengler*) به ناوێکی شوومەوه (داڕمانی شارستانیەتی خۆراوا) بڵاوکرایەوه. لەوێدا خۆراوا ئەو مانایەی نییە کە ئێمە لە سەری ڕاهاتووین و ناوی شارستانیەتی خۆراوای لێدەنێین، واتا ئەو شارستانیەتەی سەرچاوەکەی له یونانەوەیە، بەڵکو و وا له کتێبەکەدا دەرخراوه که مەبەست کلتوورێکە لە دەوروبەری هەزاری پێش زایندا لە ئەوروپای باکوور سەریهەڵداوه، که بێجگە لەمە کلتوری تازەی خۆراوایش دەگرێتەوه. کەواتە شپینگلەر پێشبینی داڕمانی مودێرنەی کردووەو کتێبەکە بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگره لەسەر قەیرانی مۆدێرنە، قەیرانێکی وا کە لە ڕۆژی ئەمڕۆدا ڕاستیەکی زۆر ئاشکرایه تەنانەت بۆ ئەوانەیش کە پلەی تێگەیشتنیان لاوازه، ئێمە بۆ ئەوەی لە قەیرانی مۆدێرنە بگەین دەبێت لەسەرەتاوه لە تایبەتمەندیەتی مۆدێرنە بگەین، قەیرانەکە لەوەدا دەردەکەوێت، یان لەو واقیعەدا مەکۆی داناوه که تا ئێستا مرۆڤی نوێی خۆراوایی لەوه ناگات چی دەوێت، بڕواییشی بەوە نیە بتوانێت بزانێت چاکە چییەو خراپەکامەیە، کامە ڕاستەو کامە هەڵەیە. لای چەند نەوەیەکی لەمەوبەر ئاسایی ئەوه بڕابووەوه کە مرۆڤ دەتوانێت درکی چاکە و خراپە بکات. سستمی کۆمەڵایەتی دادپەروەر یان چاك و چاکتری بزانێت، بە کورتی لەوە بە ئاگا بوو کە ئەگەری فەلسەفەی سیاسی هەیە و بوونی پێویستە، ئەو جۆرە بیر و باوەڕە لەم سەردەمەماندا نەماوە، بەپێی ڕای باو فەلسەفەی سیاسی هەرگیز نایەتەدی، چونکە ئەوه خەون بووەو دەشێت خەونێکی باڵایش بێت، بەڵام بەهەرحاڵ هەر بە خەونی دەمێنێتەوه. هەرچەندە لەسەر ئەم نوختەیە ڕێکەوتنێکی زۆر هەیە، بەڵام جیاوازی ڕاکان لەسەر ئەوەیە که دەبێت فەلسەفەی سیاسی لەسەر هەڵەیەکی سەرەکی بنیات نرابێت. بەپێی ڕا هەرە بڵاوەکە هەموو مەعریفەکان کە شیاوی ئەو ناوە بن مەعریفەی زانستین، بەڵام مەعریفە زانستیەکان حوکمەکانی بەها ناسەلمێنن، بەڵکو ئەوە تەنیا لەسەر حوکمە واقیعیەکان کورت دەکرێتەوه، بەڵام فەلسەفەی سیاسی پێشوەخت

ئەوە دەسەپێنێت کە دەتوانرێت بەشێوەیەکی ئەقلانی بەڵگە بۆ حوکمە بەهاییەکان بهێنرێتەوە، بەپێی ڕایەکی دی کە زۆرتر وردە و کەمتر بڵاو بۆتەوە، ئەو جیاوازیە باوەی لە نێوان واقیع و بەهادا هەیە جێگای داکۆکی لەسەر کردن نییە: چونکە وتەزاکانی مەعریفەی تیوری بە ئاشکرا و بەهەر ڕێگایەك بێت پرنسیپی هەڵسەنگاندنی لە خۆگرتوە. وەلێ ئەو پرنسیپانە بە پاڵ وتەزاکانی تێگەیشتنەوە هەموویان بە گوێرەی سەردەمی جیاواز و مێژوەوە گۆڕانیان بەسەردا هاتووە. بۆیە هەرگیز وەلامێکی سەلمێنراوی گەردوونی لەسەر مەسەلەی ڕاست و هەڵە یان مەسەلەی سستمێکی کۆمەلایەتی هەرە چاك نییە کە بۆ هەموو قۆناغە مێژوییەکان دەستبدات وەك فەلسەفەی سیاسی ئەمەیانی دەوێت.

کەواتە قەیرانی مۆدێرنە بە پلەی یەکەم قەیرانی فەلسەفەی سیاسی مۆدێرنەیە، ڕەنگە ئەمە سەیر بێتە بەرچاو: بۆ دەبێت قەیرانی کلتوورێك، هەر کلتوورێك بێت، بە پلەی یەکەم قەیرانی تاقە باسێکی ئاکادیمی بێت لەناو ئەوانی تردا؟ وەلێ فەلسەفەی سیاسی هەر لە بنەڕەتەوە باسی ئەکادیمی نییە! چونکە زوربەی گەورە فەیلەسووفانی سیاسەت مامۆستای زانکۆ نەبوون. بێجگە لەوە، وەك هەموو دەیزانن، کلتوری مۆدێرنە ڕاستەوخۆ کلتوورێکی ئەقلانیە و بڕوای بە دەسەلاتی ئەقڵە. جا ئەگەر کلتوورێکی لەم بابەتە هەبێت کە بۆ بەدیهاتنی ئامانجە دوورەکانی بڕوای بەهێزی ئەقڵ نەبێت، بێگومان ئەو کلتوورە لە قەیراندایە.

کەواتە تایبەتمەندیەتی مۆدێرنە لە چیدایە؟ بەپێی ئەو تێگەیشتنەی کە زۆرباوە مۆدێرنە دینێکی دنیاییە، واتا کە تۆ بڕوایەکی تەوراتیت بەو دنیا هەبوو ئەمە لە گەوهەردا بڕوا بوونە بەم دنیایش. بە جۆرێکی سادەتر: مەبەست ئەوەنیە تۆ ژیانی نێو بەهەشت بە دەست بێنێت، بەڵکو دەتەوێت لە ڕێگای ئینسانیەتێکی رووتەوە بە هەشتێك لەسەر زەوی بێتە دی. ئەمەیش ڕێك ئەو شتەیە کە ئەفلاتوون لە کتێبی (کۆمار)ەکەیدا دەیڵێت. واتا دابڕان لە هەموو شەڕ ئەنگێزیەکانی سەرزەوی بەهۆی مرۆڤایەتیەکی پەتیەوە. دیارە ناتوانیین بڵێین ئەفلاتوون بڕوا تەوراتیەکەی کردۆتە عەلمانی. خۆ ئەگەر یەکێك بیەوێت باس لە بەعەلمانی کردنی ئەو بڕوایە بکات دەبێت تا ڕادەیەکی باش شتەکان دیاری بکات. هیچ گومان لەوەدانییە، بۆ نموونە، کە گیانی سەرمایەداریی بنەمایەکی ئاینی پاکژ ویستی هەیە، یان با نموونەیەکی تر بێنینەوە، هۆبز (*Hobbes*) لە ڕوانگەی جەمسەرگەریەکی بنەڕەتیەوە لە مرۆڤ دەڕوانێت، ئەو جەمسەرگیریەیش زادەی فیزی شەڕخوازی و ئەو ترسەیە کە لە مەرگێکی نائاساییەوە سەرچاوە دەگرێت. هەموو کەسێك دەتوانێت سەرنجی ئەوە بدات کە ئەمە بێجگە لە ڕیوایەتێکی بە عەلمانی کراو بۆ جەمسەرگیریی ئاینی بۆ لووت بەرزیەکی پڕ لە تاوان و ترسێك کە لە خواوە سەرچاوەی گرتوە چی تر نییە. کەواتە بە عەلمانی کردن، بریتییە لە پاراستنی ئەو بیرو هەست و نەریتە بە ڕەسەن تەوراتیەی کە دوای لەناوچوونی ئەو ئیمانە دەمێنێتەوە، وەلێ ئەم پێناسەیە هیچ شتێکمان لەوە بۆ دەرناخات کە ئایا جۆری ئەو پرنسیپانە چیە کە لە عەلمانیەتدا پارێزگاری لێکراوە. بێجگە لەمە تەنیا لایەنە نەگەتیڤەکانی عەلمانیەتمان بۆ دەردەخات و هیچی تر: واتا توانەوە و لەناوچوونی بیرو باوەڕیی تەوراتی. وەلێ مرۆڤی مۆدێرن لە ڕاستیدا لەلایەن

پڕۆژەیەکەوە ئاراستەکراوە کە خودی مرۆڤ دایناوە. ڕەنگە بێ هاریکاری کردنی ئەو بنەمایانەی لە بڕوای تەوراتی ماونەتەوە نەتوانین وێنای ئەو پڕۆژەیە بکەین. جا ئەگەر لە واقیعی حاڵدا ئەمە وابێت. مرۆڤ ناتوانێت پێش تێگەیشتنی پڕۆژەکە ئەوە دیاری بکات، بەڵام ئاخۆ مرۆڤ دەتوانێت باس لە پڕۆژەیەکی تاقانە بکات؟ ئەم جۆراوجۆریە لەکێش نەهاتووەو ئەو گۆڕانە بنەڕەتیانە تەنیا شتێکن کە مۆدێرنە لە شتی دی جیا دەکەنەوە، جۆراوجۆریەکە ئەمەندە گەورەیە مرۆڤ دەخاتە گومانەوە لەوەی بتوانێت وەك تەنیا شتێك باس لە مۆدێرنە بکات. تەنیا بەوەی سەردەمەکە بکەیتە چەند قۆناغێکەوە ناتوانیت مانایەکی تایبەتی ببەخشێت، چونکە دەشێت لەم سەردەمی مۆدێرنەیەدا بیرمەندی وامان هەبێت مۆدێرنانە بیر نەکاتەوە.

مرۆڤ چۆن دەتوانێت خۆی لە شتە هەڕەمەکی و مەیلە زاتیەکان ببورێت. ئێمە وا لە مۆدێرنە تێدەگەین کە گۆڕینی فەلسەفەی سیاسی بێت کە پێش سەردەمی مۆدێرنە لە ئارادا بووە، گۆڕینەکە لە سەرەتاوە وا دەردەکەوێت کەرەت کردنەوەی فەلسەفەی سیاسی بێت. ئەگەر ئەمیان خاوەنی یەکیەتیەکی بنەڕەتی و خەسڵەتی تایبەت بەخۆی بێت، ئەوا فەلسەفەی سیاسی مۆدێرنە، واتا پێچەوانەکەی، ئەویش بۆ خۆی خاوەنی بنەمای سەرەکی و خەسڵەتی تایبەتی خۆی دەبێت. هیچ نەبێت لەسەر ئاستی تیورەی ئەقڵی، هەر ئەمە دەمانگەیەنێتە ئەوەی کە حاڵەتەکە وەك خۆی تێبگەین دوای ئەوەی سەرەتای مۆدێرنەمان بە پێی پێوانەیەکی دوور لە کاری ڕەمەکی دیاریکرد، خۆ ئەگەر سەرچاوەی مۆدێرنە لە دابڕانیەوە بووبێت لەگەڵ فیکری پێش مۆدێرنە، گومان لەوەدانییە کە کۆمەڵێك عەقڵی گەورە ئەو دابڕانەی دروست کردووە کە بە خود ئاگاییەکی تەواوەوە ئەو پرۆسەیەی بە ئەنجام گەیاندووە، کەواتە یەکەم فەیلەسووفی سیاسی کێیە کە هەموو فەلسەفە سیاسیە کۆنەکانی ڕەت کردۆتەوە و بە ناتەواو و تەنانەت بەنادروستی داناون؟ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە گران نییە: چونکە مەبەستمان لەو کەسە لێرەدا هوبزە. لە لێکۆڵینەوەیەکی قووڵتری بابەتەکەدا بۆمان دەردەکەوێت کە دابڕانی ڕیشەیی هوبز لەگەڵ ڕێوڕەسمەکانی فەلسەفەی سیاسیدا بەشێوەیەکی تەواو ڕەسەن تەواو نابێت، ئەگەر بە پلەی یەکەم باسی ئەو کارانە نەکەین کە ماکیاڤیلی (*machiavelli*) کردوویەتی.

ماکیاڤیلی بەشێوەیەکی زۆر رادیکالانە گومانی لە بەهای فەلسەفەی تەقلیدی هەیە کە کەمتر نییە لە هوبز:

ئەو لە هۆبز کەمتر نییە لە ئاشکراکردنی ئەو راستیەی کە فەلسەفەی سیاسی راستەقینە لەوەوە دەست پێدەکات، ئەگەرچی ئەمەی بەشێوازێکی لە هوبز میانڕەوتر دەربڕیوە.

دوو وتەی ماکیاڤیلی هەیە زۆر بە ڕوونی تەواوی ئیرادەی ئەو دەردەخەن: یەکەمیان بەم مانایەیە کە ماکیاڤیلی ناکۆکیەکی قوولّی لەگەڵ ڕای ئەوانی تردا هەیە سەبارەت بەوەی دەبێت چۆن هەلسوکەوت لەگەڵ دەستو پێوەند و هاوڕێکانیدا بکات. هۆی ئەم ناکۆکیە ئەوەیە کە ماکیاڤیلی پێ لەسەر هەقیقەتە واقیعیەکان دادەگرێت نەك خەیاڵ و فانتازیا، چونکە زوربەی ئەوانی تر فانتازیای کۆمار و میرنشینی وایان کردووە کە هەرگیز بوونی نییە، لەبەرئەوەی وایان بیرکردۆتەوە کە دەبێت خەڵکی چۆن بژین لەباتی ئەوەی ئێستا خەڵکیی چۆن دەژین. لێرەدا ماکیاڤیلی بەرپەرچی

میسالیەتی فەلسەفەی سیاسی کۆن دەداتەوە بە توخنکەوتنێکی واقیعیانەی کاروبارە سیاسیەکان. بەڵام هێشتا ئەمە نیوەی هەقیقەتە (یان بە جۆرێکی تر واقیعیەتەکەی ماکیاڤیلی واقیعیەتێکی نائاساییە) بەشەکەی تری قسەکانی ماکیاڤیلی لەم وتەزایانەدا دەیانخاتە ڕوو: بەخت (*Fortune*) ژنێکە بە هۆی بەکارهێنانی هێزەوە دەتوانیت چاودێریی بکەیت. بۆ ئەوەی بزانین ئەم دوو وتەزایە چی لە خۆ دەگرن دەبێت مرۆڤ لەوە بەئاگا بێت کە مەبەستی فەلسەفەی سیاسی کۆن گەڕان بوو بە دوای باشترین سستمی سیاسی یان باشترین سستمی فەرمانڕەواییدا. واتا فەرمانڕەواییەك چاکترین هەوڵی بۆ گەیشتنە فەزیلەت بێت یان بۆ ئەوە تێبکۆشێت کە دەبێت خەڵکیی چۆن ژیان بەسەربەرن. بەپێی فەلسەفەی سیاسی کلاسیکی چاکترین سستمی فەرمانڕەوایی پشت بە بەختێکی فرۆفێڵاویو ناڕێك یان ڕێکەوت (*chance*) دەبەستێت. بۆ نموونە لە کۆمارەکەی ئەفلاتووندا چاکترین سستمی فەرمانڕەوایی پشت بە ڕێکەوت (*coincidence*) دەبەستێت. واتا ئەو ژوانە دوورە دەستەی لە نێوان هەریەك لە فەلسەفەو دەسەڵاتی سیاسیدا هەیە. بەڵام ئەرەستۆ کە بە واقیع بین ناودەبرێت لەگەڵ ئەفلاتووندا لە هەردوو ئەم بۆچوونە گرنگەدا هاوڕایە، ئەوەتا دەڵێت: "چاکترین سستمی فەرمانڕەوایی ئەو سستمەیە کە پراکتیزەکردنی فەزیلەتی زیاتر تیا دەگونجێت". هەروەها بە دیهاتنی چاکترین سستمی حوکمڕانی پشت بە ڕێکەوت دەبەستێت. چونکە بە نیسبەت ئەرەستۆوە باشترین سستمی فەرمانڕەوایی هەرگیز دروست نابێت ئەگەر کەرەسە گونجاوەکان لەبەردەستا نەبن، بە جۆرێکی تری بڵێین ئەگەر سروشتی زەمینەکە و سروشتی خەڵکەکە لەگەڵ سستمی فەرمانڕەواییەکی زۆر چاکدا نەگونجێت، بوونی ئەو کەرەسەیە یان نەبوونی هەرگیز پشت بەزانایی دامەزرێنەر نابەستێت بەڵکو ئەوە دەکەوێتە سەر ڕێکەوت. پێی دەچێت ماکیاڤیلی لەوەدا لەگەڵ ئەرەستۆدا بێت کە کەس ناتوانێت سستمێکی سیاسی شیاو بێنێتە گۆڕێ ئەگەر کەرەسەکە گەندەڵ بێت، واتا ئەگەر خودی خەڵکەکە گەندەڵ بن. وەلێ ئەوەی لای ئەرستۆ هەرگیز نەدەهاتە دی لای ماکیاڤیلی تەنیا لە ئاستەنگیەکی قەبەدا خۆی دیوە. دەشێت مرۆڤێکی باڵا کەبتوانێت هۆکاری نائاسایی بەکاربێنێت بەسەر ئەو کێشەو ئاستەنگیەدا سەربکەوێت و کەرەسە گەندەڵەکە بکاتە کەرەسەیەکی چاك و دروست. ئەو ئاستەنگیەی لەبەردەم بەدی هاتنی سستمێکی فەرمانڕەوایی چاکترا دەوەستێت و مرۆڤ کەرەسەکەیەتی، دەشێت لابرێت چونکە قابیلی گۆڕانە.

ئەوەی ماکیاڤیلی بە کۆمارە فانتازیاکان ناوی دەبات و دەیداتە پاڵ نووسەرانی پێش خۆی، لەسەر تێگەیشتنێکی تایبەتی سروشت دامەزراوە. هەرچەندە ئەو لانی کەم ناراستەوخۆ ڕەتی دەکاتەوە. بەپێی ئەم بۆچوونە هەموو بوونەوەرەکانی سروشت، یان بەلای کەمەوە هەموو بوونەوەرە زیندووەکان، روو لە ئامانجێکە، واتا بەرەو کەماڵێك دەچن کە تینون بۆی. کەماڵێکی تایبەت هەیە کە پەیوەستە بە هەموو سروشتێکی تایبەتیەوە، هەروەها کەماڵێکی مرۆڤایەتیش هەیە کە سروشتی مرۆڤ دیاری دەکات، مرۆڤ وەك ئاژەڵێکی کۆمەڵایەتی و ئاقڵ. خودی سروشت مۆدێلت پێ دەبەخشێت، مۆدێلێك تەواو سەربەخۆ لە ئیرادەی مرۆڤ، ئەمەیش بەو مانایەیە کە سروشت هێزێکی چاکەیە. مرۆڤ پێگەیەکی دیاریکراوی لەناو

ئەو گشتەدا هەیە، واتا پێگەیەکی زۆر بالاّ، دەشیّ بەو مرۆڤە بلّێین پێوەری هەموو شتێکە. یان مرۆڤ دنیایەکی بچووك کراوەیە بەلاّم بە خۆرسك ئەم پێگەیەی داگیرکردووە. واتا لەناو سستمێکدا ئەو جێگەیەی گرتوە کە خۆی دروستکەری نییە. کەواتە دەستەواژەی "مرۆڤ پێوانەی هەموو شتەکانە" کتومت پێچەوانەی ئەو وتەیەیە کە دەلّێت: "مرۆڤ سەروەری هەموو شتەکانە" مرۆڤ پێگەیەکی لەناو گشتا هەیە: واتای مرۆڤ دیاریکراوەو ناتوانێت لەو توانا دیاریکراوەی تێپەڕێنێت، سروشتی ئێمە، وەك ئەرەستۆ دەلّێت: توانای ئێمە لە هەموو شوێنێکەوە دیسپلین کراوە. یان وەك ئەفلاتۆن دەلّێت: ئێمە بووکەلّەی دەستی خوداکانین. بە تایبەتی دەست کورتی ئێمە لە هێزە حەتمیەکانی رێکەوتدا دەردەکەوێت. ژیانی چاك ژیانێکە پێبەپێی سروشت ریّ دەکات. واتا لە سنووری دیاریکراودا دەوەستێت، چونکە لە راستیدا فەزیلەت واتا میانڕەویی. لەم سەروبەندەدا جیاوازی لە نێوان فەلسەفەی سیاسی کلاسیکی و مەزەبی چێژوەرگرتندا (*Hedonism*) نامێنێت کە مەزەبێکی ناسیاسیە: مەسەلەکە چێژ وەرگرتنی زۆر نییە بە قەدەر ئەوەی چۆن دەتوانیت بۆ ئەوەی بەختەوەر بیت سنوورێك بۆ ئارەزووەکانت دابنێیت.

بۆ ئەوەی بڕیارێکی کۆك لەسەر مەزەبی ماکیاڤیلی بدەین، پێویستە لە دوا قۆناغدا ئەو ڕاستیە لەبەر چاوبگرین کە یەکانگیریەك لە نێوان فەلسەفەی کلاسیکی و تەوراتدا هەیە. لە نێوان ئەسینا و قودسدا، ئەگەر چی جیاوازیەکی قوولّ و ناکۆك لە نێوانیاندا هەیە بە پێی تەورات مرۆڤ لەسەر وێنەی خوا دروست کراوەو فەزلیشی دراوە بەسەر هەموو بوونەوەرەکانی تری سەرزەویدا. هەر ئەو بە گەورەیی دانانەیشە کە بەهەشتی بۆ مسۆگەر کراوە تا هەمووان بەردەستی بکەن و بیپارێزن، مرۆڤ پلە و پایەیەکی دراوەتیّ چونکە سەقامگیرەو سەقامگیریش بەمانای قایل بوونە بە ڕژێمی خودایی. وەك لە بیری تەقلیدیدا ئەمە بە تەواویی دەبینرێت کە دادپەروەریی گویّ ڕایەلّی کردنی رژێمی سروشتیە هەروەها داننان بە رێکەوتێکی فێلاویدا بڕوا بوونە بە بڕیارە خوداییەکاندا کە کەس لە نهێنیەکەی تیّ ناگات.

هەروەها ماکیاڤیلی سەر لەبەری نەریتی فەلسەفە و تیولۆژیەکان رەت دەکاتەوە، ئێمە دەتوانین جۆری بیرکردنەوەی ماکیاڤیلی بەم شێوەیە بخەینەڕوو: بیروبۆچوونە تەقلیدیەکان یان ئەوەمان پیّ دەلّێن کە کاروباری سیاسی بە جیدی تەماشا ناکرێت وەك (ئەبیقوریەکان) پێیان وایە، یان بە جۆرێکی دی، لەبەر ڕۆشنایی شتێکی فانتازیی، واتا کۆمار و میرنشینە فانتازیاکان تەماشا دەکرێت. لەو دوانەیش ناودارتر مەملەکەتەکەی خودایە، دەبێت مرۆڤ لەوێوە دەست پێبکات کە بەڕاستیی خەلّکی چۆن دەژین، واتا چاو لە خوار بڕوانێت، بە کورتیەکی دروست و سروشتی دەبێت جارێکی تر راڤەی فەزیلەت بکرێتەوە. نابێت وا لە فەزیلەت بگەین کە ئامانجێك بێت و کۆمارەکان لە پێناوی ئەودا دروست بووبن، بەلّکو و فەزیلەت خۆی هەر لە بنەڕەتەوە بۆ کۆمارەکان دروست بووە. چونکە ژیانی سیاسی پەتی بابەتێك نییە بۆ ئاکار، هەروەها ئاکارییش لە دەرەوەی کۆمەلّگەی سیاسی هەرگیز بوونی نییە. کەواتە ئاکار پێش وەخت پێویستی بە کۆمەلّگەی سیاسی هەیە. واتا کۆمەلّگەی سیاسی نە دروست دەبێت و نەتوانای مانەوەی لە نێو ئەو سنوورەدا هەیە کە ئاکار دیاری دەکات. ئەمەیش لەبەر هۆیەکی سادە کە ئەنجام یان

مەرجداریــەتی نابێــت پــێش هۆکــار یــان مــەرج بکەوێت.

سەرەڕای ئەمەیش، دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی سیاســی، تەنانــەت ئەگــەر ئــەو کۆمەڵگــە سیاســیە زۆریــش حــەزمان لــێ بێــت، پشــت بــە ڕێکــەوت نابەستێت — چونکە ڕەنگە ڕێکەوت شکست بێنێت. یــان دەشــێت کەرەســە گەندەڵەکــە بگۆڕدرێــت بــە کەرەسەیەکی چاك و تەندروست. ئێمە دەتوانین بۆ کێشــە سیاســیەکە چارەســەرێك دەســتەبەر بکــەین لەبەرئــەوەی: (1) کــەمترین ئامــانج لــە ئاســتی ئارەزووی زوربەی خەڵکیدایەو لەوە زیاتر نیە. (2) دەشێت ڕێکـەوت شکسـت بخـوات. کەواتـە گرفتـە سیاسیەکە گرفتێکی تەکنیکیە. هەروەکو هوبز ئەمە دەخاتــە رووکــە "کاتێــك لــە ئــەنجامی جیــاوازی و کێشــەکانی نــاوخۆوە کۆمارەکــان بــەرەو توانــەوە دەچن، ئەمە هەڵەی خەڵکی نیە وەك کەرەسە بەڵکو لەبەرئەوەیــە کــە ئــەوان کۆمارەکانیــان دروســت کــردووە" کەواتــە کەرەســەکە نەگەندەڵــە و نەشــەڕ ئەنگێزیشە، هیچ هێزێکی شەڕئەنگێزیش لە مرۆڤدا نیــە نــەتوانیت کــۆنترۆڵی بکــەیت. مەســەلەکە نــە بــۆ لێخۆشـبوونی خوایـە و نـە ئاکـارەو نـە پێکهێنـانی کەسایەتی. بەڵکو مەسەلەکە دروستکردنی کۆمەڵێك دامەزراوەی ترسێنەرە.

یان وەك کانت دەڵێت: "بۆ ئەوەی سستمێکی کۆمەلایــەتی دادپــەروەر دروســت بێــت، وەك خــەڵکی دەڵێن پێویست ناکات نەتەوەیەك فریشتەت هەبێت" کێشــەی دروســتکردنی دەوڵــەت (دەوڵــەتێکی دادپەروەر) پــێ دەچێت سەخت و گران بێت، بەلام ئەگــەر نەتەوەیــەك شەیتانیشــی لەگەڵــدا بێــت چارەســەرەکەی گــران نیــە، بــەو مەرجــەی "پاپــا" یــــەکیان هــــەبێت، واتــــا بــــەو مەرجــــەی خۆپەسەندیەکەیان کۆنترۆڵ بکرێت.

بــە کــورتی کێشــەی ســەرەکیی سیاســەت پەیوەنــدی بە"دیســپلین کردنێکــی پتــەوی دەوڵەتەکەیە کە بە کردە مرۆڤ دەتوانێت بیکات"

بۆ ئەوەی بە ویژدانەوە لەو گۆڕانانە بدوێین کە ماکیاڤیلی بەدیهێنان، دەبێت دوو گۆڕانی مەزن بە هەند وەربگرین کە لە دوای ماکیاڤیلی روویانداوە، بـەلام هـەردوکیان لـە رۆحـی بۆچـوونەکانی ئـەوەوە سەرچاوەیان گرتبوو. ڕووداوی یەکەم ئەو شۆڕشە بـوو کـە لـە زانسـتە سروشـتیەکاندا بـەرپاکرا، واتـا ســـەرهەڵدانی زانســـتی سروشـــتیی مـــۆدێرن. ڕەتکردنەوەی فاکتەرە مەبەستگەراکان (دوایئەویش راستەوخۆ ڕەت کردنەوەی چەمکی ڕێکەوت) زەمینە تیوریەکەی فەلسەفەی سیاسی کلاسیکی لەبەریەك هەڵتەکانـد. زانســتە سروشــتیە مۆدێرنــەکان بــە تەواوی لە جۆرەکانی تـری زانسـتی سروشـتی کـۆن جیاوازن. نەك تـەنیا لەبەرئـەوەی تێگەیشتنی نـوێی بۆ سروشت هەیە، بەڵکو بە تایبەتی لەبەرئەوەی کە تێگەیشـتنێکی چـاکی بـۆ زانسـت هەیـە، چـونکە مەعریفە تـەنیا تێگەیشتن نییە، وەك ئەوەی لەگـەڵ مرۆڤ یان لەگـەڵ سستمە گەردوونیەکەدا وایە، وەك گەڕان بە دوای مەعریفەی پەسەندکاری (تەقەبولیدا) دەســت پێشــخەری کــردن لــە تێگەیشــتندا راپــێچ کردنی مرۆڤە بۆ سروشت پێش ئەوەی ئەقڵی بکاتە دادوەر، "لـەو دۆخـەدا مـرۆڤ سروشـت دەخاتـە بـەر پرسـیارەوە" (بیکـون *Bacon*) مەعریفـە جۆرێکـە لـە پیشەسازی و تێگەیشتنی مرۆڤیش یاساکانی خۆی بەســەر سروشــتا دەســەپێنێت، چــونکە دەســەلاتی مــرۆڤ زۆرناکۆتاییــە ئەمــە بــە پێچــەوانەی ئــەو بیروباوەڕەوەیە کە تا ئێستا باو بووە. مرۆڤ تـەنیا توانـای ئەوەی نیە کەرەسـەیەکی ئینسـانی گەنـدەڵ بکاتە کەرەسەیەکی چاك، یان کۆڵ بەڕێکەوت بدات، چـونکە هەریـەك لـە هەقیقـەت و مانـا ڕەگیـان لـەناو

مرۆڤدا داکوتاوە و وابەستەی سستمێکی گەردوونی دوور لە چالاکیەکانی مرۆڤ نین. کەواتە نابێت وا لە شیعر بگەین کە چاولێکەریەکی ئیلهام بەخش یان دووبارە بوونەوەی بەرهەمێکە، بەڵکو شیعر خۆی داهێنانــە، ئامــانج لــە زانســت جــارێکی تــر راڤەکراوەتــەوە کــە: هۆیــەك بێــت بــۆ دەســت بەســەراگرتنی (*Propter potentiam*) لــە پێنــاوی چاککردنی هەلومــەرجی مــرۆڤ و کــۆنترۆڵ کردنــی سروشت، هەروەها بۆ ئەوپەڕی کۆنترۆڵ کردن (واتا کــۆنترۆڵ کردنێکــی میتۆدیانــەی ئــەو مەرجــە سروشتیانەی پەیوەندیان بە ژیانی مرۆڤەوە هەیە". کۆنترۆڵکردنی سروشت واتا سروشت دوژمن و بێ سەرەو بەریەکە دەبێت ملکەچی سستمێك بکرێت. هــەموو شــتێکی بــاش سەرچاوەکەی کــاری مرۆڤــە زیــاد لــەوەی کــە بەخشــندەیی سروشــت بێــت. سروشت تاڕادەیەك بێجگە لە کەرەسە بێکەڵکەکان چــی تــرت پێنابەخشــێت، لەبەرئەمــە کۆمەڵگــەی سیاســی بــە هــیچ جۆرێــك سروشــتی نییــە، زۆر بــە ئاســانیش ئــەوە دەزانرێــت کــە دەوڵــەت شــتێکی دەســتکردەو بەرهــەمی رێکــەوتن و پەیماننامەیــە. بەرکــەماڵی بــوونی مرۆڤایــەتی ئامــانجی خۆڕســکی مــرۆڤ نییــە، بەڵکو ئەو نموونــە باڵایەیــە کــە لەلایــەن مرۆڤەوە ئازادانە دروست بووە.

گــۆڕانی دووەمــی دوای ماکیــاڤیلی کــە لەگــەڵ رۆحــی بیرو بۆچوونەکانی ئــەودا دەگونجێــت تــەنیا تایبەتــە بــە فەلســەفەی سیاســی یــان ئاکــارەوە. ماکیاڤیلی هەموو پەیوەندیەکانی نێوان سیاسەت و یاساکانی سروشتی لە یەکدی جیاکردۆتەوە. واتا لــە نێــوان دادوەریــی تێگەیشــتن کەشــتێکی سەربەخۆیە لــە شــتە ڕەمەکیــەکانی مــرۆڤ. شۆڕشــی ماکیاڤیلی تەنیا ئەو کاتە توانی گشت توانای بەدی بێنێت کەسەر لــە نــوێ ئــەو پەیوەندیــەی هێنایــەوە ئاراو دروستی کردەوە. واتا کاتێك کە جارێکی دی بــە گیــانی ماکیاڤیلیەتــەوە دادپــەروەری و مــافی سروشتی لێکدرایــەوە، بــە پلــەی یەکــەم ئەمــە کــاری هوبز بوو. ئێمە دەتوانین گۆڕانکاریەکەی هۆبز بەم جۆرە باس بکەین: لە کاتێکدا کە یاسای سروشت لە رابووردودا لەبەر رووناکیی پلە بەندیی کردنی ئامانجەکانی مرۆڤ مانای بۆ دەکرا، کە مەسەلەی پارێزگــاری کــردن لــە خــود لەوێــدا لــە دوا پلەدایــە، بەڵام هوبز وای لە یاسای سروشت روانی کە دەبێت پارێزگاری کردن بێت لە خود، بەم پێیە، مانایەکی بنــەڕەتی درایــە یاســای سروشــت کــە زیــاد لــە هــەر پێویســتی و ئــەرکێکی تــر هەقێکــە بــۆ پارێزگــاری کردن لە خود. ئەم گۆڕانە کاتێك دەگاتە لووتکە کە مــافی مــرۆڤ دەڕواتــە جێگــای یاســا سروشــتیەکان. (مــرۆڤ لــە جێگــای سروشــت دانــراوە و یاســاییش کراوەتــە مافــەکان) هــەروەك پێشــتریش هــوبز خــۆی ئاماژەی پێدا، مافی سروشتی بۆ پارێزگاری کردن لە خود ئەوەیش لە خۆ دەگرێت کە مرۆڤ مافی (ئازادیی جەســتەیی) هەیــە، بــە جۆرێــك کــە لــە ژیــان نائومێــد نــەبێت، ئــەم مافــە سروشــتیە تــەواو لــە تــەوەری ڕێوڕەســمەکانی لۆکــەوە نزیکــە کــە مــافی پارێزگــاری کردنە لــە خــود. لێرەدا ناتوانم جەخت لەسەر ئەوە نەکــەم کــە پــێ داگــرتنی زۆر لەســەر لێکۆڵینــەوە ئابووریەکان لەم ئەنجامانەوەیە، لە دواییدا دەگەینە ئەو بۆچوونەی دەڵێت کە بەخشندەگی گەردوون و ئاشــتی دوو مــەرجی هــەرە پێویســت و کــافین بــۆ دادپەروەریەکی پڕاوپڕ.

دووەم شەپۆلی مۆدێرنە لەگەڵ ڕۆسۆدا دەست پێدەکات، ڕۆسۆ دژخەئاکاریەکەی بە هەمان قووڵی گۆڕی کە ماکیاڤیلی دایهێنابوو، وەك چۆن مامەڵەم لەگــەڵ دژخــی ماکیاڤیلیــدا کــرد، ئــاواییش تایبەتمەندییەکانی بیروباوەڕی ڕۆسۆ دەخەمە ڕوو،

ئەمەیش بە قسەکردن لەسەر دوو تا سێ دەستەواژەی ئەو. تایبەتمەندیەکانی یەکەم شەپۆلی مۆدێرنە کورت کردنەوەی کێشەی سیاسی و ئاکاریە لە کێشەی تەکنیکیدا. چەمکی سروشتیش وای لێهات کە وەك شتێکی دەستکرد پێویستی بەڕووپۆشێکی شارستانی هەبێت. هەردوو تایبەتمەندیەکە جێ ڕەخنەی ڕۆسۆ بوون، ئەوەی پەیوەندیی بە تایبەتمەندیەتی یەکەمەوە هەبێت "کۆنە سیاسیەکان بەردەوام باسی نەریتی جوان و فەزیلەت دەکەن، کەچی سیاسیەکانی ئێمە تەنیا باسی بازرگانی و سامان دەکەن" رۆسۆ بە ناوی فەزیلەتەوە نارەزایی لەم شتە دەردەبڕێت، واتا فەزیلەتی ڕەسەن و ئەوانەی کە بێکەڵکن لە کۆمارە کلاسیکیەکاندا دژی ئاینە لاواز و تێکشکاوەکانی پێشون.

ئەقڵیەتی دۆگما بەرەنگاری موڵکایەتی ڕەها و ئەو گیانە بازرگانیە دەکات کە کەم تا زۆر بەرانبەر بە کۆمارە مۆدێرنەکان دڵرەقن. کەچی نەیتوانی متمانە بۆ چەمکی کلاسیکی فەزیلەت بگێڕیتەوە. بەو ئیعتیبارەی کە ئامانجێکی سروشتی مرۆڤە و تەواوکەری سروشتەکەیەتی. رۆسۆ ناچار بوو جارێکی تر ڕاڤەی فەزیلەتی کردەوە، چونکە ئەو چەمکی مۆدێرنەی بۆ دۆخە سروشتیەکە لەبەرچاوگرت وەك حاڵەتێك کە مرۆڤ خۆی لە قۆناغی سەرەتاییدا دەبینێتەوە. رۆسۆ ئەم چەمکەی تەنیا لە هۆبز و هەوادارەکانیەوە نەخواستوە، بەڵکو لەو بەرئەنجامانەوە وەریگرتوە کە چەمکەکە داویەتی: "هەموو ئەو فەیلەسوفانەی بنەمای کۆمەڵگەیان پشکنیوە، هەستیان بەوەکردووە کە پێویستە مرۆڤ بگەڕێتەوە بۆ دۆخی سروشتی، بەلام کەس لەو فەیلەسوفانە بە ئامانج نەگەیشتوون". وەلێ ڕۆسۆ بەو ئامانجە گەیشتوە،

لەبەرئەوەی کە پێی وابوو ئەو مرۆڤەی لەسەر دۆخی سروشتی دەژی، مرۆڤێکە داماڵراوە لە هەموو ئەو دەستکەوتانەی بەرەنج و هەوڵی تایبەتی خۆی بەدیهێناون.

مرۆڤ لە دۆخی سروشتیدا یان لە خوار پلەی مرۆڤەوەیە (*Subhuman*) یان پێش مرۆڤە (*prehuman*) وەلێ مرۆڤایەتیەکەی، یان ئەقلانیەتەکەی بە پرۆسەیەکی دورودرێژ بەدەست هێناوە. لە نووسینەکانی دوای ڕۆسۆدا مرۆڤایەتی مرۆڤ ناگەڕێتەوە بۆ سروشت، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ مێژوو، واتا بۆ رەوتیی مێژوویی، ئەمە تەنیا رەوتێکە یان دەگمەنە و مەبەست گەرانیە! کۆتایی هاتنی ئەو رەوتە یان لووتکەکەی نە پێش بینی دەکراو نایشبێت پێشبینی بکرێت. بەڵکو لەگەڵ نزیك کەوتنەوەی ئەگەری بەرجەستەبوونی تەواویی ئەقلانیەتی مرۆڤ یان مرۆڤایەتی مرۆڤدا ئەوە بە یەکجاری دەرکەوت، چەمکی مێژوو، واتا ئەو پرۆسە دەگمەنەی کە مرۆڤ تیایدا بێ خواستی خۆی دەبێتە مرۆڤ دەرئەنجامی رەگاوێژەکەی رۆسۆیە بۆ چەمکی دۆخی سروشتی لای هۆبز. بەلام ئێمە چۆن بزانین کە دۆخێکی دیاریکراو لەبەرەو پێشچوونی مرۆڤدا هەیە کە دۆخی لووتکەیە؟ یان بە گشتی تر چۆن دەتوانین جوان لە ناشیرین جیابکەینەوە ئەگەر مرۆڤ هەر بە سروشتی خۆی لە خوار پلەی مرۆڤایەتیەوە بێت، یان ئەگەر دۆخی سروشتی لە خوار پلەی ئادەمیزادەوە بێت؟ با بیلێینەوە، لای ڕۆسۆ مرۆڤی سروشتی نەك تەنیا پێویستیی بە کۆمەلایەتی بوون نییە وەك مرۆڤە سروشتیەکە لای هوبز، بەڵکو ئەقلانیەتیشی پێویست نییە. لەبەرئەوەی کە ئاژەڵێکی ئاقڵ نییە، بەڵکو ئاژەڵێکی بکەر و ئازادە. یان روونتری بڵێین ئاژەڵێکە خۆ دەگونجێنێت، یان تاڕادەیەك بەرکەماڵیەکی بێ

سنووری گەرەکە. بەلاّم چۆن دەتوانێت بگونجێت یان خۆی بگونجێنێت؟ سروشتی مرۆڤ وا خۆی دەنوێنێت کە هەرگیز پێویستی بەڕێنوێنی کردن نەبێت، بەلاّم ڕێنوێنی ئەقلّ لەم خالاّنەدا کۆدەبنەوە: لە ژێر سایەی هەلومەرجێکی دیاریکراودا، واتا لە قۆناغی تایبەتی گۆڕانەکانیدا، مرۆڤ ناتوانێت خودی خۆی بپارێزێت ئەگەر لە سایەی دروستکردنی کۆمەلّگەی شاردا نەبێت، بەلاّم ئەگەر لەوە دلّنیا نەبێت و نەزانێت کە کۆمەلّگەی مەدەنی خاوەنی بنەمایەکی دیاریکراوی خۆیەتی، ئەو کاتە ئەو پاراستنی خودەیش دەکەوێتە مەترسیەوە، واتا دەبێت بزانێت کە ئەو بنەمایە دەیگەیەنێتە خودپارێزیی، ئەمە بەو مانایەیە کە دەبێت مرۆڤ لە کۆمەلّگەدا ئازادیەکی پڕاوپڕی دەستگیر بێت کە لە دۆخی سروشتیەکەدا هەیبوە. هەروەها پێویستە هەموو ئەندامێکی کۆمەلّگە بە یەکسانی ملکەچی بەردەم یاساکان بن، ئەمە ئەو یاسایانەیە کە دەبێت هەریەکێك لە کۆمەلّگەکە بەشداری لە داڕشتنیدا بکات. نایش بێت ئەو یاسایانەی مرۆڤ دایناون جارێکی تر هەلّبوەشێنرێنەوە بە یاسای سروشتی، چونکە ئەو جۆرە هەلّوەشاندنەوەیە سەروەریی یاسا دەخاتە مەترسیەوە.

سەرچاوەی ئەو یاسایانەی مرۆڤ دایناون، کە بێجگە لەوانە چ یاسایەکی تر نیە، بریتیە لە ئیرادەی گشتی خەلّك. واتا ئیرادەیەکە بە تەواوی مانای وشە رەگی مانەوەی لەناو ئەو کۆمەلّگەیەدا داکوتاوە، ئیرادەیەکە لە جیگای ئەو یاسا سروشتیە دانیشتوە کە خۆی بە بلّند پایە دەزانێت.

مۆدێرنە لەوێوە دەست پێدەکات کە بێزاریی دەربڕینە لەو کەلێنەی کەوتۆتە نێوان ئەوەی کە هەیە (*theis*) و ئەوەی کە دەبێت ببێت (*the ought*) واتا ئەو کەلێنەی لە نێوان واقیع و ئایدیالدا هەیە، لایەنی یەکەمی شەپۆلی مۆدێرنە بۆ چارەسەرکردنی ئەو کەلێنە پێشنیارێکی کردووە کە بریتیە لە نزیك خستنەوەی ئەوەی دەبێت وا بێت لەوەی کە هەیە. ئەمەیش بە کەم کردنەوە لە بایەخی ئەوەی دەبێت وابێت لە ڕێگای دەرککردنی ئەوەی کە هەیە. وەك بیەوێت مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی ئەوەندە ئەرکی زۆر گران نەکێشێت. بابلّێین مەبەستەکە لەگەلّ فراوانترین و بەهێزترین ئارەزووی مرۆڤدا دەگونجێت. بەلاّم لەگەلّ کەم کردنەوەی ئەو بایەخەیشدا. هێشتا جیاوازیی سەرەکیی نێوانیان هەر دەمێنێتەوە. هەرچەند هوبز نەیتوانی بە ئاسانی شەرعیەتی هەلّوەشاندنەوەی ئەوەی کە هەیە نەسەلمێنێت. واتا ئەو سستمەی کە هەیە، بۆ ئەوەی کە پێویستە هەبێت.. واتا یاسای سروشتی یان ئاکاریی.

ڕۆسۆ لەوێناکردنی ئیرادەی گشتیدا ( *geheral will*) دەلّێت ئیرادەیەکە ڕێ وێلّ ناکات. ئەمەیش بە سادەیی گەوهەری ئەوەیە کە دەبێت هەبێت. بۆیە ڕۆسۆ لەوە دەدوێت کە چۆن دەتوانین بەسەر ئەو کەلێنەدا زالّ بین کە لە نێوان ئەوەی هەیە و ئەوەی دەبێت هەبێتدایە. راشکاوانەتری بلّێین ڕۆسۆ ئەم دەربڕینەی خۆی بەستۆتەوە بە بۆچوونەکانیەوە دەربارەی ئیرادەی گشتی، واتا بیروباوەڕە سیاسیە پەتیەکەی کە پەیوەستە بە ڕێبازەکەیەوە دەربارەی رەوتی مێژوو، گرێدانەوەی ئەم دوو ڕێبازە هەردوو گەورە فەیلەسوفانی دوای خۆی، کانت و هیگل کاریان بۆ کردووەو تەنیا لەسەر ڕۆسۆ قۆرخ نەکراوە.

بەپێی ئەم بۆچوونە کۆمەلّگای دادپەروەر، یان کۆمەلّگای ئەقلاّنی کە ئیرادەی گشتی تیا بێت و ئیرادە گشتیەکەیش نموونەی بالاّ بێت، لە چوارچێوەی رەوتێکی مێژووییدا بە ناچاری

بەرجەستە دەبێت بێ ئەوەی خودی مرۆڤ ئامانجی بەدیهێنانی ئەوەی هەبێت.

بۆ دەبێت ئیرادەی گشتی ڕێ هەڵە نەکات؟ بۆ دەبێت بەناچاری ئیرادەی گشتی چاك بێت: ئەمە وەڵامەکەیەتی: بۆیە چاکە چونکە ئەقڵانیە، بۆیە ئەقڵانیە چونکە گشتیە، بەرئەنجامی بە گشتی کردنی ئیرادە تایبەتیەکانە، ئەوانیش وەك ئیرادەی تایبەتی چاك نین، ئەوەی ڕۆسۆ مەبەستی بوو ئەوە بوو کە هەموو تاکێك پێویستی بە کۆمەڵگەیەکی کۆماریی هەیە تا ئەو یاسایانەی بۆ دابڕێژێت کە تەعبیر لە خەون و ئارەزووەکانی دەکەن و لە ڕووی نەیارانیدا دەوەستن. بەڵام ئەمە هەر بەو قسەیە نابێت کە بڵێیت: "نامەوێت باج بدەم" بەڵکوو دەبێت یاسایەك پێشنیاز بکرێت کە باجدان نەهێڵێت. کاتێکیش ئارەزووەکانی لە یاسایەکدا دادەڕێژێت کە دەشێت بێتەدی، ئەوسا لەوە تێدەگات کە ئیرادە سەرەتایی و تایبەتیەکانی چەند گەمژانە بووە. ئەمە ئەو بە گشتی کردنی ئیرادانەیە کە دڵنیایت لە باشەی، ئیدی پێویست بەوە ناکات گوێ بەوە بدەیت کە سروشتی مرۆڤ چی دەوێت و چۆن دەگاتە بەر کەماڵبونی سروشتی خۆی.

لەبیرو باوەڕی کانتدا دەربارەی ئاکار ئەم بۆچوونە تەواو روون و ئاشکرایە: بۆ ئەوەی لایەنی باشەی ڕێسا گشتیەکانی ڕەفتاری مرۆڤ بزانیت دەبێت ئەوە لەبەرچاو بگری کە ئەو ڕێسایانە چەندە بۆ ئەوە دەشێن ببنە پرانسیپێك بۆ یاسا گەردوونیەکان. ئەمەیش فۆرمێکی ئەبستراکتی ئەقڵانیەتە. واتا بە گەردوونی بوون دەستەبەری ناوەڕۆکە باشەکەیەتی. بەم پێیە یاسا ئاکاریەکان، وەك یاسا گەلێك بۆ ئازادی ، وەك یاسا سروشتیەکان پەسەند ناکرێت. نموونەی بالای ئاکار و سیاسەت لەوێوە دروست نەبوە کە گەڕانەوە بێت بۆ سروشتی مرۆڤ: مرۆڤ بە تەواوی لە دەسەڵاتی سروشت دەرباز بوە، ئەو یاساوانەیش کە بەرەنگاریی نموونەی بالا دەکەن و لە سروشتی مرۆڤەوە هێنراون کە بەپێی ئەزموونی سەردەمەکان هاتوونە گۆڕێ. ئەو یاساوانە بایەخێکی وایان پێ نادرێت. ئەوەش کە پێی وایە ئەمە سروشتێکی ئینسانیە هیچ نیە جگە لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکاریەی تا ساتەوەختی ئێستا بەسەر مرۆڤدا هاتوە، ئەوە تەنیا ئایندەی مرۆڤە کە ناتوانێت هیچ ڕێنوێنییەك بۆ ئایندەی مرۆڤ دەستەبەر بکات، ڕێنوێنییەك کە پەیوەندی بە داهاتووەوە بێت و کارەکانی دەستنیشان بکات و خەونەکانی بخاتە بەرچاو تەنیا لەڕێی ئەقڵەوە دەستگر ئەبێت. چونکەئەقڵ ئەلتەرناتیفی سروشتە، ئەمەیش سوور بوونە لەسەر مانای ئەوەی کە پێویستە ببێت، ئەم بەرئەنجامەیە کە ئیلهامی بەخشیە کانت و فەلسەفەی ئایدیالستی ئەڵمانی، واتا فەلسەفەی ئازادیی. وەلێ بیروباوەڕێکی جەوهەریی تری ڕۆسۆ هەیە کەمتر نییە لەوەی پێشو کە ئاماژەمان پێداوە، ئەو باوەڕەی کانت و هەوادارانی کانت دەست بەرداری بوون و لە جێگایەکی تری دنیای مۆدێرنەدا کەڵك و بەرهەمی بەخشی.

فەلسەفەی ئەڵمانی بیرۆکەی ئیرادەی گشتیی و ناواخنەکەی قبوول کردو ڕەگی پێدان، بەم کارە دەستبەرداری بەهرەکانی ڕۆسۆ بوو لەم شێوازە بەڵگاندنانەدا "مرۆڤ بە ئازادیی لەدایکبووە، بەڵام لە هەموو شوێنێکدا دەستوپێ بەستراوە، چۆن ئەم گۆڕانە روویدا؟ نازانم، چی شەرعیەت بەم گۆڕانە دەدات؟ من بڕوام وایە بتوانم وەڵام بدەمەوە" واتا ئەو کۆمەڵگە ئازادەی کە ئیرادەی گشتیی تیا بەدی هاتووە لەو کۆمەڵگەیە جیاوازە کە لە لایەن دەسەڵاتێکی ستەمکارەوە حوکمڕانی دەکرێت،

ئەمەیش چۆن پەیوەندی شەرعی و ناشەرعی لە یەکتر جیا دەکاتەوە ئەگەرچی پەیوەندیی ناشەرعیش بۆ خۆی وەك پەیوەندیەك ئەمێنێتەوە.

مرۆڤ لە هیچ کۆمەڵگەیەکدا ئازادی خۆی نابینێتەوە، نایشی دۆزێتەوە بە گەڕانەوە نەبێت لە کۆمەڵگەوە بۆ سروشت، ئیتر کۆمەڵگەکە چەند چاك و شەرعییش بێت. بەجۆرێکی تر پارێزگاری کردن لە خودە کە هەقێکی سروشتی سەرەتاییە و پەیمانی کۆمەڵایەتی لێوە دروست بووە، ئەویش هەقیقەتی سەرەکیی نیە. پارێزگاری کردن لە خود بەلایەنی چاکەدا ناشکێتەوە ئەگەر ژیانە راستەقینەو بوونە واقیعیەکە چاك نەبن. تۆ کاتێك هەست بە بوون دەکەیت کە بوونە واقیعییەکەت چاك بێت. ئەو هەستکردنەیش فاکتەرێکە بۆ بایەخدان بە پارێزگاری کردنی بوون و هەموو چالاکیە ئینسانیەکان، وەلێ ئەو بایەخدانە مرۆڤ لە چێژە سەرەکیەکان دادەبڕێت و بەدبەختی دەکات. تەنیا بە گەڕانەوە بۆ ئەزموونە سەرەتاییەکان دەشێت مرۆڤ بەختەوەر بێت، تەنیا کەمەکێك لە خەڵك دەتوانێت ئەو بەختەوەریە بەدی بێنێت، لە کاتێکدا کە تا ڕادەیەك هەموو کەسێك بە پێی ئەو هەقەی پێی دراوە دەتوانێت پارێزگاری لە خۆی بکات و هەوڵی بۆ بدات. واتا وەك هاووڵاتیەك بژی. بەڵام سەبارەت بە هاووڵاتی پێویستە بە ئەرکەکانی خۆ هەڵبستێت، هەروەها دەبێت خاوەنی فەزیلەت بێت بەڵام فەزیلەت بە تەنیا دڵپاکی و بەزەیی پیاهاتنەوە نیە، بەڵکو و هەستکردنە بە پێویستیەکانی سەرشان و پابەند بوون و هەوڵدان.

فەزیلەتی بێ هەوڵدان لە ئارادا نیە — ئەوەیە کە مرۆڤی سروشتی دەیپارێزێت. ئەو مرۆڤەی لە پەراوێزی کۆمەڵگەدا دەژی بێ ئەوەی بەشێك بێت لەو کۆمەڵگەیە، کەلێنێك لە نێوان جیهانی فەزیلەت و ئەقڵ و ئاکار و مێژوو لەلایەك و سروشت و ئازادیی سروشتی و دڵپاکی و بەزەیی پیاداهاتنەوە لەلاکەی ترەوە دروست دەکات.

بەم پێیە، ئێمە دەتوانین لە بارەی چەمکی مۆدێرنەوە سەرنجێکی گشتی و گونجاو دەربڕین. مۆدێرنە هەر لە سەرەتاوە وا دراوەتە قەڵەم کە بە پێچەوانەی سەدە کۆنەکانەوەیە. کەواتەمۆدێرنە دنیای قروسطی لە خۆ دەگرێت، جیاوازی نێوان مۆدێرنە و قروسطی لەلایەك و، دنیای کۆن لەلاکەی ترەوە، جارێکی دی لە دەوروبەری 1800 دا سەرلەنوێ لێکدرایەوە. وەك جیاوازیی نێوان ئاقاری رۆمانسیەت و کلاسیکیەت، ئەگەر ماناکە تەسکتر بکەینەوە، دەڵێین رۆمانسیەت واتا بزوتنەوەی بیرو هەست کە رۆسۆ بانگەوازی بۆ کرد، ئەڵبەتە رۆمانسیەت زۆر مۆدێرنترە لە کلاسیکیەت بە هەموو شێوەکانیەوە. رەنگە چاکترین بەڵگە کە تەعبیر لە ململانێ بە پیتەکەی نێوان مۆدێرنە و دنیای کۆن بێت و، هەمان مانای ململانێی رۆمانسیەت و کلاسیکیەت لەخۆبگرێت، دیوانی شاعیری ئەڵمانی فاوست (*Faust*)ی گۆتە (*Goethe*) بێت.

فاوست لەلایەن خوداوە "پیاوێکی چاکە" ئەم پیاوە چاکە گەلێك تاوانی تایبەتی و گشتی دزێو دەکات. من لێرەدا باس لەوە ناکەم کە فاوست لە باتی کارە دزێوەکان کارێکیش بەرهەم دێنێت کە بەرژەوەندی گشتی تێدایە. ئەو کارەی دەتوانێت لەگەڵ کەسانی ئازاد و لەسەر زەمینەیەکی ئازادا رێ بکات. ئەم کارە سیاسیە چاکە نە تاوانە و نە شۆڕشگێڕی. بەڵکو بە مانای وشە کارێکی ڕەوایە: ئەو کاتێك توانای ئەو کارەی بۆ پەیدا دەبێت کە ناوچەیەکی لە ئیمپراتۆری ئەڵمانی دەست دەکەوێت. من مەبەستەکە لەوەدا کورت دەکەمەوە کە دڵپاکی فاوست بێگومان مانای فەزیلەت نییە،

واته ئاسۆی ئاکاریی بەرهەمە بەناوبانگەکانی گۆتە لەلایەن ڕۆسۆوە دۆزراوەتەوە. ڕاستە دڵپاکی فاوست لەگەڵ ئەو مانایەدا یەکناگرێتەوە کە ڕۆسۆ داویەتی بەم تێرمە، لە کاتێکدا کە دڵپاکیەتی ڕۆسۆ لەگەڵ دەستبەردار بوون لە کارو جۆرێک لە پشوودانەدا دەگونجێت، دڵپاکیەتی فاوست تێکۆشانێکی بەردەوامە، ناڕەحەتی و قەناعەت نەکردنە بە هەر شتێك کە کۆتایی بێت یان کۆتایی هاتبێت واتا "کلاسیکی" ئەوەی فاوست سەبارەت مۆدێرنە بەرجەستەی دەکات، واتا ئەو شێوازەی کە مرۆڤی مۆدێرن وەك مرۆڤی مۆدێرن دەرکی پێدەکات لەلایەن شبنگلەرەوە بایەخێکی تایبەتی دراوەتێ کە مرۆڤی مۆدێرن بە مرۆڤی فاوستی ناوزەد دەکات. دەشێت بڵێین شبنگلەر لەسەروبەندی وەسفکردنی تایبەتمەندیەتی مۆدێرنەدا وشەی "فاوستی" لەبری وشەی "ڕۆمانسیی" داناوە.

لەبەرئەوەی دووەم شەپۆلی مۆدێرنە دراوەتە پاڵ ڕۆسۆ سێیەم شەپۆل دەدرێتە پاڵ نیچە. ڕۆسۆ لەلایەکەوە ڕووبەڕووی دژایەتیەکانی سروشتمان دەکاتەوە، لەلایەکی ترەوە بەرەو ڕووی کۆمەڵگای مەدەنی و ئەقڵ و ئاکار و مێژوومان دەکاتەوە. کە دیاردە سەرەکیەکە هەستکردنە بە بوونێکی قەشەنگ، واتا ئاوێتەبوون و ئاوێزانبونی سروشت، ئەمەیش بەشێکی دانەبڕاوە لە سروشت کە ئەویش جیایە لە ئەقڵ و کۆمەڵگە، دەشێت وا باس لە سێیەم شەپۆلی مۆدێرنە بکەین کە تێگەیشتنێکی تازەیە بۆ هەستکردن بە بوون: ئەم هەستەیش ئەزموونی ترس و دڵەراوکێیە نەك گونجان و ئاشتی. هەروەها هەستکردنە بە بوونی مێژوویی بەو ئیعتیبارەی کە بوونێکی تراژیدیە. ئەمەیش ئەوە دەردەخات کە کێشەکانی مرۆڤ بێ چارەسەرن وەك کێشە کۆمەڵایەتیەکان، وەك ڕۆسۆ دەڵێت: مرۆڤ ئەگەری هەڵاتن نییە لە دۆخی کۆمەڵایەتیەوە بۆ دۆخی سروشتی، ئەگەری بەختەوەریی نموونەییش نییە تەنانەت ئەوپەڕی ئەو شتەی کە مرۆڤ دەتوانێت بیگاتێ هەرگیز پەیوەندیی بە بەختەوەریەوە نییە. لێرەدا ئەم دەستەواژەیەی نیچە بە نموونە دێنمەوە. "هەموو فەیلەسووفەکان بەشداری ئەم ناتەواویەن، چونکەئەوان لە مرۆڤی ئەم سەردەمەوە دەست پێدەکەن و بڕوایان وایە لە ڕێگای شیکردنەوەی مرۆڤی ئێستاوە گەیشتوونەتە ئامانجەکانیان. گومبوونی هەستی مێژوویی ناتەواویەکە بە میرات بۆ هەموو فەیلەسووفەکان ماوەتەوە، ڕەخنەگرتنی نیچە لە فەیلەسوفانی پێش خۆی فۆرمەلەکردنێکی ڕەخنەی ڕۆسۆیە لە فەیلەسوفانی پێش خۆی. وەلێ ئەوەی ڕۆسۆ بە گرنگی دەزانێت بە نیچە زۆر نامۆیە لەبەرئەوەی لە نێوان دۆخی سروشتی و دۆخی کۆمەڵایەتیدا قۆناغێکی جیاکەرەوە هەیە کە قۆناغی دۆزینەوەی مێژوە. سەدەی نێوانیان سەدەی هەستی مێژووییە، نیچە ئامارژەیەك بەمە دەدات و دەڵێت: تا ئێستا بەدحاڵی بونێك دەرهەق بە چیەتی مێژوو هەیە و هیگڵیش بە تواناترین فەیلەسووفی مێژووە، چونکە بەلای هیگڵەوە بەرەو پێشچونی مێژوو بەرەو پێشچوونێکی ئەقلانی و شیاوە، پێشکەوتنێکە لەگەڵ دەوڵەتی ئەقلانیدا دەگاتە لووتکە، واتا دەوڵەتی دوای شۆڕش. مەسیحیەتیش ئاینێکی ڕەوایە، واتا ئاینی ڕەهایە، بەڵام مەسیحیەت لەو ئاشتیەدا کە لەگەڵ دنیادا هەیەتی، گیانی سەردەم (*saeculum*)ی لە خۆگرتوە بۆ بەعەلمانی کردنێکی تەواوی سەردەمەکە. ئەم بوون گۆڕینەیش لەگەڵ بزوتنەوەی ریفۆرمی ئاییندا دەستی پێکردووە و لەگەڵ ڕۆشنگەریشدا بەردەوام بووەو لەگەڵ

دەوڵـەتی دوای شۆڕشـدا پێگەیشـتوە. ئەمـە یەکـەم دەوڵەتە کە هوشیارانە دان بە مافی مرۆڤدا بنێت.

ئـەوەی پەیوەنـدی بـە هیگڵـەوە هـەبێت، ئێمـە تـەواو ناچارین بڵـێین، چیەتی مۆدێرنـە بریتییـە لـە مەسـیحیەتی بـە عـەلمانی کـراو، بـەو پێیـەی کـە ئامـانجی هوشـیارانەو ئاشـکرای هیگـڵ عەلمانیـەت بووە. بەلای هیگڵەوە مێژوو لووتکە و کۆتایی هەیە، ئەمە وای لێکردوە کە تەبایی بخاتە نێوان بیرۆکەی هەقیقـەتی فەلسـەفی لەگـەڵ ئـەو هەقیقەتـەی کـە فەیلەسـوف کـوڕی سـەردەمەکەی خۆیـەتی: فەلسەفەی ڕاستەقینە و کۆتایی سەر بە چرکەساتی رەهایە لە مێژوودا، واتا لووتکەی مێژوو. بەڵام بیری دوای هیگڵ ئەو بیرۆکەیە ڕەت دەکاتەوە کە مێژوو لووتکە یان کۆتایی هەبێت. ئەم بیرە وا لە رەوتی مێژوو تێگەیشتووە کە شتێکە نەتەواو دەبێت و نە ئەگەری بەرکەماڵ بونیش هەیە، بەڵام تا ئێستا ئەم بۆچوونە دەربارەی ئەقڵانیەت دەستکورتە. واتا تایبەتمەندیە پێشکەوتوەکەی گۆڕانی مێژوو، یەکەمین کەس کە ڕووبەڕووی ئەم مەسەلەیە بووەوە نیچە بوو، ئەوانەی وا لە بنەماکانی بیروکار گەیشتوون کە بنەمای مێژووین پێویستیان بە بەڵگەو پرانسیپ هەیە، بەو مانایەی کە دەبێت ئەو قۆناغە مێژووییانەی بە دوای یەکدادێن هەریەکەیان پێشکەوتووترین لەوەی پێشویان، یان پرۆسە مێژووییەکەیش مانایەکی جەوهەری واتا سەقامگیریەکی جەوهەری هەبێت. هەموو نموونەیەکی باڵا کە بەر ئەنجامی داهێنانەکانی مرۆڤن و، بەرهەمی پرۆژە ئازادەکانی ئەون، ئەو ئاقارە پێك دێنن کە ئەگەری کلتووری تایبەتی لەخۆبگرن، ئەو نموونە باڵایەش کە لە سایەی چوارچێوەیەکدا دیسپلین ناکرێن و لە توانایشدا نیە ئاوێتەیەکی ڕاستەقینە بکرێت. لەگەڵ ئەوەیشدا هەموو نموونە باڵا ناوازەکان بانگەشەی ئەوە دەکات کە بەڵگەیەکی بابەتی بۆ خۆی پێیە: واتا تۆ ئەو بەڵگەیە یان لە سروشتا یان لە خوادا یان لە ئەقڵدا دەبینێتەوە.

دیدی مێژوویی ئەم بانگەشەیە ڕەت دەکاتەوە و لە هەمان کاتیشدا هەموو نموونە باڵا دیارەکانیش ناهێڵێت. بە کورتی، بەدیهێنانی نموونە باڵا ڕەسەن و ڕاستەقینەکان – ئیتر پرۆژەبن یان داهێنانە ئینسانیەکان بن. ڕێگا بەوە دەدات کە جۆرە پڕۆژەیەکی زۆر تازە هەبێت و چاو بە هەموو بەهاکاندا بگێڕدرێتەوە و جارێکی دی هەڵبسەنگێنرێن، ئەم پڕۆژەیەش لەگەڵ ئەو دیدە تازەیەدا دەگونجێت کە هێشتا لێی دروست نەبووە (چونکە لە دیدێکی ترەوە ئەوە کردەیەکی خوڵقێنەر نییە) ئایا هەموو ئەمانە بەو مانایە نین کە لە دوا قۆناغدا هەقیقەت دۆزراوەتەوە، ئەو هەقیقەتەی پەیوەندیی بە هەموو پرانسیپە شیاوەکانی بیرو کار کردنەوە هەیە؟ پێ دەچێت نیچە لە نێوان ئەم مەبەستە و تێگەیشتنی لە هەقیقەت وەك پڕۆژەو ڕاڤەکردنەکانی خۆی ڕاڕابێت و خۆی بە دەستەوە نەدات، بەڵام لە ڕاستیدا نیچە بڕوای وایە کە خۆی یەکیەتی جەوهەریی نێوان داهێنانی مرۆڤ و سەرجەم بوونەوەرە زیندوەکانی تری دۆزیوەتەوە" "لە هەر شوێنێکدا ژیان هەبێت لەوێدا ئیرادەی هێز هەیە" کاتێك ئەو بەهایانە هەڵدەسەنگێنێتەوە کە نیچە هەوڵی بەدیهێنانی داون، لە دواییدا بەو هەقیقەتە پاساو دەدرێنەوە کە ئەسڵی ئەوانە ئیرادەیەکی باڵای هێز دروستی کردوون. واتا ئیرادەی باڵا بۆ ئەو هێزەی فاکتەربووە لەسەرهەڵدانی ئەو بەها سەرەتاییانەدا. نەك مرۆڤ وەك ئەوەی هەبووەو تەنانەت ئەوەیش نا کە بە باشترین شێوە دروست کراوە، بەڵکو تەنیا

سۆپەرمانە کە دەتوانێت لەگەڵ ژیاندا بگونجێت و هەموو بەهاکانیش جارێکی تر هەڵبسەنگێنێتەوە. دیدی مەبەستگەرا لە بووندا سەر بەرەو دوا نموونەی بالاّ دەکێشێت. نیچە وەك هیگڵ باوەڕی بەوە نەبوو کە دیدی مەبەستگەرایی دوای لێکدانەوەی نموونەی بالاّ دەکەوێت. لەملایەنەوە، روانینی نیچە لە روانینی مارکس دەچێت. وەلێ ئەم جیاوازیە جەوهەریە لە نێوانیاندا هەیە:

سەبارەت بە مارکس بەدیهاتنی کۆمەڵگەی کۆمۆنیزم کارێکی حەتمیە. لە کاتێکدا هاتنی سوپەرمان لای نیچە پابەندەبە هەڵبژاردنی ئازادانەی مرۆڤەوە، لای نیچە تەنیا شتێك هەیە کە گومان هەڵناگرێ و پەیوەندیی بە ئایندەوە هەیە: ئەوەی تا ئێستا لە بارەی مرۆڤەوە زانراوە ئەوەیە کە مرۆڤی داهاتوو یان سوپەرمانە یان دوایین مرۆڤە، دوایین مرۆڤیش کە بچووك و بێزۆوە. ئەو مێگەلەیە نە بەهای بالاّی لایە و نە خەون. بەلاّم خواردنی باش دەخوات. جێگاو پۆشاکی چاکی هەیە. لای پزیشکە ئاسایی و هەروەها پزیشکە دەروونیەکانەوە باش چار دەکرێت. ئەم جۆرە مرۆڤە لە دیدی نا مارکسیەکانەوە مرۆڤە مارکسیەکانی ئایندەن. وەلێ لەگەڵ ئەم جیاوازیە ڕیشەییانەی لە نێوان مارکس و نیچەدا هەیە، کەچی دەوڵەتی لووتکە و کۆتایی لە دیدی هەردووکیاندا بەو هەقیقەتە جیا دەکرێتەوە کە لە دواییدا سەروەریی ڕێکەوت بەدی دەهێنێت: بۆ یەکەمجار مرۆڤ دەبێتە گەورەی ئایندەی خۆی.

لێرەدا تەنیا کۆسپێکی زۆر تایبەتی دێتە بەردەم نێچە. ئەویش ئەوەیە کەلای نیچە هەموو ژیانێکی راستەقینەی مرۆڤایەتی و گشت کلتوورە بالاّکان بە ناچاری خاوەنی تایبەتمەندیەکی پلەبەند (تراتبی) یان ئەرستۆکراتین. بەلاّم دەبێت کلتووری بالاّ بۆ ئاینده لەگەڵ سستمی سروشتی پلەبەندیدا لە چوارچێوەی مرۆڤدا بگونجێت و ئەمە ئەو ڕێوشوێنەیە کە ئەفلاتوون داینـاوە. وەلێ چۆن سستمێکی سروشتی پلەبەند دێتە کایە ئەگەر هێزێکی بێ کۆتایی سوپەرمان لە ئارادا هەبێت؟ سەبارەت بە نیچە لای ئەو وایە کە هەموو خەڵکیی لانی کەم ناتەواو و پەراگەندەن. ئەمە لەوەوە سەرچاوە ناگرێت کە سروشتێکی توتالیتاری لە ئارادایە، بەڵکوو ئەوە تەنیا میراتیەکە لە ڕابوردوو یان لە مێژوو کە تا ئێستایش بەردەوامە. بۆ نەهێشتنی ئەو کۆسپە، واتا یەکسانی پێکردنی هەموو خەڵکی لە کاتێکدا کە مرۆڤ لەوپەڕی تواناییدا بێت، بۆ ئەم دۆخە نیچە پێویستیی بە سروشت هەیە. یان بۆ ڕابووردویەك وەك ئەو ڕابووردوەی سیمای دەسەلاّتداریەتی هەیە. یان ڕابووردویەك کە چاری قوتاربوونت لێی نەبێت. چونکە سەبارەت بە نیچە هەقیقەتێك نییە نەتوانیت متمانەی پێبکەیت، کەواتە یان دەبێت بە ناچاری قبووڵی بکەیت یان دانی پێدا بنێیت. ئەمەیش مانای بیرو باوەڕەکەیەتی لە گەڕانەوەی لە کات بەدەردا (ئەبەدی) کە ئەگەری سوپەرمان بوون هەبێت، کەواتە دەبێت سەرجەم ڕابووردوویش بگەڕێتەوە.

گومان لەوەدانیە کە سروشتی مرۆڤ بریتیە لە ئیرادەی هێز، ئەمەیش لە ئاستی یەکەمدا بە مانای دەسەلاّت پەیداکردنی تەواوە بەسەر کەسانی تردا: مرۆڤ بە یەکسانی قایل نیە، خۆیشی لەوەدا دەبینێت کە دەسەلاّتی تەواوی بەسەر خەڵکانی تر و خۆیشیدا هەبێت، ئەگەر مرۆڤی سروشتی لای رۆسۆ مرۆڤێکی میهرەبان بێت. لای نیچە مرۆڤی سروشتی مرۆڤێکی دڵڕەقە.

ئەوەی نیچە لە بارەی کاری سیاسییەوە دەیڵێت گشتی تر و تەمومژاویترە لەوەی کە مارکس دەیڵێت، بە مانایەکی دی ئەوەی نیچە دەربارەی سیاسەت دەیبێژێ لادانە لە ڕێ و ڕەسمەکانی خۆی.

لەگەڵ ئەوەیشدا پیاوانی سیاسەت خوێندویانەتەوەو ئیلهامیان لە قسەکانی وەرگرتووە. ئەمەیش مانای وایە چەندە نیچە بەر پرسیارە لە فاشستیەت ئەوەندەیش ڕۆسۆ بەرپرسیارە لە یەعقوبیەت.

من لێرەدا پوختەیەکی سیاسیم لەم بۆچوونانەی پێشەوەدا دەستگیر دەبێت. تیورەی دیموکراتی لیبراڵی وەك کۆمۆنێستی، بەرهەمی شەپۆلی یەکەم و دووەمی مۆدێرنەن. بەڵام لەبەرجەستەکردنی سیاسی شەپۆلی سێیەمدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەمیان فاشیەتە. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەم هەقیقەتەی کە ناتوانین ڕەتی بکەینەوە. ڕێی ئەوەمان ناداتێ بگەڕێینەوە سەر فۆرمە سەرەتاییەکانی بیری مۆدێرن: ڕەخنەگرتن لە ئەقلانیەتی مۆدێرن، یان ڕەخنەگرتن لە باوەڕی مۆدێرن بە عەقڵ کە نیچە کردوویەتی، ناشێت نەیسەلمێنین یان لە بیرخۆمانی بەرینەوە. ئەمەیش فاکتەرێکی قووڵە لە قەیرانی دیموکراتیەتی لیبراڵدا.

ئەوە زۆر ئاشکرایە کە دیموکراتیەتی لیبراڵ بەسەر ستالینییەت و دوای ستالینیەتدا زاڵ بووە. لەسەروو هەموو ئەمانەیشەوە جیاوازیی دیموکراتیەتی لیبراڵ لە کۆمۆنیستی و فاشستی سەرچاوەی بەهێزی لە ڕێگای بیکردنەوەیەکەوەیە کە هەرگیز ناتوانین بە بیری مۆدێرنی لەقەڵەم بدەین: واتا ئەو بیرە پێش مۆدێرنەی کە پەیوەندی بە داب و نەریتی خۆراواییمانەوە هەیە.

## سەرچاوە

گۆڤاری "فکر و نقد" ژمارە 34.

# مۆدێرنیزم چییه؟

هاشم سالح

له فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی

### هەمووان دەیانەوێ لەبەری مۆدێرنیزم بەرخوردار بن

بێگومان ئەم دابەشکردنە بەتەنها بەسەر مێژووی فیکری ئەورووپی یا خۆرئاواییدا دەچەسپێ. بۆ فیکری عەرەبی_ ئیسلامی ئەبێ پەنا بەرینە بەر دابەشکردنێکی تر کە بۆی بگونجێت. هەروەها بۆ فیکری هیندیو چینیو... هتد. زاراوەی مۆدێرنیزمیش تەنها بەسەر ئەو حەوت وڵاتە گەورەیەدا دەچەسپێ کە فەرمانڕەوایی جیهان ئەکەن، واتە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئینگلتەرەو فەرەنسا و کەنەدا و ئیتالیا و ئەڵمانیا و ژاپۆن. بەڵام وڵاتەکانی تر لە هەوڵداندان بەرەو مۆدێرنیزم، واتە چوونە ناو بەهەشتی مۆدێرنیزمەوە. لە گرنگترینیشیان چین و هیند و ڕوسیا و هەروەها جیهانی عەرەبی و جیهانی ئەفریقی و ئەمریکای لاتین و دواجار باقیی جیهانیش. هەموو دەیانەوێ لەبەری مۆدێرنیزم بەرخوردار بن، بەڵام مۆدێرنیزم هەروا بە ئاسانی خۆی بەدەستەوە نادات... ئەشێ وڵاتێك هەموو ئامێر و ئامرازەکانی مۆدێرنیزمی هەبێت _ هەر لە یەخچاڵ و جلشۆر(غەساله) و کۆمپیوتەر و ئۆتۆمۆبێلەوە تا... _ بەبێ ئەوەی مۆدێرن بێت. لەبەر ئەوەی مۆدێرنیزم دوو بەشە: مۆدێرنیزمی ماتەری (یا ماددی) و مۆدێرنیزمی ئەقڵی یا فیکری.

ئەگەر دەوڵەمەند بیت ئەتوانیت ئەوەی یەکەمیان بە حازری بەدەست بێنیت، بەڵام دووەمیان ناکڕێ، تەنانەت بە ئاڵتوونیش.جگە لەوەی مۆدێرنیزمی فیکری یا هونەری یا فەلسەفی شتێك نیيە لەبەردەستی کەسێك یان وڵاتێکدا بێت و دروستبوونی پێویستی بە کاتێکی زۆرە، هەرچۆن پێویستی بە شەڕێکی ڕاستەقینە هەیە لەگەڵ خودی کەلەپووریدا. هەموو خەڵکێکیش ئەهلی ئەو شەڕە نین، بەڵگەی ئەم قسەیەشمان ئەوەیە کە لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا ئەیبینین.فەیلەسووفی فەرەنسی ژان بۆدریار وایدەبینێت کە مۆدێرنیزم تایپێکی ژیاریی دژ بەو تایپە سوننەتیيەیە کە بەدرێژایی چەندەها سەدە باڵی بەسەر مرۆڤایەتیدا

کێشاوەو بگرە تا ئێستاش لە زۆربەی وڵاتاندا هەر ئەو تایپە زاڵە.

## مۆدێرنیزم ئەفسانەیەکە برسیەکان خەونی پێوە ئەبینن

مۆدێرنیزم یەکەمجار لە ئەوروپادا لەدایك بوو، پاشان لەوێوە تیشکی خۆی بۆ جیهان نارد. مۆدێرنیزم لە یەك کاتدا هەم ئەفسانەیە و هەم ڕاستییشە. خەرمانەیەکی گەورە بەدەوری مۆدێرنیزمدا کێشراوەو ئادەمیزاد خۆی لەبەردەم سیحریدا پێی ڕاناگیرێ. بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە ئەگەر دەرگای ئەوروپا و خۆرئاوا بخرێتە سەرپشت و ڕێگەیان بۆ خۆش بکرێ، لاوانی جیهان هەموو بەرەو ئەوێ کۆچ ئەکەن. چونکە ئەمان لەڕێی شاشەکانی تەلەفزیۆنەوە تایپی ژیانی بەرخۆرانەی ئەوروپیو فیلمە سینەماییەکان و ئازادییە سێکسی و غەیرە سێکسیەکان ئەبینن و، ئەمانیش خەون بەوەوە ئەبینن کە وەکو لاوانی ئەوروپی و ئەمریکی بژین. بەمجۆرە مۆدێرنیزم بووە بە ئەفسانەیەك کە ملیۆنەها مرۆڤی برسی و چەپێنراو لە ئاسیا و ئەفریقا و ڕوسیاو بگرە تەواوی جیهان خەونی پێوە ئەبینن. بەڵام لەپشت ئەم ئەفسانەیەوە ڕاستی خۆی حەشار داوە: واتە ڕاستیی مۆدێرنیزم و ژیانی ڕۆژانەی. مۆدێرنیزم هەمووی هەنگوین نیيە وەکو خەڵکانی جیهانی سێ لە دوورەوە و لەڕێی شاشەکانی تەلەفزیۆن و فیلمە سینەماییەکانەوە وایدەبینن.

مۆدێرنیزمیش خەم و کێشە و ناڕەحەتیو سنووربەزاندنی خۆی هەیە. بەڵام بێگومان لایەنە پۆزەتیڤەکانی لە لایەنە نەگەتیڤەکانی زیاترە و گەر وانەبووایە جیهانی کۆمۆنیزم هەرەسی نەدەهێنا و ڕوسیا و چینیش هەوڵی شوێنپێهەڵگرتنیان نەدەدا.

مۆدێرنیزم لە ئەنجامی ئەو کودەتا قووڵانەوە هاتە گۆڕێ کە بەسەر پێکهاتەی ئابووری و کۆمەڵایەتیی وڵاتە ئەوروپیەکاندا هات. ئەم وڵاتانەش وەکو ئێمە و بگرە لە ئێمەش زیاتر کشتوکاڵی و جوتیاری و هەژار و ئوسووڵی و دواکەوتوو بوون، بەڵام لەگەڵ سەرەتای سەدەی شانزدەدا گۆڕانی گەورەیان بەسەردا هات و ئەم گۆڕانکارییانە لە سەدەکانی حەڤدەو هەژدە و نۆزدەو بیستدا بەردەوام بوون تا ئەوروپا گەیشتە ئەو پەرەسەندن و پێشکەوتنەی ئێستا بەخۆیەوە ئەیبینێت.

## مۆدێرنیزم بە شێوەیەکی هاوئاهەنگ لەسەر چەند ئاستێك هەنگاوی نا:

ئاستی زانستی_ تەکنۆلۆجی، ئاستی ئایینی -خواناسی، ئاستی فەلسەفی، ئاستی پیشەسازی_ ئابووری، ئاستی سیاسی_ قانوونی... هتد. کەواتە مۆدێرنیزم بریتیيە لە ڕاستیيەکی گشتگیر و کامڵ: واتە تۆ یا مۆدێرنیت و یان مۆدێرن نیت. ناکرێ ببینە خاوەنی هەندێ لە ڕواڵەتەکانی یا وەکو وتمان هەندێ لە بەرهەم و ئامێرەکانی وەربگرین و ئیتر وابزانین بەوە ئەبینە مۆدێرن. لەڕاستیدا مۆدێرنیزم وەکو دیاردەیەکی گشتگیر لە سەدەی شانزدەدا لە ئەوروپا سەریهەڵدا و لە سەدەی نۆزدەدا گەیشتە ترۆپك. هەندێ ڕووداویش هەن کە مێژووناسەکان بە بەڵگەی سەرەتای چاخی مۆدێرنی لە قەڵەم ئەدەن: لەوانە دۆزینەوەی ئەمریکا لە لایەن کریستۆف کۆڵۆمبۆسەوە لە ساڵی 1492، هەروەها داهێنانی چاپخانە لەلایەن گۆتنبێرگەوە لە ساڵی 1434،

پاشـان دۆزینـــەوە گەردوونیـــەکانی کۆپـــەرنیکۆس 1453 (سووڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا نەك بە پێچەوانەوە).

لــــەو ڕووداوە ســــەرەکییانەش کــــە بـــــە ســــەرەتای مێـــژووی چـــاخی نــــوێ دادەنــــرێ، هاتنــــەئاراوەی بزووتنــــەوەی ڕیفـــۆرمی ئـــایینی لەسەر دەستی (لۆتەر) لە ئەڵمانیا ساڵی 1517. ئەم ڕووداوە تونـــــــد ئـــــــەورووپای هەژانـــــــد و دۆگماتیزمی خواناسی و مەسیحیەو کڵێسایی لەق کـرد و بانگەشــەی بـۆ حـوکمی ئـەقڵ کـرد لەسـەر مەســــــەلەکانی ئـــــــایین و کاروبارەکـــــــانی بیروبــــاوەڕ.هـــــەروەها نـــــابێ ئــــەو ڕووداوە گەورەیـــەمان لـــەبیر بچـێت کــە خــۆی لــە چـاخی ڕێنیســــــانس و بزووتنـــــەوەی هیومـــــــانیزم *Humanism*دا بینیەوە لە ئیتالیا و پاشانیش لە بـــاقیی وڵاتــــە ئەرووپیــــەکانی تـــردا، بـــەمجۆرە بزووتنــەوەی مــۆدێرنیزم لــە ســەدەکانی ڕابــردوودا بەردەوام بوو.

## چـــالاکییەکی فیکریـــی ئـــازادی پـــارێزراو لـــە پروپاگەندەی سیاسی

بــەڵام پێناســەی مــۆدێرنیزم چـیە؟ ئـاخۆ زاناکان لەسەر پێناسەیەك بۆی کۆکن؟ کۆمەڵناسی فەرەنسـی ئـالان تـۆرین ئـەڵێ مـۆدێرنیزم بەتـەنها بریتی نییە لە بەدواداهاتنی چرکە زەمەنیەکان، یان گـۆڕانێکی پـەتی، بەڵکو بریتیە لـە بڵاوکردنـەوەی بەرهـــەمی چـــالاکیە ئەقڵانیـــەکانی ئـــادەمیزاد، هەروەها چالاکیی زانستی و تەکنۆلۆجیەو لۆجستی (ئیداری). مۆدێرنیزم لـە بـری ئەقڵیـەتی غـەیبانی و میتـــافیزیکی، زانســـت ئەخاتـــە ســـەنتەری ژیـــانی کۆمەڵایەتیی ئادەمیزادەوە. بیروباوەڕە ئاینیەکانیش ئەخاتـە چوارچێوەی ژیـانی تایبـەتیی تاکەکەسـەوە.

هێنـــــدەش بـــــەس نییـــــە پراکتیزەکردنـــــی تەکنۆلۆجیانەی زانست هەبێت لە کۆمەڵگایەکدا تا پێـی بڵـێین کۆمەڵگایـەکی مـۆدێرن. بـەڵکو ئـەبێ جموجووڵی فیکری یا چالاکیی فیکریی سەربەخۆی تیـا بێـت: واتــە لــە پروپاگەنـدەی سیاسـیەو ئـەو بیروباوەڕە سوننەتیانەش پارێزراو بێت کە بێ سێ و دوو لـە سـەرەوە بەسـەر خەڵکـدا ئەسـەپێنرێن. هــەروەها کۆمــەڵگای مـۆدێرنیزم کۆمــەڵێك یاسـای تیایە کە وەکو یەك بەسەر هاووڵاتیەکاندا پراکتیك ئــەکرێ، بــەبێ هــیچ جیاوازییــەك و بــێ هــیچ حیســابکردنێ بــۆ ئەســڵ و فەســڵ و پەیوەنــدیی نزیکایەتی و خزمایەتییان. لە کۆمەڵگایەکی وەهادا حیسابکردن بۆ خزمایەتی لە دامەزراندندا و شتی تری لەم بابەتە قەدەغەیە، بەپێچەوانەی ئەوەی کە لــە کۆمــەڵگای پــێش مۆدێرنیتــەدا هەیــە، کــە حیسابکردن بۆ ناسیاویەو بەرتیلخواردن و گەندەڵی تا ئەوپەڕی بەربڵاوە.

لە کۆمەڵگاکانی مۆدێرنیزمدا یاسا وەکو یەك بەسـەر خەڵکـدا جێبـەجێ ئـەکرێ، هـەر لـە کـوڕی سەرکۆمارەوە تا بچووکترین هـاووڵاتی، کەسیش لە سەروو یاساوە نییە. هەربۆیە زۆرجار ئەبیستین لە کۆمـەڵگا ئەورووپیـیە پێشکەوتووەکاندا وەزیرەکـان یـان کوڕوکچـی سـەرۆك و یـان کەسـانی خێـزان و بنەماڵـە گـەورەکان دادگـایی ئـەکرێن، کـە ئەمـە لـە وڵاتانی جیهانی سێدا شتێکە مەحاڵە.

### مۆدێرنیزم:

### حوکمی ئەقڵ نەك نەقڵ

لەڕاستیدا بیرۆکـەی مۆدێرنیزم بـە شـێوەیەکی تونـدوتۆڵ پەیوەسـتە بـە بیرۆکـەی بەئـەقڵانیکردن و ئەقڵانیەتـەوە. مـۆدێرنیزمیش بـە بـێ ڕێکخسـتنێکی ئەقڵانیانــەی کۆمــەڵگا لەســەر هــەموو ئاســتەکان،

مۆدێرنیزم نی‌یه. مۆدێرنیزم ئه‌و سه‌رچڵی‌یه جوانه بوو که هه‌ر له سه‌ده‌ی شانزده‌یه‌مه‌وه ئه‌وروپا خۆی تێفرێدا، و بووه هۆی هێنانه‌ئاراوه‌ی ئه‌قڵانیه‌ت و به‌خته‌وه‌ری و ئازادی له کۆمه‌ڵگا خۆرئاواییه‌کاندا. هه‌رچۆن بوو به‌هۆی تێکشکاندنی ئه‌و بیروباوه‌ڕه سوننه‌تیانه‌ی که پێشتر باو بوون. ئه‌قڵ له کۆمه‌ڵگای مۆدێرنیزمدا به‌ته‌نها چالاکیی زانستی و ته‌کنۆلۆجی به‌ڕێوه نابات، به‌ڵکو چاره‌نووسی ئاده‌میزاد و کاروباره‌کانی خه‌ڵك و شته‌کانی تری ناو کۆمه‌ڵگاش به‌ڕێوه ئه‌بات. به‌م مانایه مۆدێرنیزم حوکمی ئه‌قڵه نه‌ك نه‌قڵ. مۆدێرنیزم هه‌ندێ جار کۆمه‌ڵگای له شێوه‌ی سیستمێك یان بونیادێکدا وێنا کردووه که‌له‌سه‌ر حیساباتی ماتماتیکی به‌نده. هه‌ندێ جاریش وه‌ك ئامرازێك ئه‌قڵی خستۆته خزمه‌تی ئاده‌میزاد و خۆشی‌یه‌کانیه‌وه. هه‌ندێ جاری تریش ئه‌قڵی وه‌کو چه‌کێکی ڕه‌خنه‌گرانه به‌کارهێناوه دژ به هه‌موو ده‌سه‌ڵاتێك که له‌سه‌ره‌وه حوکمی مرۆڤه‌کانیان کردووه (هه‌روه‌کو چۆن ئێستاش وایه) له پێناوی ئازادکردنی ئه‌و سروشته مرۆییه‌ی که سامی لاهوتی پێشێلی کردووه. به‌ڵام له هه‌موو حاڵه‌ته‌کاندا ئه‌قڵانیه‌تی کردووه به تاقه پرنسیپ بۆ ڕێکخستنی ژیانی تاکه‌که‌سی‌و ده‌سته‌جه‌معی، ئه‌مه‌ش به به‌ستنه‌وه‌ی به پرنسیپێکی تره‌وه که ئه‌ویش پرنسیپی عه‌لمانیه‌ته. مۆدێرنیزم بێ عه‌لمانیه‌ت مۆدێرنیزم نی‌یه، به‌ڵام به‌و مه‌رجه‌ی واتێنه‌گه‌ین که عه‌لمانیه‌ت کفره، وه‌کو زۆربه‌ی خه‌ڵکانی جیهانی ئیسلامی و عه‌ره‌بی وا تێده‌گه‌ن.عه‌لمانیه‌ت به مانای کفر نایه‌ت یان وه‌کو کۆمۆنیزمی جاران به‌زۆر بێباوه‌ڕی به‌سه‌ر خه‌ڵکدا ناسه‌پێنێت، به‌ڵکو به‌مانای ڕێزگرتن له ئازادیی ئایینی و فره‌باوه‌ڕی دێت له کۆمه‌ڵگادا. پاشان جیاوازیکردن له نێوان هاووڵاتی‌و ئه‌سڵی ئیتنی و ئایینی و، هه‌ڵسوکه‌وتی یه‌کسان له‌گه‌ڵ هاووڵاتیاندا، چ له‌به‌رده‌م ده‌زگاکانی ده‌وڵه‌تدا و چ له به‌رده‌م یاسا و دامه‌زراندن و به‌ڕێوه‌بردنی گشتیدا و.... هتد. ده‌وڵه‌تی عه‌لمانیش به‌بێ جیاوازی ئازادیی به‌جێهێنانی ڕێوڕه‌سمه ئاینیه‌کان ئه‌دات، به‌بێ په‌سه‌ندکردنی ئاینێك به‌سه‌ر ئاینێکی تردا. له ده‌وڵه‌تی عه‌لمانیدا ڕێز له هه‌موو بیروباوه‌ڕه‌کان ئه‌گیرێ و ئه‌بێ ڕێزیان لێ بگیرێ.

### سه‌روه‌ریی ئه‌قڵ له هه‌موو بواره‌کاندا

به‌ڵام فه‌یله‌سووفی ئه‌ڵمانی یۆرگن هابرماس ئه‌ڵێ مۆدێرنیزم واته حوکمی ئه‌قڵانیه‌ت یان سه‌روه‌ریی ئه‌قڵ له هه‌موو بواره‌کانی کۆمه‌ڵگادا. له‌به‌ر ئه‌وه‌ی کۆمه‌ڵگایه‌ك که به شێوه‌یه‌کی ئه‌قڵانی ڕێکنه‌خرابێ کۆمه‌ڵگایه‌کی مۆدێرن نی‌یه، به‌ڵکو کۆمه‌ڵگایه‌کی سوننه‌تی‌یه. له پێشه‌کیی کتێبه به‌ناوبانگه‌که‌شیدا (گوتاری فه‌لسه‌فیی مۆدێرنیزم) هابرماس شتێکی له‌م بابه‌ته ئه‌ڵێ: بۆچی له ئه‌وروپادا په‌ره‌سه‌ندنی زانستی و هونه‌ری و سیاسی‌و ئابووری به ئاقاری ئه‌قڵانیه‌تدا ڕۆیشت، که‌چی له هیچ شوێنێکی تری دونیادا ئه‌مه ڕووی نه‌دا؟ به واتایه‌کی دی: بۆچی مۆدێرنیزم به‌ته‌نها له کۆمه‌ڵگا خۆرئاواییه‌کانی ئه‌وروپادا قه‌تیسی خوارد که گه‌شه‌سه‌ندنێکی ئه‌قڵانیی وایان به‌خۆیانه‌وه بینی که پێشتر به خۆیانه‌وه نه‌یانبینیبوو؟ ڕاسته ژیاره‌کانی تریش، وه‌کو ژیاری عه‌ره‌بی و چینی‌و هیندی و...هتد له ئه‌قڵانیه‌ت به‌تاڵ نه‌بوون، به‌ڵام به‌ته‌نها کیشوه‌ری ئه‌وروپی به‌شێوه‌یه‌کی ته‌واو سه‌رکه‌وتنی ئه‌قڵ و ئه‌قڵانیه‌تی به‌خۆوه دی. تۆبڵێیت نهێنیی ئه‌وه له‌چیدا بێت؟ له‌ڕاستیدا هێنده به‌سه له کۆمه‌ڵگایه‌کی ئه‌ورووپیه‌وه که به

شـــێوەیەکی ئـــەقڵانی ڕێکخـــراوە، بـــۆ نموونـــە وەکـو کۆمـەڵگای ئینگلیـزی یـا ئـەڵمانی، بچـین بـــەرەو کۆمەڵگایـــەکی عـــەرەبیی تەقلیـــدی و بـــێ سەروبەر تا هەست بەو جیاوازییە ئاشکرایە بکەین و لـــە مانـــای مـــۆدێرنیزم و ناوەرۆکەکـــەی بگـــەین. هەڵبەت ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە مرۆڤی ئەورووپی لەڕووی ڕەگەزەوە یا لە ئەزەلەوە لە مرۆڤی عەرەب یـا هینـدی و یـان ئـەفریقی بـاڵاترە، بـەڵکو هەنـدێ هەلومەرجی مێژوویی دیاریکراو هەبووە کە پێکەوە ڕێیـان بـۆ سـەرهەڵدانی مـۆدێرنیزم لـە ئـەورووپا دا خۆشکردووە.

لەوانەیە ڕۆژێکیش بێت ئەم وڵاتانەی ئێمەش بە مۆدێرنیزم و ئەقڵانیەت بگەن و بێگومان ئێستا بەو ئاقارەشدا ئەڕۆن، وێڕای گشت ئەو کارەسات و مەینەتییانەی کە دێنە ڕێیان.

**سەرچاوە**

لە سایتی ئیلافەوە وەرگیراوە.

# مۆدێرنیزم (1)

## (وەک ڕێچکەیەکی ئەدەبی)

دێڤید برۆکس
لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید

رەخنەی ئەدەبی زانستێك نیە یاساگەلێکی دیسپلینکراوی هەبێ، هەربۆیە لە هەولی پێناسەکردنی زاراوەکانیدا زۆرجار ئاماژە بۆ سەردەمی داڕشتنی ئەو زاراوانە دەکرێ بەئەندازەی قسەکردن دەربارەی خودی زاراوەکان. یەکێك لە کێشە دیارەکانی پێناسەکردنی زارەوەی "مۆدێرنیزم" بریتە لەو دوو ئاراستە فیکرییەی کە لە زاراوەکەدا ئامادەییان هەیە: یەکەمیان پێیوایە مۆدێرنیزم بە گروپێکی دیاریکراوەی ئەدیبان و هونەرمەندان دەوترێ لەهەر چاخێکدا" هەرچی دووەمیانە وایدەبینێ مۆدێرنیزم دۆخێکی هونەری، یان هەلوێستێکە دەربارەی نوێ Modern کە لە حەفتا سالی ڕابردووەوە تائێستا قسەی لێدەکرێ‌و رەنگە زۆر بەر لەو مێژووەش قسەی لێکرابێ.

بۆچوونی یەکەم چەند لقە بۆچوونێکی لێدەبێتەوە، هەندێکیان پێیانوایە مۆدێرنیزم سەبەتەیەکە چەندین ڕێچکەو بزاوتی ئەدەبی و هونەری لەخۆدەگرێ وەك (ریالیزم realism، سروشتگەری naturalism، هێماگەری symbolism، گوزارشتگەری expressionism، وێناگەری imagism، ئایندەگەری futurism، هەمیشەگەری vorticism، دادایزم dadaism، سوریالیزم surrealism... هتد). هەندێکی تریان پێیانوایە مۆدێرنیزم یەکێکە لەو ڕێچکانەی سەرەوە" یان مۆدێرنیزمی بالا High Modernism هەیە کە دەستەبژێرێکی دیاری ئەدیبانی سەردەمی جەنگی جیهانی یەکەم لەخۆدەگرێ‌و وەك دیاردەیەکی ئەدەبی سەریانهەلدا، فۆرم و ناوەرۆك و خەسلەت و ئەدگاری هاوبەش ئەو ئەدیبانەی پێکەوە کۆکردبووەوە (ئەزرا پاوەند Ezra Pound، ت.س.ئیلیۆت T.S. Eliot، ویندەم لویس Wyndhan Lewis، جێمس جۆیس James Joyce). ئەوەی

دۆخەکە ئاڵۆزدەکا ئەوەیە کە مۆدێرنیزم خەسڵەتێکی هونەریی گشتگیر بوو کە تەنها پەیوەندیی بە ئەدەبەوە نەبوو، بەڵکو موزیك و نیگارکێشان و پەیکەرتاشینیشی دەگرتەوە، هاوکات شۆڕشێکی جیهانی بوو کە کاریگەریی بەسەر هەموو فۆرمەکانی هونەری خۆرئاواییەوە بەجێهێشت و تەنها زمانی ئینگلیزی نەدەگرتەوە.

سەرەتا دەبێ مرۆڤ وریابێ‌و نەکەوێتە گشتاندن و تێکەڵکردنی بابەتەکان. چونکە لە کاتێکدا هەوڵە سەرەتاییەکانی ئەدیبە مۆدێرنیستەکانی ئینگلتەرا لەپێناو پساندنی پەیوەندیەکانیان بە کەلەپوری رۆشنبیری خۆیانەوە بریتی بوو لە لاساییکردنەوەی فۆرم و شێوازی هونەریی لە فەرەنسا، لەڕێگەی بەگەڕخستنی ئەو نمونە هونەرییە هەستیارانەوە کە غەریزە بزوێن بوون، بەڵام نابێ مۆدێرنیزمی ئینگلیزی تەنها بۆ ئەو کاریگەرییە بگەڕێنینەوە، بەڵکو دەبێ باس لە چەند هەوڵێکی هاوجۆر بکەین لە خودی رۆشنبیری ئینگلیزیدا لەپێناو دابڕان لەگەڵ کەلەپوردا یان تەماشاکردنەوەی بەدیدێکی نوێ، وەك ئەوەی لە چەند هەوڵێکدا بەدیدەکرێ وەك هەوڵەکانی تۆماس هاردی Hardy، ئیدوارد تۆماس Thomas و د.ه. لۆرانس D.H. Lawrence کە سەرەڕای سەختی بارودۆخی پێشەنگەکانی ئەو هەوڵانە خەریك بوو مێژو لەیادی دەکردن.

هۆکارێکی تر کە پێویستە مرۆڤ رەچاوی بکا ئەوەیە کە تاقە مۆرکێك لەڕووی چۆنایەتییەوە بەسەر تیۆری رەخنەیی مۆدێرنیزمدا باڵی کێشاوە کە چەند تیۆرێکی رەخنەیی فێمێنیستی لەخۆگرتووەو دژی باڵادەستی سیستمی باوکسالاری Patriarchal ئاراستەکراوە بەجۆرێك کە تینوێتی تویژەر ناشکێنێ. هەروەها رەنگە بایەخدانی پێویست بە ئەدەبی ئافرەتان لەم سەردەمەدا ببێتە هۆی راستکردنەوەی رێڕەوی مێژوی بزاوتی مۆدێرنیزم، یان هەروەك راشیل بلۆ دوپلسیس Rachel Blau du Plessis لەمبارەیەوە دەڵێ:

"یەکسانکردنەوەی مێژوی ئەدەبی مۆدێرنیست بەو بەرهەمانەی کە پیاوان دەربارەی خۆیان پێشکەشیان کردووە، بێگومان دەبێتەهۆی سنوردارکردنی توانای مرۆڤ لەتێگەیشتنی رەهەندەکانی مۆدێرنیزم و دەرەنجامە بەیەکداچوەکانی ئەو دوو ئاستە، هەروەها سنوردارکردنی تێگەیشتنی رۆڵی ئەدەبی ئافرەت کە دەکرێ لەپێش رۆڵی پیاوەوە بێ. فەرهەنگی مۆدێرنیزم کە تائێستا پێویستی بە شیکردنەوەو ساناکردنەوە هەیە قەرزارباری کۆششی چەند ژنێکی وەك (ستین Stein، لۆی Loy و مۆر Moor )[2] هەیە. ماریان دیکۆڤن Marianne Dekoven کە لەژێر کاریگەری کریستیڤاو رۆمانەکانی ستین–دایە پێیوایە کە نوسینە مۆدێرنیستە پێشەنگەکانی ئافرەتان دژی باڵادەستی سیستمی باوکسالارییە. ئەم هەڵوێستە هەڵوێستێکی پێویستە لەپێناو لەبەریەکهەڵوەشاندنی رۆشنبیری باڵادەست، بەتایبەتی کاتی بایەخەکانی چڕدەکاتەوە لەسەر وتە ئاماژە (الدال signifier) نەك واتا ئاماژە (المدلول signified). جین کامێر Jeanne Kammer پێیوایە شێوازی مۆدێرنیستی دیکنسۆن Dickinson[3] ماریان مۆر و ه.د H.D[4] زادەی فشارەکانی بێدەنگی، نەریتی شاردنەوە، خۆدزینەوەو چاوبەستەکین، کە شوێنپەنجەیان بەسەر پێکهاتەی زمانەوانی چڕکراوەو پەیوەندیەکانی هاوسێیەتییەوە juxtaposition بەجێهێشتوە".

لەنێوان بۆچوونە گرفتئامێزو بەربڵاوەکانی پێناسەی مۆدێرنیزمدا پێناسەیەك لە فەرهەنگی زاراوە ئەدەبیەکانی –ئەبرامس Abrams: Glossary of Terms هاتووەو دەڵێ: زۆربەی رەخنەگران لەسەر ئەوە کۆکن کە "مۆدێرنیزم دابڕانێکی ئانقەست و تاهەتایی لەخۆدەگرێ لەگەڵ بنەما کەلەپوریەکانی رۆشنبیری و هونەری خۆرئاوایی"، ئەوانەی بانگەشە بۆ ئەم دابڕانە دەکەن "چەند بیریارێکن ئەو یاسا نەگۆڕانە دەخەنە بەر پرسیار کە لەدێر زەمانەوە پێڕەودەکرێن لەلایەن سیستمی کۆمەڵایەتی، ئاین، ئاکار و بابەتە دەرونیەکانی مرۆڤ ، وەك نیچە (1844–1900)، مارکس و فرۆید، هەروەها جێمس فرێزەر Frazer کە لە کتێبی (چڵی زێڕین 1915-1890 The Golden Bough)دا پەیوەندی نێوان بیروباوەڕی بنەڕەتیی مەسیحی و ئەفسانەو سروتە سەرەتاییەکان دەردەخا". پاشان دەڵێ چالاکیی راستەقینەی مۆدێرنیزمی ئەدەبی پاش جەنگی جیهانی یەکەم دەستپێکرد "ئەو جەنگەی کە باوەڕی مرۆڤی بە پرنسیپەکانی شارستانیەت و کولتوری خۆرئاوایی لەقکردو متمانەی لەئاست بەردەوامبوونی ئەو شارستانیەتەدا هەڵتەکاند" (ل109).

دەکرێ ئەم پێناسە لەقاڵبدراو و ئامادەیە پەسەند بکەین، بەلآم پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە. چونکە بێگومان مۆدێرنیزمی ئەدەبی رەگوڕیشەی لە کتێبەکانی ئەو ئەدیبانە داکوتیوە کە هەوڵیانداوە خۆیان لەگەڵ فەلسەفەی نوێی بوونی مرۆیی بگونجێنن، کە هەرچەندە جیاوازن لەو فیکرەی بۆتە سەرچاوەیان بەلآم پەیوەندیشیان پێوەی هەیە وەك فیکری داروین، مارکس و نیچەو کەسانێکی تر. لێرەدا چەند نمونەیەکی زۆر کورت و گشتی لەیەك کاتدا دەهێنینەوە: ئەگەر وێنای باو دەربارەی مرۆڤ بەر لە داروین بریتی بووبێت لەو فریشتەیەی کە دابەزیوەتە سەر زەوی، ئەوا دوای دەرچوونی کتێبی (بنەمای جۆرکان The Orgins of species, 1859) وێنەی مرۆڤ لە وێنەی مەیمونێکی سەر بە سولالەیەکی بەرز زیاتر هیچی تر نەبوو. ئەگەر تێگەیشتنی باو لە مێژوو بەر لە مارکس بریتی بووبێت لەو شتەی کە دەشێ مرۆڤ هەندێ جار رۆڵێکی چالاکی تێدا ببینێت، ئەوا لەدوای دەرچوونی کتێبی (سەرمایە– بەشی یەکەم Das Kapital, 1867) مێژوو تاڕادەیەکی زۆر بووە بەرچەکردار لەئاست گۆڕانە ئابوریەکاندا. هەروەها ئەگەر تێگەیشتنی گشتی دەربارەی رەفتاری مرۆیی بەر لە فرۆید پشت ئەستور بووبێ بەو گریمانەیەی پێیوایە مرۆڤ هوشیارە دەربارەی خودی خۆی و ئامادەییە زەینیەکانی، ئەوا هەردوو کتێبی (شیکردنەوەی خەونەکان The Interpretation of Dreams, 1900، زانستی گشتی نەخۆشیە دەرونیەکان The Psychopathology of Everday Life, 1901) و کتێبەکانی تری فرۆید بۆچونێکی چارەسکاریان پێشکەشکرد بەوەی مرۆڤ تەنها هۆکارە دەرەکیەکانی رەفتاری خۆی دەناسێ. پاشان ئەگەر تێگەیشتنی باو دەربارەی ئاکار بەر لە نیچە بریتی بووبێ لەو یاسا رەگداکوتیوەی کە گومان هەڵناگرێ، یاسایەك بڕوای بە خودایەکی سەربەخۆ هەیە لە دەرەوەی قەوارەی مرۆڤ و قابیلی لەناوچوون نیە، ئەوا لەدوای هەردوو کتێبی (زەردەشت ئاوهای گوت Thus Spake Zarathust, 1885-1883، زانستی شاد The Gay Science, 1882) ئاکار بووە ئەو وەهمە پێویستەی کە ئەقڵی مرۆڤ ئەفراندوویەتی، هەروەها بەگوێرەی پێویستیەکانی مرۆڤ گۆڕان لەو ئاکارەدا ئەنجامدەدرێ.

هەرچەندە ئەم کورتکردنەوەیە کرچیی تێدایە، بەڵام ئاشکرایە کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە بناغەی بیرۆکە باوەکان دەربارەی سروشتی مرۆڤ و پێگەی مرۆڤ هەڵتەکی. کاتێکیش خۆری ئەو سەدەیە ئاوابوو ترس لە ئایندە لە ناخی گرووپێك لە ئەدیبان و هونەرمەندان لە سەرانسەری وڵاتانی خۆرئاوا چەکەری کرد، نیگەران بوون لە چارەنوسی بوونی مرۆیی وەك ئەوەی مرۆڤ بەزۆر لە جیهانی خۆی داماڵدرابێ و بەدوای ئاڵتەرناتیڤی تردا بگەڕێ کە چەندین ئەگەر لەخۆدەگرێ. مۆدێرنیزم لەڕووی فۆرم و بابەتەوە هەموو ئەو کۆششانەی بیرکردنەوەو خۆگونجاندن دەگرێتەوە کە خرانە گەڕ لەپێناو گەیشتنەوە بە گۆڕانکارییە کولتورییەکانی سەردەم، وەك کارە ئەدەبییەکانی جۆرج مۆر Moore ، جۆرج گیسنگ Gissing تا جویس ویندەم لویس Wyndham Lewis ، هەروەها لە براوننگ و ئارنۆڵدەوە Browning & Arnold تا ئیلیوت و پاوەند.

بەڵام کەموکورتی ئەم تێگەیشتنە لەوەدایە کە مۆدێرنیزم کورتدەکاتەوە بۆ ئەو ماوە زەمەنییە، هەموو ئەو کۆششە پێشوەختانە لەیاددەکا کە مژدەی دنیابینییەکی نوێیان بۆ مرۆڤ پێ بوو. پێویستە مرۆڤ چەمکی مۆدێرنیزمی ئەدەبی بگەڕێنێتەوە بۆ ئەو سەردەمەی کە کارەکانی فلۆبێر Flauber و ویتمان و Whitman پۆ Poe (کە بۆدلێر Baudlaire تەمەنێکی دوورو درێژی بە وەرگێڕانیەوە سەرفکرد) لەبرەودابوون، هەروەها کارەکانی گرووپێکی تری نوسەران کە بەهێواشی دزەیاندەکردە ئینگەلتەرا (بۆ نمونە دراماى ئوسکوندناڤی، کاریگەری ئیبسێن Ibsen لەسەر جۆیس و شۆ Shaw، ڕۆمانی فەرەنسی و روسی، شیعری ئەمریکی، لێکۆڵینەوەکانی پاوەند دەربارەی ئێرنست ڤیۆلسا Ernest Fenollosa، یان کاریگەری ئەدەبی نەتەوە دوورەکانی وەك ژاپۆن و چین). ئەگەرنا، ئەوا دەبێ مرۆڤ دوو قۆناغ لەیەك جیابکاتەوە: قۆناغی بەر لە مۆدێرنیزم pre-Modernism کە ئەو ڕەوتانەی پێشتر باسمانکردن لەخۆدەگرێ، یان سەرەتاکانی ئەو قۆناغە بەرجەستەدەکا کە دەکرێ ناوبنرێ وەرچەرخانی مەعریفی بەر لە کتێبی بنەمای جۆرەکان– داروین، ئەو قۆناغەی کە تائێستاش بەردەوامە" لەگەڵ قۆناغی مۆدێرنیزمی باڵا High Modernism یان مۆدێرنیزمی راستەقینە Proper Mdernism کە دەوروبەری ساڵی 1914 دەستپێکرد.

بەهەرحاڵ گومان لەوە نیە کە هەر نوسەرێك لەو چەند نوسەرە مۆدێرنیستە دیارانەی ئاماژە بەکارەکانیان دەدەین، لە ژیانیاندا لەو خاڵەوە دەستیان پێکردوە کە بیرکردنەوەیان گۆڕانی بەسەرهاتووە، هەرچەندە دەربارەی هەندێکیان مشتومڕێکی زۆر لەئارادایە. د.هـ. لۆرانس پێیوایە ساڵی 1915 ئەو ساڵەیە کە کۆتایی جیهانی کۆنی بەخۆوە بینی (Kangaroo, 1923). ڤێرجینا وۆلف لەسەر زاری مستەر بێنیت Mr. Bennet و مسز براون–ەوە Mrs Brown (1924)دەڵێ: "دەوروبەری مانگی دیسەمبەری 1910 کەسایەتی مرۆڤ گۆڕانی بەسەرهات" (ل321). ئەزرا پاوەند دەستپێکردنی ڕەوتی وێناگەری Imagism لە کافتریای سەر بە مۆزەخانەی بەریتانیا لە ئەپرێلی 1912 وەك ئەو سەرەتایە دەستنیشاندەکا. بەڵام هـ.ج ویڵز H.G. Wells قەیرانی مەغریبی ساڵی 1905 بۆ ئەو مەبەستە دەستنیشاندەکا. تەنانەت ئەو توێژەرانەی لە مۆدێرنیزم دەکۆڵنەوە لەسەر دیاریکردنی سەرەتایەك هاوڕا نین: بۆ نمونە هاری لێڤین Harry levin(1966) پێیوایە لەنێوان ساڵی 1922 و ساڵی

1924دا جیهـان هەڵچـوونی بزاوتـی مـۆدێرنیزمی بـەخۆوە بینیـوە، بـەڵام ریچـارد ئێڵمـان Richard Ellmann (1966) پێـی باشـترە سـاڵی 1900 وەك دەسپێکردنی هەرەتی بزاوتەکە لەقەڵەم بدا.

هەرچـەندە جیـاوازی لـە دیدوبۆچـونەکاندا هەیـە، بـەڵام نابـێ ئـەوە لەیادبکـەین کـە مەسـەلەکە پەیوەنـدی بـەدیاریکردنی شوناسـی سـەردەمێکەوە هەیـە، هـەروەها نابـێ تووشـی شـۆك بـبین کاتـێ لـە هەڵبـژاردەی کـارە مۆدێرنیسـتەکاندا جـۆرە کۆدەنگییـەك دەبیـنین بـەوەی چوار (دەیـە)ی نێـوان 1890 و 1930 بریتییـە لـەو سـەردەمەی کـە لـەدایکبوون و بەلوتکـە گەیشـتنی مـۆدێرنیزمی بـەخۆوە بینیـوە. چـاخی درێـژی ڤیکتـۆری سـاڵی 1901 کۆتـایی پێهـات، سـاڵی 1919 مـاوەی فـەرمانڕەوایی ئینتقـالی ئێـدوارد–ی حەوتـەم ڕەوییەوە، پاشـان وەك ڕوداوی بەر لـە سێ سەدەی مـەرگی ئـەلیزابێت وەرچـەرخانێکی کۆمەڵایـەتی هاتەگۆڕێ کـە جیاوازییـە سروشتیەکانی تواندەوە، پەیوەندییـە مرۆییـەکانیش گۆڕانیـان بەسـەرهات: وەك پەیوەنـدی نێـوان سـەردارو کۆیلـە، ژن و مێـرد، کوڕو باوك. هەروەك ڤرجینا وۆلف–یش دەڵێ کاتێك پەیوەندییـە مرۆییـەکان گۆڕانیـان بەسـەرداێ گـۆڕان بەسـەر ئـاین و ڕەفتـارو سیاسـەت و ئـەدەبیش دێ (1966، ل321). جەنگی جیهانی یەکەم هەڵگیرساو لە دەرونـی زۆربـەی خەڵکیدا بڕوایـەك چەسپی کـە پێشـتر پێشـەنگانی بزاوتـی avant garde بڕوایـان پێهێنـابوو بـەوەی کـە شارسـتانیەتی خۆرئـاوایی هەڵەیـەکی تێدایـە، بـەڵام ئـەدیبان و هونەرمەنـدان پـەییان بەو هەڵەیە نـەبردووە، فۆرمـەکانی هونـەرو شێوازەکانی فیکریش نەك هەر دەستەوسان بوون لە چارەسـەرکردنی ئـەو هەڵەیـە، بـەڵکو لەوەدەچـێ توانـای مرۆڤیشـیان لـە دەستنیشـانکردن و هەڵسـەنگاندنی ئـەو هەڵەیـە لەکارخسـتبێ. هەربۆیـە خـەمی یەکـەم و هەڵبـژاردنی یەکلاکـەرەوەی مۆدێرنیزم بووە پێداچوونەوەی کەلەپوری ئەدەبی و یـاخیبوون لـە نمونـە ڕاستەوخۆ باوەکـان، بەجۆرێك لەڕووی هێزو خێرایـی و فراوانـی و پێشوەختییەوە جیاوازبێ لە بزاوتە کۆنەکانی یاخیبوون، ئەو دەمە لەیـەك کاتـدا چـەند گـەورە کـارێکی مۆدێرنیسـت هاتنـەبوون (دەرکـەوتنی ڕۆمـانی یۆلیسـیس–ی جـێمس جـۆیس Ulysses، چـامەی وێرانـە خـاك–ی ئیلیـوت The Waste Land، دیـوانی لاواندنـەوەکانی دونیـۆ–ی ریلکـە Duino Elegies, Rilke [5]، لەگـەڵ چەند کارێکی دیاری تر کەهـەموویان لـە یـەك ساڵدا لـە 1922 سـەریان هەڵـدا، بـەوەش مـۆدێرنیزم گەیشتە ترۆپکی خۆی).

هەرچـەندە ڕووداوە سـەختەکانی جـەنگی جیهـانی یەکـەم شوێنەواری وێرانکـەریان خستـەوە، بـەڵام کەشـوهەواو زەمینـە لـەباربوو. گـەر کـارە سـەرەتاییەکانی ئـەو ئەدیبانـە بخوێنینـەوە کـە ئەبرامس بە کۆڵەکەکانی مۆدێرنیزم لەقەڵەمیاندەدا، کۆمـەڵێك وشـە دەربـارەی پێشـکەوتن و مـۆدێرنیزم دەبینینـەوە کـە دەکەونـە قۆنـاغی بـەر لـە جـەنگ (بـۆ نمونە دەکریێ ڕۆمانی خەڵکی دبلن–ی جۆیس The Dubliners, 1905 ، چـامەی پرۆفـرۆك–ی ئیلیـۆت Prufrock, 1909 ، چـامەکانی دەریاگـەڕ–ی پاوەنـد The Seafarer ، لیوچـی Liu Che ، لـە وێسـتگەی مـیترۆدا In a Station of the Metro ... یەك لـەدوای یەك بخوێنینەوە). کارەکانی ئەوان کە دوای جەنگ بەرهـەم هـاتبوون درێژبوونەوەیـەکی سروشـتیی ئەزمونە پێشوەختەکانیان بوون، هەروەك خۆشیان دانیان پێدانابوو لەژێر کاریگەری کارەکانی کۆنراد Conrad ، جێمس James ، ئێرنست هیوم و بارونێگ

و هێماگەرە فەرەنسیەکاندا Symbolistes بوون کە سەرەتای هونەریی مۆدێرنیزمی باڵایان پێکدەهێنا.

کورتکردنەوەی مۆدێرنیزم –وەك هەموو بزاوتە ئەدەبیەکان– لە سەردەمێکی دیاریکراودا سەرکێشیەکی مەترسیدارە" چونکە هەموو دەقێك شتێك لە روخسارەکانی مۆدێرنیزمی تێدایە بەو پێیەی پەیوەندی و ئاوێزانی لەگەڵ چرکەی هەنوکەییدا هەیە، پۆڵ دی مان و چەند کەسێکی تر لەمبارەیەوە جەختیان لەسەرئەوەکردووە کە جیاکردنەوەی کارێك لە کارێکی تر لە سەردەمێکی دیاریکراودا پێویستی بە گەڕان هەیە بەدوای خەسڵەتەکانی هەردوو کارەکەدا، هەروەها سنوری جیاکەرەوەی قۆناغەکانی مێژوی ئەدەب ناگەڕێتەوە بۆ بوونی چەند نیشانەیەکی تایبەت، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ شکستی ئێمە لە خوێندنەوەی وردی دەقەکان.

لێرەدا دی مان باس لە مۆدێرنیزم ناکا بەو ئەندازەیەی باس لە "مۆدیرنیتە Modernity" دەکا کە قۆناغێکی مێژویی جیاواز پێکناهێنێ، بەڵکو زنجیرەیەك چرکەساتی درەوشاوە incandescent "کە ئارەزوی وەلانانی شتە کۆنەکان لەخۆدەگرێ، بەهیوای گەیشتن بە خاڵێك کە دەکرێ ناوی بنێین ئێستای راستەقینە، خاڵی دەسپێکردنی سەرەتایەکی نوێ"(1971، ل148). تیری ئیگڵتن درێژتر باس لەم بابەتە دەکاو دەنوسێ:

گەیشتن بەو دۆخە لەدایکبووی هەستکردنی مرۆڤە بەوەی چرکەساتێکی مرۆیی پڕاوپڕ لە قەیران و ئەگەری گۆڕان لەئارادایە، چرکەساتێکە سەرسامیی و ورەی مرۆڤ دەوروژێنێ، گومان لە ناخیدا دەچێنێ و شادی دەخاتە دڵیەوە، لە یەك کاتدا هێمنیی لێدەتۆرێنێو هەستی خۆشنودیشی لا دەبزوێنێ... چرکەساتێکە مرۆڤ لەئاست راچەنینی ئێستادا، کە دەیکاتە پاساوێك بۆ ناشتنی هەموو دەسکەوتە کۆنەکان لە "گۆڕستانی کەلەپور"دا، لە یەك کاتدا باوەش بە مێژودا دەکاو نکوڵیشی لێدەکا. (1986، ل139)

پاشان دەکرێ تەماشای "مۆدێرنیزم Modernism" بکەین نەك بەو پێیەی چرکەساتێکی مێژوییە، بەڵکو بەو پێیەی نوێترین و بوێرانەترین چرکەساتە، بەڵام "مۆدیرنیتە Modernity" زاراوەیەکە دەکرێ بۆ چەندین قۆناغی مێژوی ئەدەبیمان بەکاری بێنین، دەکرێ پەنای بۆ بەرین بۆ وەسفکردنی چەند ئەدیبێکی چاخی یەعقوبی Jacobean، چەند ئەدیبێکی چاخی گەڕانەوەی پادشایەتی Restoration و سەرەتای سەدەی هەژدەیەم، هەروەها دەکرێ بەکاریبێنین بۆ چەند ئەدیبێك لە کۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا.

لەبری ئەوەی باس لە یەك قۆناغی "مۆدێرنیزم Modernism" بکەین باشتر وایە باس لە چەند قۆناغێك بکەین کە ئەدیبان و بیریاران سەرقاڵی خەمی تازەکردنەوە Modernity بوون، لە گرنگترین ئەو خەمانە (هەروەك دی مان دەڵێ) دەکرێ باس لە خواست و پەرۆشی ڕەتکردنەوەی ڕابردوو بکەین. هەرچەندە ئەو خواستە چاخێکی دیاریکراوی بەخۆوە سەرقاڵکرد و لەژێرەوە بەپەنهانی مایەوە، بەڵام ئێمە هەر بڕوامان وایە کە بەکارهێنانی زاراوەی "مۆدێرنیتە" –گەر بواری بەکارهێنانی دیاریبکەین– بۆ شوێنێکی ئاوها شیاوە، چەند فاکتەرێکیش لەئارادان کە بەشێوەیەکی تۆکمە بەو زاراوەیەوە پەیوەندیدارن و لە هەموو بوارەکانی بەکارهێنان و پێڕەوکردنیدا بەرجەستەدەبن. گەر مۆدێرنیتە –وەك دیاردەیەکی ئەدەبی و مێژوویی کە واتایەکی بەرفراوانتری هەبێ– هەموو ئەو قۆناغانە

بگرێتەوە کە وەرچەرخانی گەورەی تێدابووە لە بنیاتی مەعریفەو ئایدیۆلۆجیا مرۆییەکان و تێگەیشتن و وردبوونەوە لێیان، ئەوا دەکرێ بڵێین ئەو وەرچەرخانانە ناولێنانی تر وەردەگرن" بەڵام بەهەرحاڵ ئەوەی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەو سەرەتاکانی سەدەی بیستەم روویدا ئەدگاری تایبەت و دۆخی فیکری و مێژویی خۆی هەیە.

گومانی تێدا نیە کە تەوەری ئەو وەرچەرخانانە بریتی بوو لە پێویستی هەڵوێست وەرگرتن لەئاست هەموو ئەو دیاردە حەتمیانەی کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا خۆیان سەپاندووە. پەرچەکردارەکانیش بریتی بوون لە هەوڵەکانی خۆگونجاندن و خۆچواندن، یان هەڵاتن و تێپەڕاندنی دیاردە حەتمیەکان" کارێکی لەمجۆرەش هاریکاریمان دەکا بۆ شیکردنەوەی فرەیی لە فۆرمەکانی مۆدیرنیزم و فرەیی بابەت و ستراتیجەکانیان. بەڵام پەرچەکردارەکان زۆرجار بە ئاقاری هەڵوێستێکی ناکۆك لەگەڵ ڕأبردوی نزیکدا رۆیشتوون، هەروەها ناکۆك لەگەڵ زەماندا" هەرئەوەش فاکتەرێکی بەهێز بووە کە فۆرمە جیاوازەکانی مۆدێرنیزمی یەکخستووە: چونکە بەوپێیەی زادەی ئارەزوی دابڕانە لەگەڵ ڕأبردوودا، هەستکردن بەجۆرێك لە ونبوون لەخۆدەگرێ. بەمانایەکی تر: پێویستە رابردوی نزیك رەتبکرێتەوەو مێژو سەرلەنوێ دابڕێژرێتەوە یان سەرلەنوێ شیبکرێتەوە دوور لە گوتاری بۆماوە.

ئەم تێگەیشتنە باوە لە مۆدێرنیزم —کە داوای وریابوونەوە لە کابوسی مێژو بۆ یەکگرتن لەگەڵ واقعێکدا کە گوایا لە شێوازە بۆماوەکان و بەها رۆشنبیرییە کۆنەکان دەربازی بووە (دی مان، 1971، ل146–147)– رەگوڕیشەکەی دەگەڕێنێتەوە بۆ فیکری نیچە کە پێیوایە بێتوانایی لە فەرامۆشکردنی رابردو تەنها ئەو خەسڵەتە نیە کە مرۆڤ لە ئاژەڵ جیادەکاتەوە، بەڵکو خەسڵەتێکیشە کە سروشتی راستەقینەی مرۆڤ دەشارێتەوە. چونکە مرۆڤ —هەروەك نیچە دەڵێ– ناتوانێ هیچ کارێکی مرۆییانەی گەورە ئەنجامبدا گەر بەتەواوی دەسبەرداری رابردوو نەبێ و گەر لە دەروازە نا–مێژووییەکانەوە ژیان نەگوزەرێنێ. (بەگەڕخستنی مێژوو و خراپ بەگەڕخستنی، 1874 The Use & Abuse of History، 1910، ل11).

دی مان هەنگاوێکی دوورتر دەڕواو دەڵێ:

"کاتێ مۆدێرنیزم پەی بە ستراتیجەکانی خۆی دەبا —کە ئەڵبەت کاریگەرن چونکە پێویستیەك بەرهەمی هێناون و پاشەڕۆژیان لەبەرچاو گرتووە– ئەوا دەسبەجێ خۆی وەك وزەیەکی گەورە ئاشکرا دەکا کە تەنها مێژوو بەرهەم ناهێنێ بەڵکو خۆی لە خۆیدا دەبێتە بەشێك لە پرۆژەیەکی بەهێز کە ڕەگی لە ڕابردودا داکوتیوە... مۆدێرنیزم بەو پێیەی چەند پرنسیپێکە بۆ ژیان، ئیتر خۆی لەخۆیدا دەبێتە سەرچاوەو بنەڕەت، دەبێتە وزەیەکی بەرهەمهێن کە لە مێژوو ناترازێ. مەحاڵە بەناوی ئێستاوە مێژوو تێبپەڕێنین، یان بەناوی تازەکارییەوە رابردوو فەرامۆش بکەین، چونکە هەردوکیان بە زنجیرەیەکی زەمەنییەوە گرێدراون کە دەیانباتەوە سەر چارەنوسێکی هاوبەش". (1971، ل150).

"فەرامۆشکردنی دڵڕەقانەی رابردوو ruthless forgetting" کە ئەدگارێکی سەرەکی مۆدێرنیزمە – بە بۆچوونی دی مان و هەروەها نیچەش– کۆدژی و هەڵەیەکی ئەوتۆی تێدا نیە کە مەحاڵ بێ پێڕەوبکرێ، بەڵکو دەکرێ لە خۆیدا هاندەرێك بێ بۆ مەزنترین و کاریگەرترین چرکەکانی داهێنان. چونکە ئەدەب هیچ نیە جگە لە هەوڵێکی بێوچان بۆ

لێکترازاندن و وێرانکردنی قەوارەیەك تا سەرلەنوێ لەدایکبێتەوە، دۆخێکە لە بێدەسەڵاتی بەردەوام کە دەکەوێتە پێش بەئاگاهاتنەوە لە مۆتەکەی مێژوو. (ئیگڵتن، 1986، ل136).

ئەم خەسڵەتە لە کارە مۆدێرنیستە مەزنەکاندا بەدیدەکرێ: وێرانە خاك، سرودەکانی ئەزرا پاوەند The Cantas، رۆمـانی یۆلیسـیس. هەرچـەندە ئـەو کارانە بەپەرۆشەوەن بۆ بەئاگاهاتنەوە لە مۆتەکەی مێژوو، بەڵام هێڵێکی ئاڵۆز و باریك دەیانبەستێتەوە بە رابردووەوە، بەتایبەتی رابردوی ئەدەبی. ئـەمجۆرە کارانـە نکـوڵی لـە کەلـەپور ناکـەن و دوژمنایـەتیی ناکـەن، بـەڵکو هەوڵـدەدەن سـەرلەنوێ دایڕێژنـەوەو پرسەکانی رابردوی نزیك بەشێوەیەکی راستەوخۆ تێپـەڕێنن، لـە کەلـەپوری دەوڵەمەنـدی ئەدەبیشـدا بەرهەمـە باشـەکان لەسـەر ئاسـتی لۆکاڵی و مرۆیـی هەڵبـژێرن. بەوپێیـەی ئـەم کارانـە لـە کـەفوکوڵی داهێنانـدا هوشیار بوون بە سەرچاوەکانی خۆیـان، هەربۆیە دەبینین ستایشی ئەو شتانە دەکەن و ئەو شتانەمان یاد دەخەنـەوەو دایدەڕێژنـەوە کە پێشتر هەوڵیانـداوە یـاخی بن لێیـان. گـەر ئـەم بابەتـە وەك ئەدگارێکی مۆدێرنیزم یـان وەك قۆناغێکی بنـەڕەتی و چارەنوسسازی ئەو گەشەکردنە ببینین، ئەوا هـیچ دەرەتانێکمان لەبەردەمدا نیە جگـە لـە بڕواهێنـان بـە قسەکەی دی مان کە پێشتر ئاماژەی پێدرا، هەروەها داننان بەوەی کە شوناسـی مۆدێرنیزم لـە سروشـتی ئەو دیالۆگەدا ئامادەیە کە لەگەڵ مێژوودا دەیکا بەر لەوەی دابڕان بێ لەگەڵی.

بـەڵام هێنـدە بەسـە دەربـارەی هۆکارەکـانی سەرسـوڕمانی ئـەو پێشـەنگە مۆدێرنیسـتانە لـە چوارچێوەیەکی تیوریدا قسەبکەین؟ بەدەربڕینێکی تـر: ئایـا پیویسـت دەکـا پەرۆشـیی ئـەوان بـۆ مـۆدێرنیزم بـەوە لەقەڵـەم بـدەین کـە جۆرێکـە لـە گـوڕوتین و گـەڕان بەشـوێن بابەتـە نـەمرەکانی تازەگـەری لـەپێناو تازەگەریدا بـێ لەبەرچـاوگرتنی فاکتـەرە مێژوییـە راسـتەوخۆکان و ئـەو بابەتانـەی سـەردەم کـە بەسەردەچـن؟. ئێمـە گـەر کـارێکی لـەمجۆرە بکـەین دەکەوینـە کۆدژییەکـەوە کـە ئەنجامـەکانی بـاش نـابن" چونکە جـەنگی جیهـانی یەکـەم کە روداوێکـی زۆر ترسناك و کاریگـەر بـوو، دەسـبەجێ لەسـەر هونەرمەنـدان و ئـەدیبان رەنگیدایـەوە، ئـیتر دەبـوو زۆربـەیان پەنابـەرن بـۆ مۆدێرنیزمێکی راستەقینە کە پێچەوانەی یەکـەمین هەنگاویـەتی لـە گوێنەدانـە رابـردو و نکـوڵیکردن لـە مێژوو.

لـە دەیـەکانی بـەر لـە جەنگـدا چـەند کـارێکی ئەدەبی دەرکەوتن کە تیایاندا هەست بـە ونبـوون و نـامۆیی دەکـرێ لەسـەر ئاسـتی تاکەکەسـی و کولتوری. چونکە گەڕانی مرۆڤ بەشوێن مەعریفەدا گەیشتە لوتکەو هەموو سنورەکانی بەزاند پاشان بـە نیگەرانی و هەستکردن بە نامۆیی لـە ئاست وێنـەی بـاوی خۆیـدا کۆتـایی هـات. چـاکترین بەڵگـەش لەمبارەیـەوە کـارە ئەدەبیـە هەمەجۆرەکانـە، وەك رۆمانـەکانی: جۆزیـف کۆنراد– دڵـی تاریکیی The Heart of Darkness, (1899)، ئۆسکار وایڵد– وێنـەی دۆریـان گرای The Picture of Dorian Gray (1980)، جـۆرج مـۆر– ئـاوی ئەسـتەر Esther Water (1894)، وێڵز Tono Bungay (1909)، فۆرد مـادۆکس فـۆرد F. Madox Ford و سـەربازە باشـەکە The Good Soldier (1915). ئەو کەسایەتییە سەرەکیانەی کە لە تەواوی ئەم رۆمانانەدا ژیانێکی پان و بەرین و پڕ لە ئەزمون و مەعریفـە بەسـەردەبەن، دواجـار تـا ئاسـتێکی زۆر بێکـەس و بێبەشـن لـە چـنینەوەی بـەروبومی کۆششـەکانیان لـە جیهانێکـدا کـە خۆیـان دروستیانکردوەو ئاوەدانیان کردۆتەوە.

ئــەم خەســڵەتە تاقــە خەســڵەتی ئــەدەبی مۆدێرنیست نەبوو لە سەرەتاکانی دەرکەوتنیدا" چونکە لە چەند فۆرمێکی جەماوەریداو لە چەند رۆمـــانێکی وەك: بەندیخانـــە imprisonment و شوناســـی زەوتکـــراو identity wronged دا هەمەجۆرییـــەکی ســـەرنجراکێش بەدیـــدەکرێ وەك جۆرە ژەنینێك لەسەر ژێی کەسایەتییە دوانەییەکان و ئـەو زیندانانـەی کـە چـەندین راڕەوی نهـێنی و تێکـــەڵی تێدایـــە، هەلومـــەرجێکی نائـــارام بەرجەستەدەکا کە تیایدا مرۆڤ لە دۆخێکی رەهاو بێسنوورەوە دەچێتە دۆخێکی رێژەیی و سنوردار، لە جیهانێکەوە کە تەنها دەنگی خۆی دەبیستێ بۆ جیهانێکی واقیعی جەنجاڵ و پڕ لە دەنگ. سەرەتا دەکرێ لە ڕۆمانەکەی ئەلکسەندەر دۆماس (کۆنت دی مۆنت کریستۆ-1844)دا هەست بەم حاڵەتە بکـرێ، هــەروەها رۆمانەکــەی مــارکۆس کــلارك (فەرمانی زیندانیکردنی تاهەتایی)، رۆمانی Marcus Clark, For the Term of his Natural Life (1872)، رۆمـــانی بەنـــدکراوی زەنـــدا-ی ئـــەنتۆنی هـــۆب (1894)، دواجاریش رۆمانی قەڵا-ی فرانس کافکا The Castle (1926).

سەرەڕای کاریگەریی جەنگی جیهانی یەکەم لەسەر هەستکردنی تاك بە ونبوون و پلیشانەوە، جۆرە هەستێکی تر بە قەوارەی ئەو کارە ئەدەبییە گەورانە بڵاوبووبۆوە کە دوای جەنگ بەرهەمهاتبوون و بەرجەستەکەری مۆدێرنیزمی راستەقینە بوون. ئیـدی پرسـیارە سەرسـوڕهێنەرەکان و ئەزموونـە وروژێنـەرەکان نەبوونـە هۆکـاری هەسـتکردن بـە نـامۆبوون، بـەڵکو ئـەو دۆخـە ئـارامی ویـژدانی و هاوسـەنگی کولتـوری ئـەو نوسـەرانەی راگـرت کـە بەرگـەی شـۆکی شارسـتانی یەکـەمیان گرتبـوو. لـە چـامەی (وێرانــە خــاك)و رۆمــانی (یۆلیســێس)و سرودەکانی (ئەزرا پاوەند) ئەو هەستکردنە تۆخە بـە ونبـوون و پلیشـانەوە بـەدی نـاکرێ، بـەڵکو هەستکردنێکی لەوجۆرە ببوە هاندەرێك بۆ گەڕان بەدوای دەروازەیەك یان رێگایەك کە ویژدانی ئەو ئەدیبانە لە چنگی فەوتان رزگاربکا. پرسیارەکانی ئەو ئەدیبانەو گەڕانی بێوچانیان بەشوێن ئەزموونی نوێدا ببوە هۆی بەرەنگاربوونەوەی بەها کولتوریە بۆماوەکان لە ئەدەبی بەر لە جەنگدا کە لەگەڵیدا ژیـابوون و سـیمبولەکانیان لەنزیکـەوە ناسـیبوو، پێیانوابوو ئەدەبی ئەو قۆناغە (بەتایبەتی شیعری شـاعیرانی دارمـان decadent poets لـە نـەوەدەکانی سـەدەی نۆزدەهەمـدا: دۆسـن Dowson، جۆنسـن Johnson و یێتس Yeats) جۆرە گوزارشتکردنێك بووە لـە ئـەزموونی زاتـی کـە بەرهـەمی هەسـتکردنی هونەرمەند بووە بە نامۆبوون و بێدەسەڵاتی تاك لە ئەنجامدانی کاردا.

بەماوەیـەکی کـورت بـەر لەجـەنگ گروپێـك لـە ئەدیبان -بەتایبەتی شاعیرانی رێچکەی وێناگەری- کۆششـێکی زۆریـان خسـتەگەڕ بـۆ پڕکردنـەوەی کـەلێنی نێـوان هونـەرو ژیـان، پاشـان جـەنگ هەڵگیرسـاو راسـتگۆیی بانگـەوازەکانی ئـەوانی بـۆ هەموان دووپاتکردەوە. بۆ نموونە پاوەند لە ساڵی (1912)ەوە ئەوەی دووپاتکردەوە کە ولفرید ئۆین Wilfred Owen لـە بـەرەکانی شـەڕدا ئاشـکرایکرد، بەشـــێوازێکی رەوانـــیش لـــە پێشکەشـــنامەی بـەناوبانگی هەنـدێ لـە کتێبەکانیـدا گوزارشـتی لێکردبـوو: " ئـەم کتێبـە دەربـارەی قارەمانـەکان نەنوسراوە، چونکە هێشتا شیعری ئینگلیزی سازو ئامـادە نیـە بـۆ قسـەکردن لـەو بارەیـەوە". بـەدەربڕینێکی تـر پاوەنـد پێیوابـوو شـیعری ئینگلیزی بارکراوە بە نەریت و بابەتە بۆماوەکان، فۆرمـە عەروزییـە رەگـداکوتیوەکان، خەسـڵەتە

ئاوازییەکان، وشەسازی شیعریی و بابەتە شیعرییەکانی... بەجۆرێك تواناکانی لە وێناکردنی وردو راستەوخۆی واقعی زیندودا سنوردارکردووە.

کاتێ نوسەران سەرلەنوێ رۆڵی رۆشنبیری خۆیان، هی بەر لە جەنگی یەکەم، هەڵدەسەنگاندەوە، سەرنجێکی چڕیان خستبوە سەر رێگاکانی زانین و دەرکپێکردن، هەروەك لەم "سێ پرنسیپ"ەی رێچکەی وێناگەریی Imagism دا دەردەکەوێ کە پاوەند خستونیەتەڕوو:

1-باسکردنی راستەوخۆی "مەبەست"، جا ئیتر خودی بێ یان بابەتی.

2-بەکارنەهێنانی هەر وشەیەك کە بەشداری نەکا لە وێناکردندا.

3-سەبارەت بە ریتم: پێویستە شاعیر لەسەر بنەمای هەڵقوڵانی رستەی موزیکی شیعر بنوسێ، نەك لەسەر بنەمای کێشی عەروزی. (چاپی 1960، ل3)

ئەم نوسەرانە تەنها روبەرووی واقعێکی گریمانەیی نەبوونەوە لەپشت جیهانە خەیاڵییە دیارەکانەوە، کە بەشدارییان دەکرد لە داگیرکردنی ئەقڵ و هۆشی ئەدیبانی سەردەمی کۆن، سنوردارکردنی تەکنیکەکانی نوسین، پەراوێزکردنی بوونیان و راپێچکردنیان بۆ وێڵگەکانی نامۆبوون.. بەڵکو ئەو ئەدیبانە پەرەیان بە کەرەستەو تەکنیکەکانی خۆیان دەدا بەجۆرێك بگونجێ لەگەڵ ئەو ئەرکانەی پێیان دەسپێردرا. لەوێوە سەرلەنوێ چاویان خشاندەوە بە یاساکانی نوسین و هونەری ئەدەبدا لەبەر رۆشنایی بەرهەمە تازەکانی فیکری زمانەوانی، ئەو فیکرەی کە زمانی لە ریزی پێشەوە دادەنا، تا ئەدەب لە بەرەنگارییەکی بەردەوامی واقعدا نەبێ.

ئەمە بانگەوازێك بوو بۆ دەسپێکردنی قۆناغێکی گەورە یان قۆناغێکی باڵای مۆدێرنیزم و دەرکەوتنی جۆیس و پاوەند و ئیلیۆت و ستین و چەند ئەدیبێکی تر، قۆناغی ئەو دەقانەی کە بوێرانە گوزارشتیان لەخۆیان دەکردو "هەستی توڕەیی و یاخیبوونیان دژی دیدی باو بۆ واقع بەرجەستەدەکرد" (Munton, 1984)، هەروەها دەسبەرداری نەریتەکانی گێڕانەوەو وێنای بۆماوەو بنیاتی تەقلیدیی رستەو وشە بوون. هەربۆیە ئەو ئەدیبانە سەرنجی خەڵکیان بۆ ئەو خاڵە راکێشا کە پێویستە رۆمان یان چامە یان شانۆنامە چۆن بێ؟ هەروەها لە هەوڵی ئەوەدابوون کە خۆیان لە تاقە گوتارێکی ئەفراندن بدزنەوە تەنانەت گەر ئەو گوتارە زۆر لە وێناکردنی واقعیشەوە نزیك بێ. بۆ نموونە لە هەر نەسکێکی رۆمانی یۆلیسیس-دا جۆرە شێوازێکی گێڕانەوەی جیاواز خراوەتەگەڕ و خوێنەر هاندەدا دەرفەتەکانی دەربازبوون لە فۆرمە باوەکان و بەراوردکردنیان بە یەکتر ئاشکرابکا. هەروەها دەبینین ئەو شێوازی نوسینەی کە پاوەند لە (سرودەکان)دا پێڕەویدەکا چاودەپۆشێ لە رەوتی لۆجیکی گوتاری نەریتی و خوێنەر بانگێشت دەکا بۆ رێکخستنەوەی پارچە پەرتەکانی وێناکردن و شیکردنەوەیان بەگوێرەی تواناو رادەی تێگەیشتنی.

کارەکانی ئەو ئەدیبانە پێشکەوتنێکی گرنگ و پڕ واتای دەرخست لە شێوازەکانی بەکارهێنانی زماندا، بەجۆرێك بوونە گوزارشتکار و وێنەی بوونی مرۆیی لە چاخی نوێدا. سەیر نەبوو ئەو پێشکەوتنە هاوزەمان بێ لەگەڵ سەرەتای دەرکەوتنی تیوری زمانەوانی مۆدێرن (بنیاتگەری) لەسەر دەستی فرناندی دۆسێسیر لە جنێڤ لە موحازەرەکانیدا دەربارەی زمانناسی گشتی Course

in General Linguistics, 1916. هەرچەندە نابێ مۆدێرنیزم لەوەدا کورتبکەینەوە کە پاوەند و جۆیس و ئیلیۆت لەو بوارەدا پێشکەشیانکردبوو، بەلام نکوڵیش لەوە ناکرێ کە کۆششە داهێنەرەکانی ئەوان گەیشتبوونە ئەو ترۆپکەی کە لەڕووی زاراوەییەوە ناونرابوو مۆدێرنیزمی بالا، کە دواتر درێژبوونەوەیەکی لۆجیکی و سروشتیی پرۆسەی درێژی هەڵسەنگاندنی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و واقع، رابردوو و ئێستا بوو.

گەر لە گۆشەنیگایەکی بنیاتگەرییەوە بڕوانینە کارەکانی مۆدێرنیزمی بالا، دەکرێ پاساو بۆ ئەو رەخنانە بدۆزرێتەوە کە ئاراستەیان کراوە. ئەو کارانە زیادەڕۆییانەدەکرد لە رۆچوون بەجیهانی کەسایەتی تاکەکاندا دوور لە سیاقە کۆمەلایەتییە فراوانەکان، بەجۆێک دەبوونە بەڵگە بۆ دارمانی سەردەمەکەیان نەک پەرچەکردارێکی دژ بەو سەردەمە. جگە لەوە چەندین دەقی مۆدێرنیست هەن کە تۆمەتی "داخرانی سەرسوڕهێنەر"، یان بەنزم تەماشاکردنی خوێنەر، یان پشتگیریکردنی سیاسەتی دەسەلاتی سیاسییان دەخرێتەپاڵ (لۆکاش: Lukacs, 1963، یان جیمسۆن: Jameson, 1979). هەروەها رەخنەی بنیاتگەری دەتوانێ ئەوەمان بۆ روونبکاتەوە کە کارەکانی جۆیس و پاوەند و لویس و کەسانێکی تر بریتین لە زەوتکردنی کەسایەتی تاک و کەمبایەخکردنی کرۆکە جوانەکان لەپێناو شیکردنەوەی دەزگا فۆرمالیستە (بنیاتگەر)ەکان کە کاردەکەن و جڵەویاندەکەن، هەروەها پەیوەندی پتەویان بەو جیهانەوە هەیە کە لێی جیابوونەتەوەو بەتەواوی نکوڵییان لێکردووە.

بەلام "داخران"ی زۆربەی دەقە مۆدێرنیستەکان ئەڵبەتە دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك، لەپێش هەموویانەوە بایەخدانی چڕ بە دەقی نوسراو writerly زیاتر لە دەقی خوێنراوە readerly، یان دەگەڕێتەوە بۆ ئارەزوی نوسەر لە وروژاندنی بەهرەی بیرکردنەوە لای خوێنەر دەربارەی بابەتەکە، نەك سەپاندنی شێوازەکانی هەمان بابەت بەسەریدا. رەنگە هۆکارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ بایەخی نوسەران بەوەی لە چنینی کارەکانیاندا ئامادەبوونی رابردوو بەبەهێزی بپارێزن، یان دەشێ بگەڕێتەوە بۆ باوەڕهێنان بە فەلسەفەیەکی بەر لە نیچە، کە جەخت لەسەر رۆڵی ئیرادەی مرۆڤ دەکات لە زاڵبوون بەسەر گەڕانەوەی تاهەتاییدا eternal recurrence[6]، هۆکاری ئەو "داخران"ە هەر شتێك بێ، چاکتر وایە وەك جۆرێك لە بالاخوازی مەبەستدار بەرامبەر خوێنەر لێی نەڕوانین، بەڵکو پێویستە لەبەر رۆشنایی نائاشنایەتی estrangement[7] لێی بڕوانین، ئەو چەمکەی رەخنەگری فۆرمالیستی روسی شکلۆفسکی (1965) بلاویکردەوە، بەلام لە کاتی خۆیدا لای بەشێکی زۆری مۆدێرنیستە ئینگلیزەکان بەکارنەدەهێنرا. دواجار رەنگە ئەم "دابڕان"ە دیارە لە زۆربەی دەقە مۆدێرنیستەکاندا زادەی کەرەستەو هەڵسوکەوت و بابەتەکان نەبێ بەئەندازەی ئەوەی ڕەنگ بێ گوزارشتکردن بێ لە قەیرانی شارستانیەتی خۆرئاوایی، یان ئەو خواستە مەزنە بێ کە مۆدێرنیستەکانی هاندا لە کۆششەکانیاندا بەشوێن ئەو ڕێگە فیکری و کۆمەلایەتیانەدا بگەڕێن کە رزگاریاندەکا.

## پەراوێزەکان

1- دەکرێ بۆ وەرگێڕانی مۆدێرنیزم Modernism وەك زاراوەیەك کە بۆ ئاراستەیەکی ئەدەبی دیاریکراو

دانراوه وشەی (تازەگەری) دابنرێ واتە بە زیادکردنی پاشگری "گەری"، بەرامبەر (الحداثیة أو الحداثویة) لە زمانی عەرەبیدا، تاوەکو لە وشەی مۆدێرنیتە Modernity جیابکرێتەوە کە دەکرێ وشەی (تازەخوازی یاخود نوێخوازی) بۆدابنرێ بەرامبەر (الحداثة)ی عەرەبی هەروەها لە وشەی مۆدێرن Modern جیابکرێتەوە کە وشەی (تازە یاخود نوێ)ی بۆدانراوە بەرامبەر (الحدیث) لە زمانی عەرەبیدا. چونکە هەریەك لەو سێ وشەیە واتای تایبەت بەخۆی هەیەو ناکرێ لە جێی یەکتر بەکاربهێنرێن.(و.ك)

2–جێرترۆد ستین (1887–1946) خانمێکی ڕۆماننوسی ئەمریکییە، بەشێکی زۆری ژیانی لە پاریس بەسەربردووە، لە کارەکانی: سێ ژیان Three Lives, 1908، ژیاننامەی ئەلیس ب. تولکاس Autobiography of Alice B. Tolkas, 1933. ماریان مۆر (1887–1972) خانمە شاعیرێکی ئەمریکییە ناوبانگێکی زۆری لە نێوەندە ئەدەبیەکاندا پەیداکردووەو چەندین خەلاتی ئەدەبی وەرگرتووە، وەك ئافرەتێك بەشدارییەکی دیاری لە بزاوتی مۆدێرنیزمدا هەبووە. مینا لۆی (1882–1966) خانمێکە لە ئینگلتەرا لەدایکبووە لە خێزانێکی چینی ناوەڕاست کە ریشەیەکی جووی هەنگارییان هەبووە. لە نێوان ئیتالیاو نیویۆرکدا ژیاوەو ماوەیەك لە پاریس ماوەتەوە، تێکەلاوی هونەرمەندانی بزاوتی سروشتگەریی بووە، ڕەنگدانەوەی کارەکانی ئەو بزاوتە بەشیعرەکانیەوە دیارە. لە کۆتایی ژیانیدا لەگەڵ کچەکانیدا لە کلۆرادۆ (لە ئەمریکا) بووە، هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە.

3–ئیمیلی دیکنسۆن (1830–1886) شاعیرێکی ئافرەتی ئەمریکییە، بە چامە لیریکییە کورتەکانی ناسراوە کە هەناسەیەکی سۆفیانەی تێدایە.

4–نازناوی کورتکراوەی خانمە شاعیری ئەمریکی (هیلدا دولیتل)ە (1886-1961) Hilda Doolittle، ڕەخنەگران راوبۆچوونی جیاوازیان هەیە دەربارەی بەهرەی شیعریی ئەم خانمە، بەلام هەموویان هاوڕان لەسەر ئەوەی یەکێکە لە پێشەنگانی بزاوتی شیعری ئافرەتان لە ئەمریکا.

5–ڕینێ کارل فیلهم جۆزیف ماریا ریلکە (1875–1926) لە پراگ لەدایکبووە، شاعیرێکی ئەڵمانی بەناوبانگی خاوەن هەناسەیەکی لیریکیی شیرینە ، چەندین دیوانی هەیە، دەشێ دیوانی ناوبراو بەناوبانگترینیان بێ. بە ماوەیەکی کورت بەر لە هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەم دەستی بە نوسینی ئەو دیوانە کردووە و پاش جەنگ بەماوەیەك کۆتایی پێهێناوە، تیایدا هەست و سۆزێکی سۆفیانەی خودیی دەردەبڕێ، هەروەها گوزارشت لە پەرۆشی خۆی دەکا بۆ رزگاربوون و شادبوون بە دۆخێکی دەروونی ئارام لە جیهانێکی واقعی ئازاربەخشدا.

6–گەڕانەوەی تاهەتایی ڕێچکەیەکی فەلسەفییە، کاتی خۆی رواقیەکان باوەڕیان پێبووە، پاشان نیچە باسیکردوە. کرۆکی ئەم فەلسەفەیە لەوەدا چڕدەبێتەوە: ئەوەی کە هەبووە پێشتریش هەبووەو پاشتریش هەردەبێ بەجۆرێك مەحاڵە لە ژماردن بێ. هیچ شتێکی جێگیرو دڵنیا بوونی نیە، بەڵکو هەموو شتێك قابیلی دروستبوونەوەو دووبارەبوونەوەیە، پێویستە مرۆڤی بالا دژی گەڕان بێ بەشوێن هەقیقەتە ڕەهاکان و گەڕانەوەی تاهەتایی پەسەندبکا وەك مەرجێکی بوون و دەرفەتێك بۆ سەلماندنی خود. ئاشکرایە ئەم ڕێچکەیە پێچەوانەی دیدی ئاین و فەلسەفییە ئاکاریەکانە کە پێیانوایە هەرچەندە هەندێ لە ڕووداوەکانی جیهان زادەی ڕێکەوتی پەتین، بەلام بەپێی سیستمێکی دەگمەن و جێگیر دەڕۆن بەرەو مەبەستێك کە ماناو ئامانج دەبەخشێ بە بوونی مرۆڤ.

7–بەنامۆکردن Ostranenie، یان نائاشنایەتی Defamiliarisation زاراوەیەکە فۆرمالیستە روسەکان

دایانڕشتووه، ئەوانەی بانگەوازیان بۆ زمانێکی ئەدەبی دەکرد کە وەك پێویستیەکی هونەری پێچەوانەی زمانی ئاسایییە، چونکە زمانێکە لەسەرووی ئەو بەکارهێنانەی زمانەوەیە کە ئاشنایین پێی، هەروەها وزەیەکی گوزارشتکردنی نوێی تیایە کە یارمەتیدەرە بۆ لابردنی ئەو ئاشنایەتییەی هەمانە لەگەڵ ئەو شتانەی دەمانەوێ وێنایان بکەین، بەڵکو دەبێ نائاشنایان بکەین تا لە وێنەیەکی نوێدا کە پێشتر لەسەری ڕانەهاتووین بیانبینین.

### سەرچاوە

الأدب و النقد و التاريخ الأدبي، تأليف: مجموعة من الكتاب. ت: د. عبدالحميد شيحة. المجلس الأعلى للثقافة، 1999، ص 253–271.

# کێشەی مۆدێرنە لە دنیای پۆست مۆدێرنەدا

**خالد الحسینی**

**لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد**

ئەم کورتە لێکۆڵینەوەیە هەوڵدەدات جارێکی تر بیر لەو پرسیارە گرنگە بکاتەوە کە لەو وتار و لێکۆڵینەوانەی بایەخ بە فیکری نوێ و هاوچەرخی خۆرئاوایی دەدەن، بەردەوام دەخرێتە ڕوو، پرسیارەکەش ئەمەیە: مۆدێرنە و پۆست مۆدێرنە چییە؟

هێنانەوەو دووبارەکردنەوەی ئەم پرسیارە، واتای جوینەوەی ئەو شتانە نییە کە پێشتر وتراون، بەڵکو هەوڵدانێکە بۆ کردنەوەی بۆشاییەك لە هەندێ لایەنی پەراوێزکراوی ئەم دوو زاراوەیە و هەروەها بۆ دەرخستنی لایەنە نادیارەکانی، بەر لەوەی بچینە نێو سەردابەکانی ئەم کیشوەرە تاریکەوە، باشتر وایە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە سەرهەڵدانی مۆدێرنە وەکو پرسیارێکی فیکری و وەکو پرۆژەیەکی ژیاریی گەورە، بەشێوەیەکی ئەنتۆلۆجی پەیوەستە بە فیکری خۆرئاواییەوە و گوزارشتێکی ڕاستگۆیانەیشە لە بەهاو وێناکردنەکانی خۆرئاوا، دیسان گوزارشتێکە لە شوێنگەی خۆی بۆ چەمکی کات و شوێن و مرۆڤ. مۆدێرنە ڕووەکێکی سروشتییە و لە خاکێکی بە پیتدا چرۆی کردووە و ئەم ڕووەکە نامۆ نییە بەو خاکە، ئەمەش ڕەواییەکی بەهێزی پێبەخشیوە بەو پێیەی مۆدێرنە بەندە بە دینامیکیەتی مێژوویی کۆمەڵگەی خۆرئاوایی نوێ، واتە مۆدێرنە هەر لە سەرەتای سەرهەڵدان و شێوەگرتنیەوە تا ئەمڕۆ پەیوەستە بە کۆمەڵگای هاوچەرخی خۆرئاواییەوە.

پێم وایە بەر لەوەی بچینە ناو سیما گشتییەکانی ئەم پرۆژە شارستانیە گەورەیە یان ئەم نموونە گەردوونییەوە، دەبێ لەسەر سەدەی پازدەهەمی ئەوروپیدا بوەستین، چونکە ئەم سەدەیە لە ئەوروپای خۆرئاوادا سەرەتاو نۆبەرە و ژانەکانی لەدایکبوون دەنوێنێت. وەك دەزانین مۆدێرنە چەندین مێژوو و چەندین جوگرافیای هەیە، یەکەم تۆوی مۆدێرنە لە ئیتالیادا و بە تایبەتی لە چەرخی ڕێنیسانسدا دەرکەوت، لەوێدا شۆڕشێکی کۆپەرنیکی لە هەموو بوارەکاندا هەڵگیرساو ئەمە لایەنی هونەر و ئەدەب و زانستەکانیشی گرتەوە و پارسەنگی کۆمەڵی

ڕووداوی مێــژوویی گرنگــی کــرد، وەك: دۆزینــەوە جوگرافیـــــــەکان و ریفـــــۆرمی ئــــــاییني و زیندووکردنەوەی فیکری یۆنانی و ڕۆمانی.

بــەهۆی دینامیکیــەت و گەشــەی بــەردەوام و خێرای مۆدێرنـەوە، گەیشـتە فەرەنسا و ئـەڵمانیا و ئینگلتـەرە و لـە مـاوەی سـێ سـەدەدا ڕەهەنـدێکی گەردوونیی وەرگرت. واتە لە سەدەی هەژدەهەمەوە کـە لـە ئـەوروپادا بـە سـەدەی ڕۆشـنگەری ناسـرا، ئاگـایی لەبەرامبـەر مۆدێرنـەدا بەشـێوەیەکی فراوان زیـادی کـرد، واتــە لــە دوای ســێ ســەدە ئینجـا دەستکەوتە گەورەکانی مۆدێرنە بەرهەمی بەپیتیان بـۆ مرۆڤایــەتی خســتەوە، لــە راســتیدا ســەدەی هەژدەهــەم - واتــە چــەرخی ڕۆشـنگەری - سـەدەی ســەرکەوتنی بــەهاکانی ئــازادی و دادپــەروەری و دیموکراســی و کرانــەوە بــوو، واتــە ســەردەمی سەرکەوتنی بیری فەلسەفیانەی ئازاد بوو کە هـەوڵی دەدا دامەزراوەکانی کەنیسە ڕووت بکاتەوە و لایەنە ســتەمکارییەکانی ئاشــکرا بکــات و ئــەخلاقیاتی میتافیزیکا هەڵبوەشێنێتەوە و لەگەڵیدا هـەموو ئەو خورافـات و ئەفسـانانە ئاشـکرا بکـات کـە فیکـری مرۆڤی ئـەوروپیان کۆت کردبوو. ئیدی فەلسـەفەی ڕۆشـنگەری بانگەشـەی بـۆ ئـەوە کـرد کـە بـە پلـەی یەکـەم گرنگـی بـە ئـەقڵ بدرێ، بەو پێیـەی کانـت لـە وەڵامی پرسیاری ڕۆشنگەری چییە، دەڵێت: "مانای ڕۆشــنگەری ئەوەیــە کــە مــرۆڤ لــە پاشــکۆیەتی دەربچێت و ئەوەندە ئازا بێت بتوانێت خـۆی ئەقڵی خـــۆی بـــەکاربهێنێت". لێـــرەوە ڕۆشـــنگەری ڕەخنەیـەکی تونـدی ئاراسـتەی هـەموو شـتەکان و هەموو دیاردە و دامـەزراو و چەمکە کۆنـەکان کردو هەموو ئەو بابەتانـەی هێنایـە ژێر مەحـەکی ئەقڵـەوە چونکە ئەقڵ بە پێی هیگڵ گـەورەی هـەموو جیهانـە. فەلسـەفەی ڕۆشـنگەری بـە تـەنها بـەوە وازی نـەهێنا بــاوەڕ بــە توانــای بێســنوری ئــەقڵ بهێنێــت و سـنوورەکانی کەنیسـە و دەسـەڵاتی پیـاوانی ئـایین ببــەزێنێت، بــەڵکو دانــی بەوەشــدا دەنــا کــە ئــەقڵ توانــای ڕێکخســتنی ژیانیشــی هەیــە. ڕەخنــەی ســەردەمی ڕۆشــنگەری ڕەخنەیــەکی لاوەکــی و هەرەمــەکی نــەبوو بــەڵکو ڕەخنەیــەکی ریشــەیی و دوورودرێژبوو، هەروەکو کانت دەڵێ: "دەبێ هەموو شتێك ملکەچی ڕەخنە بێت"، بۆیە ئەو سەدەیە بە سەدەی ڕەخنەگرتن ناوبرا. ئەم ڕەخنەیە پەیوەست بوو بە بزوتنەوەیەکی ئاییني و فەلسەفیی فراوان کە لـە ئـەوروپادا بـە گشـتی و لـە فەرەنسـە بـە تایبـەتی دەســتی پێکــرد، ئەمــەش مانــای ئــەوە نییــە کــە فەلســـەفەی ڕۆشــنگەری تــەنها لــە فەیلەســوفاندا قەتیس ببوو، بەڵکو لە قولاییدا لە هەموو بوارەکاندا بڵاوببۆوە کە لە خۆڵەمێشی سەدەکانی ناوەڕاستەوە گیانێکی ڕەخنەگرانە و نوێکارانە سەریهەڵداوە، ئەو گیانــە ڕەخنەگرییــەی هــەموو وتــارە فەلســەفی و داهێنانـە شـیعری و ئەدەبییەکانیشـی گرتـەوە و بـە پێی ئەو دروشمـەی کانـت کاریـان دەکرد کـە دەڵێ: "با بە ئازایەتییـەکی تـەواو چەکداربین تـا هەریـەکێ لە ئێمە عەقڵی خۆی بخاتە کار".

ئەمـە وای لـە هەنـدێ لـە بیرمەنـدان کـرد کـە بـە پلەیەکی زیاتر پشت بە ڕەخنە ببەستن و هەوڵبـدەن ئـەقڵ لـە وەهـم و ئەفسانەکان ئازاد بکـەن، بـەمجۆرە دواتـر ڤۆڵتێر بـە ڕووی کەنیسـەدا هـاواری کـرد و داوای دەکرد یاخی بن و سەرپێچی داواکارییـەکانی کەنیسە بکەن، پاشان چەمکێك یـاخود سیسـتمێکی فیکـری سیاسـیی گەڵاڵـەکرد کـە لەسـەر پایـەکانی ئازادی وەستابوو، بەهەمان شێوە دەبینین جان جاك رۆسۆ لە کتێبی "پـەیمانی کۆمەڵایـەتی"دا بانگەشـە بـۆ یەکسـانی دەکـات و هیـومیش لـە ئینگلتـەرەدا بانگەشەی لێبوردن دەکات.

سـەرباری ئـەو بەهایانـەی فەیلەسـوفەکانی ڕۆشنگەری لە بارەی ئازادی و هاوولاتی و یەکسانی و دیموکراتی و مافەکانی مرۆڤ چەسپاندیان، ئەمە جگە لە پتەوکردنی پێوەرەکانی ئەقڵ و زانست و ڕەخنە، کەچی فیکری فەلسەفیی خۆرئاوایی سەرجەمی وشە مرۆییە سروشتییەکانی لە خەیاڵ داماڵی، یان بابڵێین ئەقڵ و خەیاڵی لێکدی جودا کردەوە بەو پێیەی گوایە خەیاڵ سەرچاوەیەکە بۆ هەڵەکردن و ڕەگەزێکە بۆ شێواندنی مەعریفە. ئەمە لەلای باسکال و دیکارت بە ڕوونی دەرکەوت کە بە ئاشکرا دژایەتیی خەیاڵیان دەکرد و پێیان وابوو خەیاڵ دەبێتە مایەی ئاڵۆزکردن و تەماویکردنی ئەقڵ.

لێرەوە دەردەکەوێت کە پرەنسیپی ئەقڵانییەت بوو بە تیشکۆیەکی گرنگی فەلسەفەی ڕۆشنگەری، تەنانەت هیگڵ گەیشتە ئەو ئاستەی ئەقڵ بهێنێتە پلەی خوداوەند و بەسەرچاوەی هەموو زانیارییەکی لەقەڵەم بدات.

کێشەی مۆدێرنە و پۆست مۆدێرنە ئەمڕۆ بووە بە جەمسەرێکی گرنگی فیکری هاوچەرخی خۆرئاوایی، ئەمە چووەتە ناو گفتوگۆ و مشتومڕێکی زۆرەوە کە هەندێجار مۆرکێکی توند و ململانێ لە خۆدەگرێ و هەندێجاری دیش دیالۆگی هێمن و لۆجیکی بۆ ئەنجام دەدرێت. ئەو گفتوگۆیانەش لە دەوری چەندین پرسیاردا تەوەر دەگرن، لەوانە: مانای مۆدێرنە و پۆست مۆدێرنە چییە؟ ئایا مومکینە پێناسەیەك بۆ مۆدێرنە دابنرێت یان وەڵامی مۆدێرنە چییە بدرێتەوە؟ ئاخۆ بەڕاستی لە چەرخی مۆدێرنەوە چووینەتە ناو چەرخی پۆست مۆدێرنەوە؟ ئایا لە تواناماندا هەیە ئەو دۆخ و فاکتەرانە دەستنیشان بکەین کە ئەم گواستنەوەیەی هێناوەتە ئاراوە؟ مۆدێرنە بە چ جۆرێك لە تەك مەسەلە گەورەکانی وەکو مرۆڤ و زەمەن و سروشت مامەڵەی کردووە؟ کەسێك لەم پرسیارانە رابمێنێت تێبینی ئەوە دەکات کە لێرەدا کۆمەڵێ ناکۆکی و گرفتی گەورە هەن زەحمەتە چارەسەر بکرێن، بۆ نموونە بیریاری ئەمریکی ریچارد ڕۆرتی مۆدێرنە دەبەستێتەوە بە بیری دیکارت لە هەردوو سەدەی 16 و 17، کەچی یۆرگن هابرماس -ی بیرمەندی ئەڵمانی دەیبەستێتەوە بە چەرخی ڕۆشنگەریی سەدەی 18، بەڵام ڕەخنەگری ئەمریکی فریدریك جامسون پێی وایە مێژووی لە دایکبوونی مۆدێرنە دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم. ئەمە مانای وایە ئەم چەمکە چەندین واتای ناجێگیر و ژمارەیەك ناوەڕۆکی تەماوی لەخۆ دەگرێت. گومانی تیادا نییە کە خستنە ڕووی پرسیاری مۆدێرنە، بەندە بە مێژووی فیکرەکانی خۆرئاوا بەجۆرێك زۆرکەس پێیان وایە مۆدێرنە هاوواتای فیکری خۆرئاواییە و بە ڕوونی گوزارشت لە بەهاو وێناکانی خۆرئاوا دەکات و هەڵوێستی خۆرئاوا دەردەخات لەبەرامبەر مەسەلە و کێشە مرۆڤایەتییە هەستیار و گرنگەکان. کەواتە تەماویبوونی چەمکی مۆدێرنە کار دەکاتە سەر دەلالەتی چەمکی پۆست مۆدێرنە، بۆیە دەبینین ئەمڕۆ ئەم چەمکەی دوایی لە ناڕۆشنی و هیولایی و تەمێکی زۆرەوە ئالاوە. لە ڕاستیدا سەرهەڵدانی بیر و چەمکی مۆدێرنە وەك چەمکێکی فشۆڵ و لێڵ، هەموو پێناسەیەك و هەموو سنوورێك ڕەتدەکاتەوە، وەك پرۆژەیەکی گەورەش پەیوەندییەکی بەتینی بە ڕەوتە کولتوورییەکانی خۆرئاواوە هەیە، واتە پابەندە بە ئەقڵانییەتی خۆرئاوا بە چەشنێك تەنها وەکو نموونەیەکی فۆتۆکۆپی تەماشای ئەزموونەکانی تر دەکات، بۆیە مۆدێرنە بووە بە نموونەیەکی گەردوونی و هەردەبێ سوود لە ڕەگەزە

جومگەییەکانی مۆدێرنەی خۆرئاوایی وەربگیرێت، چونکە وەك دەڵێن نوێگەرایی هاوشانی خۆرئاوا گەراییە.

مۆدێرنە بە دەرکەوتە بنچینەییەکانی سەرکەوتنی ئەقڵەوە گرێدرا کە ئەمەش بووە مایەی بەکارهێنانێکی خراپی "ئەقڵ" و بانگەشەکردن بۆ ژیانێکی ئەبستراکتی دوور لە هەر ئارەزوویەکی جەستەیی و مەیلێکی سروشتی، ئەمەش مۆدێرنەی خستە نێو قۆناغی قەیران و پشێوی. هێنری لۆفیڤەر وایدەبینێ مومکین نییە مۆدێرنە بەبێ کۆمەڵێ قەیران بتوانێت درێژە بە کاروانەکەی خۆی بدات، چونکە مۆدێرنە لە هەناوی خۆیدا ئەگەرەکانی قەیرانی کۆکردۆتەوە، ئەو قەیرانانەی وەکو رەگەزگەلێکی دامەزرێنەری مۆدێرنە دەردەکەوت. بۆیە فیکری خۆرئاوایی لە قۆناغی دووەمی مۆدێرنەی خۆیدا بە پێداچوونەوەو راستکردنەوە ناسرا و هەموو رەهاکانی رابردوو کەوتنە ژێر زەبری رەخنەوە، ئیدی پرۆسەی رەخنە لەخۆگرتن دەستی پێکرد تا رێگوزەرەکە راست بکرێتەوە و بیری مۆدێرنە بەرەو رێگەیەکی ئازاد ببات. ئالان تۆرین مۆدێرنەی وەکو دەریاچەیەك خستۆتە روو کە لە قەیرانە گەورەکاندا کەشف دەکرێت، مەبەستم ئەوەی کە جەستەی خستە پەراوێزەوەو وەکو شتێکی لاوەکی سەیری جەستەی دەکرد و ئەمەش بووە مایەی خۆگرمۆڵەکردن لە ناو خوددا و بە سووك تەماشاکردنی ئەویدی، بەمجۆرە نێرگسیزمی ئەقڵی خۆرئاوایی سەریهەڵدا کە ئارەزوویەکی گەرمی بۆ دەسەڵات و ئیرادە و هێز هەبوو.

ئەو رەخنانەی ئاراستەی مۆدێرنە دەکرێن، لە راستیدا هەوڵێکن بۆ پەرەپێدانی پرۆژەکانی مۆدێرنە چونکە لە سەردەمێکدا بەسەرخۆیدا داخرابوو و بەرامبەر بە ئەویدی نەدەکرایەوە، وەکو بۆدریار دەڵێ دەبێ مۆدێرنە بەرامبەر بە ئەگەری پرۆژەیەکی دیکە بکرێتەوە تا لە نیعمەتی بەرەوپێشچوون و بەردەوامی بێبەش نەبێت و هەمیشە بە هاوچەرخی بمێنێتەوە.

کاتێکیش هابرماس رەخنە لە مۆدێرنە دەگرێت بەو پێیەی هەموو تواناکانی خۆی بەکارهێناوە، پێی وایە مۆدێرنە پرۆژەیەکە تەواو نەبووە، چونکە مۆدێرنە بەردەوام لە نوێبوونەوەدایە و لە بەرەو پێشەوەچوونێکی بێکۆتاییدایە. کەچی ئۆدمار کیڤارد بە توندی داکۆکی لە مۆدێرنە دەکات و وایدەبینێ کاتێك ئێمە بانگەشە بۆ وازهێنان لە مۆدێرنە دەکەین لە راستیدا ئێمە داوای وازهێنان لە دەستکەوتەکانی چەرخی رۆشنگەری دەکەین، ئیدی داوای پاراستنی دەستکەوتەکانی سەردەمی رۆشنگەری دەکات بە پشتبەستن بە تیۆری هاوسەنگییە کۆمەڵایەتییەکان کە دەشێت ناوی بنێین "تیۆری قەرەبوو" بەو مانایەی هاوسەنگی و پارسەنگی لە ململانێکاندا، لە هەموو سەردەمێکدا، بووە بە دادوەری ململانێی نێوان رەوتە فەلسەفیەکان، بەمجۆرە ئەم سەدەیەی ئێمە کە لە سەدەی هەژدەیەمەوە تا ئەمڕۆ درێژبۆتەوە، سەدەیەکە نموونەی هاوسەنگی و بەرجەستەکەری تیۆری قەرەبووکردنەوەیە، لێرەوە بە روونی دەردەکەوێ ئەو رەوتە فیکری و فەلسەفیانەی مۆدێرنەیان هێنایە ژێر باری رەخنەگرتنەوە، ئامانجیان ئەوەبوو سنوورێك بۆ قەیرانەکانی مۆدێرنە دابنێن و تا ئەندازەیەکی باشیش سەرکەوتوو بوون لەوەی پایەی مۆدێرنە بگەڕێننەوە.

هەردوو برا گرۆنۆت و هارتمۆت بومە، هەڵوێستێکی میانڕەوییان وەرگرت و مۆدێرنەیان

بەو دراوە شوبهاند کە دوو ڕووی دژبەیەکی هەیە: ڕوویەکی پۆزەتیڤی و ڕوویەکی نێگەتیڤی، ڕووی یەکەمی لە دەرکەوتنی ئەقلانیەت و دەسەڵاتی ئەقلانییەتدا دەردەکەوێ بەسەر هەموو رووکارە هاوچەرخەکانی ژیاندا، بەڵام رووی دووەم لە هەموو ئەو شتانەدا دەردەکەوێ کە پەیوەستن بە ئارەزووە جەستەییەکان و خەیاڵ و مەیلە سروشتییەکان، بەمجۆرە قەیرانەکانی مۆدێرنە هەمیشە دەمێننەوە و شێوەی دیکە لە خۆ دەگرن و هەندێجار قووڵتر دەبنەوە و رەگەزی نوێتر دێنە ناوەوە و دواجار سەردەمێکی تر لە سەدەی بیست و یەکەمدا دەست پێدەکات.

لەبەرئەم هۆیە لە مێژووی فیکری خۆرئاوادا چەمکی پۆست مۆدێرنە لە ساڵی 1959 لەلای مێژوونووسی بەریتانی "تووینبی" دەرکەوت، ئەم چەمکە پەیوەندیی بە سێ زاراوەی ترەوە هەیە کە فیکر و کۆمەڵگەی خۆرئاوایی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمیان جیاکردەوە: نا ئەقلانیەت و، ئەنارشیزم و ژاوەژاو. پاشان زاراوەی پۆست مۆدێرنیزم چووە ناو چەندین بواری دیکەوە وەك بیناسازی و سەما و شانۆ و وێنەگرتن و سینەماو مۆسیقاو رەخنەی ئەدەبی، بەمجۆرە ئەم چەمکە بە نارۆشنی و بە تەمێکی زۆرەوە دێت و پشت بە مۆدێرنە دەبەستێت کە ئەویش بە تەمێکی زۆر ئاڵاوە، ئیدی پرسیاری سەردەمی سەرهەڵدانی پۆست مۆدێرنە و دەستکەوتەکانی وەکو پرسیارێکی هەڵواسراو مایەوە بە پلەیەك کە هەندێ کەس تەنانەت ئەوەش رەت دەکەنەوە کە سەردەمی پۆست مۆدێرنە هاتبێت. بەڵام هەندێ کەسی دیکە پێیان وایە پۆست مۆدێرنە لەسەر شانۆی مێژوودا بەدیهاتووە.

جامسونی رەخنەگر بانگەشەکارانی پۆست مۆدێرنە بەوە وەسف دەکات کە تێڕوانینێکی نیوریسیییانەیان بەرامبەر بە شوێن و کات هەیە کە ئەمەش هەژموونی هێزە سەرمایەدارییە فرەڕەگەزەکان بەرهەمی هێناون، هابرمازیش تێڕوانینێکی هاوشێوەی هەیە و پێی وایە چەرخی پۆست مۆدێرنە کاردانەوەیەکی نائومێدانە و کۆنزەرفاتیڤانەیە لە دژی رۆشنگەری.

لەبەرامبەر ئەمانەدا کۆمەڵێ بیریار هەن داکۆکییان لە سەردەمی پۆست مۆدێرنە کردووە، بۆ نموونە جان فرانسوا لیوتار کە وایدەبینێ ئەم سەدەیەی ئێمە سەدەی کۆتایی تیۆرەکان و کۆتایی حیکایەتە گەورەکانە، واتە مەرگی رەوت و ئایدیۆلۆژیا گەورەکان و ئەو بیرو باوەڕانەی بەشێوەیەکی سەرجەمگیر و توتالیتاری تەفسیری ژیان و واقیع دەکەن. هەروەها کۆمەڵێ فەیلەسوفی دیکە هەن کە بە فەیلەسوفانی جیاوازی یان فەیلەسوفی دەنگ ناسراون، وەك: میشێل فوکۆ و جاك دیریدا و جیل دۆلۆز، کورتەی تێزی ئەم فەیلەسوفانە لەوەدا چڕ دەبێتەوە کە بەتەواوی دروشمی رۆشنگەری رەتدەکەنەوەو پێیان وایە ئەو دروشمانە جگە لە وەهمێك شتێکی تر نین، فۆکۆ داوای ئەوە دەکات پەرە بە چەشنگەلێکی نوێی رەوشت و بیرکردنەوە و ئارەزوو بدرێت، ئەوان باوەڕیان بە هەمەڕەنگی و فرەیی و پلورالیزم هەیە، ئەم وێناکردنەی فۆکۆ لەو پرۆسانەیەوە دەردەکەوێ کە هەوڵدەدات میکانیزمەکانی دەسەڵات هەڵبوەشێنێتەوە. لە تێکستی ئەم رەوتە فەلسەفییەدا مەیلێك دەبینیین بۆ نەفیکردنی زاراوەی پۆست مۆدێرنیتی و چەند زاراوەیەکی دیکە بە کاردەهێنن وەکو: پەرتکردن *dispersion* و هەڵوەشاندنەوە *diconstruction* و نابەردەوامێتی

*discontinuite* و جیـاوازی *difference* و جیابوونـەوە *disjonction*.

دینامیکیـەتی مۆدێرنـە وەکو بزاوتێکی پڕ لە زیندەگی دەستی پێکردو هەموو بونیاد و زەینییەتە کۆنـەکانی لـەق کـرد و داپـچڕانێکی گـەورەی لەگـەڵ هـەموو شـتێکی کـۆن و تەقلیدیـدا دروسـت کـرد و وێنـاکردنێکی تـازەی بـۆ جیهـان گەلاڵـە کـرد کـە بـە تەواوی جیاوازە لە وێناکردنی تەقلیدی بۆ جیهان. وەك دەزانـین هـەر شـتێکی تـازە لـە دواییـدا کـۆن دەبێت و بەو شێوەیە لە مۆدێرنەشدا پێش مۆدێرنە هەیە و کەواتە پاش مۆدێرنـەش هەیـە، لێرەدا پـاش یـــان پۆســـت مانـــای تێپەڕانـــدن و جێهێشـــتن دەبەخشـێت، هـەروەکو چـەمکی پۆسـت مۆدێرنـەش بریتییـــە لـــە تێکشـــکاندنی هـــەموو قاڵبـــە کـــۆن و ئامادەکراوەکـان، هـــەروەها جێهێشـــتنی پـــڕۆژەی مۆدێرنـە کـە لـە نـاو قەیرانەکانـەوە سـەریهەڵداوە. پـڕۆژەی پۆسـت مۆدێرنـە گوتـارێکی قەبـە ئـامێز و جـەنائیزی و ماتـەمبار بەسـەریدا زاڵـە و بـەردەوام باســـی کۆتـــایی مێـــژوو و مـــەرگی مـــرۆڤ دەکـــات، فەیلەسـوفی ئـەڵمانی بـوهرینگر پێیوایـە خـەڵکی لـە ســـێرکێکی ترســـناکدا قســـەی زل دەکـــەن، جـــان فرانسـوا لیوتـار وایـدەبینێ ئـەم سـەدەیە سـەدەی مـەرگی ئایـدیۆلۆژیا گەورەکانـە و بۆدریـاریش دەڵـێ ئەمــە چــەرخی بــاڵا دەســتیی پاســاوە لاوازەکانــە، کەچـی لیوفسـکی کۆمـەڵگاکانی ئـەم چـەرخە بـە کۆمەڵگای بۆش ناو دەبات، سمارتی فەیلەسوفیش بەم چەرخە دەڵێت چەرخی گومان.

شـێوازی نووســینی فەلســەفی لــە مۆدێرنــەدا شێوازێکی روون و سیستماتیکە کەچی فەلسـەفەی پۆسـت مـۆدێرنیزم شـێوازێکی ناڕۆشـن و پـەرت و تەماوی لە خۆدەگرێت، چونکە ئەم شێوازە تازەیـەی نووسین وێنەیەکی نوێی بیریار بەرجەستە دەکات و وەك جیل دۆلۆز دەڵێ گوزارشت لـە مرۆڤ دەکات لـە حاڵەتی نابەردەوامێتی و پەرت و ناسەقامگیری، ئەم شێوە پەرتییە لە نووسیندا لـەلای نیچـەدا دەبینـین کە لە زۆربەی بەرهەمەکانیدا بە زەقی بەکاریهێناوە، هەروەها کلۆد لیڤی ستراوس و فیتگنشتاینیش لـەم تەرزە شێوازە بەدوور نەبوون، بگرە ئەمـەی دواییـان دوورتـر رۆیشـت و هەوڵیـدا زمـان لـە نـاو ژیـانی رۆژانـــەی ئاســـاییدا بەگـــەڕ بخـــات و پێـــی وابـــوو زمـانیش گەمەیەکـە وەکـو هـەر گەمەیـەکی تـر، ئـەو هەمیشـە لـەوە دوور دەکەوتـەوە کـە پێناسـەیەکی دیـاریکراو بـە چـەمکێك ببەخشـێت و بگـرە هـەوڵی دەدا بـــە بێلایـــەنی بمێنێتـــەوە تـــاوەکو گوتـــارە فەلســـەفیەکەی نەکەوێتـــە نـــاو خولگـــەکانی گـــەڕان بەدوای جەوهەری شتەکان.

لـە راسـتیدا پۆسـت مۆدێرنـە وەك نـەفیکارێکی مۆدێرنـە هـات و تێزەکـانی مۆدێرنـەی جێهێشـت و تێکرای جومگە لاوازەکانی ئاشکرا کرد تا گەیاندیـە کـەناری مـردن و بانگـەوازی "مـەرگی مۆدێرنـە"ی راگەیانـــد تـــا لەوێشـــەوە رەوایـــی بـــە تێـــزە فەلسەفییەکانی خۆیان لە فیکری خۆرئاواییدا بدەن ئـەو فیکـرەی هەوڵـدەدات وێنەیـەکی گـەردوونی بـە فەلسەفەی خۆرئاوایی ببەخشێت.

**سەرچاوە**

گۆڤاری "الفكر و النقد" ژمارە 34.

# "فۆکۆ" و مۆدێرنه

هاشم سالح
له عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

لێرەدا دەخوازم هەندێك لایەنی ئەو مشتومڕە فیکریـیە بخەمـە ڕوو کـە لـە کایـەی ڕۆشـنبیری فەرەنسـایی و تەنانـەت جیهانیشـدا، سـەبارەت بـە "میشـێل فۆکـۆ" دروسـت بـوو. وەکـو ئاشـکرایە نێوبـانگی ئـەم فەیلەسـوفە دنیـای گرتـەوە و خـەڵکانێکی زۆریشـی بەخۆیـەوە خـەریك کـرد، ئەگەرچی هەنووکە کەم تا کورتێك ئەو هەڵایەی لە دەور نەماوە و چۆتە دواوە.

"فۆکـۆ" نێوبـانگی بـەو ڕەخنـە توندانـە دەرکردبوو کە ئاڕاستەی شارستانیەتی خۆرئاوای دەکـرد و دەسـت نیشـانی کـەم و کـوڕی و خاڵـە لاوازەکانی ئەو شارستانیەتەی دەکرد، هەروەها ئەو پەیوەندییـە تونـدوتۆڵ و –ترسناکەشـی ئاشـکرا کرد– کە لە نێوان مەعریفە و دەسەڵاتدا هەیە. لەم سەروبەندەشدا نیشـانیدا مەعریفە هێندە بێگوناه نییـە وەکـو ئـەوەی ئێمـە مەزەنـدەی دەکـەین، بـەڵکو ئـەوە مەعریفەیەکـە دەسـەڵات بەرهـەم دێنێـت و تەنانـەت هەنـدێ جـاریش مەشـروعیەت دەداتـە دەسـەڵاتی سـەرکوتکەر. هـەروەها ڕەخنـەی لەسـەرجەم ئـەو دامودەزگایانـەش گـرت کـە لـە دوای سـەردەمی ڕۆشـنگەریەوە لـە خۆرئـاوادا دروسـت بوون. ڕەخنـەکانی "فۆکۆ" بە جۆرێك بوون، خەڵك وایـان دەزانـی دژایـەتی ڕۆشـنگەری و مۆدێرنـە دەکات، ئەمەش بۆ خۆی ناهەقیەکی گەورەیە.

بۆ ئـەوەی ئـەم مەسـەلەیە ڕون بکەینـەوە، ئـەوا بایـەخ بـە دیـد و بۆچـونەکانی "ژاك بـۆڤری" و پەیوەنـدی ئـەو بـە "فۆکـۆ" و ئاقـاری پۆسـت مۆدێرن دەدەین.

وەك دەزانین "ژاك بۆڤری" لە ئێستادا، یەکێکە لـە فەیلەسوفە دەگمەنـەکانی فەرەنسا و مامۆستای فەلسـەفەی مۆدێرنـە لـە کۆلێـژی دی فـرانس و پسـپۆڕێکی دیـاری فەلسـەفەی شـیکاری ئـەنگلۆ ساکسۆنیشە، بە تایبەت فەلسەفەی "ڤیتگنشتاین".

"بـۆڤری" دەق گـەلێکی "ڤیتگنشـتاین"ی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فەرەنسی و چەندین کتێب و لێکۆڵینەوەشـی لـە بـارەوە نوسـیوە، بەمەبەسـتی شرۆڤەکردن و ئاسان وەرگرتنی لەلایەن خوێنەرانی فەرەنسـاوە. هـەر کاتێـك باسـی "ژاك بـۆڤری"

دەکرێت، دەست بەجێ ناوی "ڤیتگنشتاین"یش دێت، لەبەرئەوەی ماوەیەکی زۆر بە فیکر و جیهانبینی ئەوەوە خەریك بووە، بەڵام لە چەند ساڵی دوایدا وازی لەو خولیا سەرەکیەی خۆی هێناو دوو کتێبی لەسەر مەسەلەی ئاقاری هیومانیزم لە فیکری ئەوروپیدا بە ناوی (فەیلەسوف لای ئەوانەی خۆیان دەخۆن) و (ئەقلانیەت و دزێوی) بە چاپ گەیاند.

لە هەردوو ئەو کتێبەدا هێرشێکی توندی کردۆتە سەر فەیلەسوفانی پۆست مۆدێرنەی فەرەنسایی، ئەمانەش ئەو فەیلەسوفانەن کە تاوانبارکراون بەوەی ڕەواج بە نائەقلانیەت و سۆفیستانیەت و پوچگەرایی دەدەن، لە فەرەنسا بە تایبەتی و لە خۆرئاواشدا بە گشتی. ئەمانە وەکو کەسانی بێ ئومێد درانە قەڵەم و هێرشکردنی زۆریشیان بۆ سەر بنەماکانی شارستانیەتی ئەوروپی وەك: (دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ و هیومانیزم)، بووە مایەی بێزاری زۆری ئەو فەیلەسوفە ئەقلانیانەی داکۆکی لەم بەهایانە دەکەن و "ژاك بۆڤریێ"ش یەکێکە لەوانە.

لێرەدا جێی خۆیەتی ناوی ئەو فەیلەسوفانە بهێنین کە لە شارستانیەت و مۆدێرنە داخ لە دڵن، نمونەکانیان وەك: (ژاك دێریدا، میشێل فۆکۆ، ژێلێ دیلۆز، ژان فرانسوا لیوتارد). ئەمانە هەرایەکی گەورەیان لەسەر مۆدێرنە و بەهاکانی نایەوە، نەك بە تەنها لە وڵاتی فەرەنسادا، بەڵکو لە ئەڵەمانیا و وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکاو لەسەر ئەم بابەتەش مشتومڕی گەرم لە نێوان فەیلەسوفانی ئەڵەمانی و فەرەنسی و ئەمریکاییەکاندا دروستبوو.

بەپێی ئەوەی لە پاشکۆی ئەدەبی ڕۆژنامەی (لیفیگارۆ)دا هاتووە، پاش دەساڵ لە مردنی "میشێل فۆکۆ" و (فۆکۆ لە 24ی حوزەیرانی ساڵی 1984 لە پاریس و بە نەخۆشی ئایدز کۆچی دوایکرد —وەرگێڕ) دوای ئەو هەموو ڕەخنەیەشی ڕووبەڕووی بووە، بەڵام تا ئێستاش بە گرنگترین فەیلەسوفی هاوچەرخی فەرەنسی دادەنرێت.

لە ئەمریکادا زۆرترین خوێنەری هەیە و زیاد لە هەر فەیلەسوفێکی تر کۆڕ و سیمینار و کۆنگرەی زانستی بۆ ساز دەکرێت. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە چ شوێن دەستێکی لەسەر کایەی فەلسەفی خۆرئاوا و جیهانی جێهێشتووە، ئەگەرچی لە چەند ساڵی ڕابردوودا خەریکە ئەستێرەی بەختی لە کزی دەدات.

ڕەنگە بۆ ئێمە شتێکی سەیر و سەمەر بێت کە چۆن فەیلەسوفێکی وەکو "فۆکۆ"، تەواوی تەمەنی خۆی بۆ ڕەخنەکردنی مەزنترین ژیاری سەرگۆی زەوی تەرخانکردووە، یان چۆن دەبێت بیریارە مەزنەکانی ئەوروپا شاڵاو بەرنە سەر مۆدێرنە و ئەقلانیەت؟!

ڕەخنەگرتن لە مۆدێرنە و ئەقلانیەت لە شەستەکانی سەدەی ڕابردووەوە لە فەرەنسادا دەستی پێکرد و بزاوتێکی فەلسەفی وەهاشی لێکەوتەوە کە لانی کەم بۆ ماوەی چارەکە سەدەیەك پاوانی گۆڕەپانەکەی کردبوو، بەڵام لە چەند ساڵی دوایدا پەرچە کردارێکی بەهێز لە بەرامبەریدا دروست بوو. لێرەدا هەوڵدەدەین لە ڕێی خستنە ڕووی هەندێك بیروبۆچونی بیریارێکی ئەقلانی و لۆژیکی وەك "ڤاك بۆڤریێ"وە، نمونەی ئەوپەرچە کردارە نیشان بدەین.

"ژاك بۆڤریێ" پێیوایە بەرنامەی سەرەکی سەردەمی ڕۆشنگەری بریتی بووە لە: ڕوناککردنەوەی ئەقڵی مرۆڤ و زیادکردنی توانستی زانینی، بۆ ئەوەی توانای کۆنترۆڵکردنی سروشت و شتەکانی زیاتربێت. فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری

پێیان وابوو، ئەمە دەبێتە مایەی ئەوەی حاڵی مرۆڤ زۆر باشتربێت و زیاد لە جارانیش بەختەوەرتر و خۆشگوزەران تر بێت. سەردەمی ڕۆشنگەری پێی وابوو سەرچاوەی نەهامەتی لە جیهاندا نەزانینە، چارەسەری ئەمەش تەنها بە زانست و زانین دەکرێت. دوژمنی تاریکی ڕوناکیە و زانستیش دوژمنی نەزانینە. کەواتە ڕامالینی نەزانین و خورافات، تەنها بە روناکی زانست و ئەقڵ دەستەبەر دەبێت.

هاوکات فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری شەڕێکی بێوادەیان لە دژی دەمارگیری ئایینی و تاریکخوازی فێندەمێنتالیزم کرد. ئەی کەواتە فەیلەسوفانی پۆست مۆدێرن ڕەخنە لە چی دەگرن و ڕەخنەکانیان چییە؟ ئایا دەیانەوێت بگەڕێینەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست؟

فەیلەسوفانی پۆست مۆدێرن باس لەوە دەکەن کە ئەقلانیەتی سەرمایەداری بیرۆکراسی، سەرجەم بوارەکانی ژیانی لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا پاوان کردووە و ئەمەش بە مەترسیەکی گەورە دەزانن. ئەمە لە کاتێکدا تەواوی میللەتانی دنیا ئیرەیی بە گەلانی ئەوروپی دەبەن. "ژاك بۆڤری" پێی وایە ئەوانەی ڕەخنە ئاراستەی مۆدێرنە دەکەن تەنها لە خاڵێکدا ڕاستیان پێکاوە، ئەویش ئەوەیە کە: پێشکەوتنی بێحەد و حیسابی زانست و تەکنۆلۆژیا بۆ خۆی بۆتە ئامانجێك، لە کاتێکدا دەبوو ئامرازێك بێت بۆ خزمەتکردن و بەختەوەرکردنی مرۆڤ.

لێرەدا ئەوانەی ڕەخنە ئاراستەی مۆدێرنەی تەکنۆلۆژی دەکەن، کارێکی بەجێ دەکەن، بەلام نابێت ئەم ڕەخنەگرتنە بگاتە ئاستی ئافەرۆزەکردنی کۆی شارستانیەتی خۆرئاوا و سنور ببەزێنن. چونکە ئەمە هەڵوێستێکی پەرگیرانەو لە باشترین حاڵەتیشدا هەڵوێستێکی نامەسئولانەیە.

بێگومان پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆژی لە خۆرئاوا، هاوشانی پێشکەوتنی ئەخلاقی و ڕۆحی و دانایی نەبوو. مرۆڤ گەیشتۆتە ئاستێك پێداویستییەکانی ئاراستەی دەکەن، نەك ئەو ئاراستەی پێداویستیەکانی بکات.

لە سەردەمی ڕۆشنگەریەوە تا ئەمڕۆ (کە نزیکەی دوو سەد ساڵێك دەکات)، مەعریفەی مرۆڤی ئەوروپی زۆر زیادی کردووە، بەلام ئاخۆ بە هەمان ئەو ڕادەیەش دانایی و جڵەوکردنی چارەنوسی خۆی زیادی کردووە؟

داهێنان سنوری بۆ نیە و پێداویستیەکانیش لە ئاستێکدا ناوەستێت، بۆیە پێویستە مرۆڤ بزانێت لە چ سنورێکی دیاریکراودا ئەو پێداویستیانە ڕابگرێت و زیادەڕۆیی نەکات. قەیرانی شارستانیەتی مۆدێرنیش لێرەدایە. هەموو ئەم شتانەی باسکران ڕاستن و "ژاك بۆڤری"ش لاری لێیان نییە، بەلام ئەو پێی وایە فەیلەسوفانی نائەقلانی وەك: (دێریدا و فۆکۆ و دۆلۆز و لیوتارد)، لە ڕەخنەگرتنی مۆدێرنەدا زۆر دەڕۆن و ئاستێك بۆ ڕەخنەکانیان دانانێن. ئەمانە مۆدێرنە وەك دیاردەیەکی بەد و خراپەکاری دەبینن. بریا هەڵوێستێکی حەکیمانەیان لە مۆدێرنە وەرگرتایە، وەك ئەوەی "مونتین" وەریگرت. بابزانین "مۆنتین" دەڵێت چی؟ ئەو پێی وایە: (بەڕاستی زانست شتێکی مەزنە و ئەوانەشی تەرێزی لێدەکەن یاخود بە هێند وەریناگرن، نەزانین و بیرتەسکی خۆیان نیشان دەدەن.. ڕاستە زانست چارەسەری هەموو شتێك ناکات، بەلام شتێکی سەرەکیە بۆ پێشکەوتنی مرۆڤ).

لە ڕۆژگاری "مۆنتێن"ەوە تا ئەمڕۆ (کە چوار سەدە دەکات)، مرۆڤی ئەوروپی پەندی زۆر و زەوەندی دەرهەق بە لایەنی پۆزەتڤی و نێگەتیڤی

زانســـت وەرگرتـــووە. ئـــەو مرۆڤـــە زانســـتی ئـــەزمونکردووە و بەرهەمـــەکانی چـــنیوەتەوەو باجیشـی داوە (ڕاسـتە زانسـت ئـەقڵی ئـەلکترۆنی بەرهـەم دێـنێ، بـەڵام بـۆمبی ئـەتۆمی و چـەکی کیمیـاویش بەرهـەم دێـنێ کـە قەڵاچـۆی مرۆڤایـەتی دەکـات). کەواتـە هـەموو شـتێك پەیوەنـدی بـەوەوە هەیە، چۆنچۆنی زانست بەکاردێنین.

یـان ئـەوەتا بـۆ چاکەی بـەکاردەهێنین، یـان لـە پێناو خراپەدا بەگەڕی دەخەین.

لەلایەکی ترەوە تەرێزکردن لە زانست لە لایـەن فەیلەســـوفە نائەقڵانیـــە هاوچـــەرخەکانەوە، دەگەڕێتـەوە بـۆ کاریگـەری "نیچـە" و هەڵویسـتی نیگەتیڤانەی ئەو لە زانست.

"فۆکـۆ" و ئاقـاری پۆسـت مـۆدێرن، جـەخت لەسـەر لایـەنی هەیمەنـە و کـۆنترۆڵ دەکەنـەوە کـە پەیوەستن بە زانسـتەوە و لایـەنی مـەعریفی پـرۆژەی سەردەمی ڕۆشنگەری وەلاوە دەنێن.

ڕاستە زیادبوونی زانیین دەبێتە مایـەی ئـەوەی زیـاتر دەسـەڵاتمان بەسـەر شـتەکاندا و سروشـتدا بشـکێت، وەکـو ئـەوەی "دیکـارت" خـەونی پێـوە دەبـینی، بـەڵام ئەمـە بـۆ خـۆی وەکـو پرۆژەیـەکی نمونـەیی دەمێنێتـەوە و پاسـاوی ئـەوەمان بـۆ ناداتـەوە کـە مەعریفـە کـورت کەینـەوە بـۆ تـەنها ئـــامرازێکی هـــەژمونخوازی و و کـــۆنترۆڵکردنی ئەوانـــەی دی. بێگومـــان پـــرۆژەی زانســـتی و تەکنۆلۆژی خۆرئاوایی، بووەمایەی ئـەوەی خۆرئـاوا دەسـەڵات بەسـەر میللـەتانی دیکـەدا پەیـدا بکـات، بەڵام زانسـت هـەمووی دەسـەڵات و چەوساندنەوە و بـە کۆیلـەکردن نییـە، وەکـو ئـەوەی ڕەخنـەگرانی مۆدێرنە باسی دەکەن.

دەکرێت ئێمە لـەمڕۆدا سـەرکۆنەی "دیکـارت و گـالیلۆ و نیـوتن و کانـت و ئەنیشـتاین" بکـەین، تـا ئەوانـەی پـێ ڕازی بکـەین کـە دەیانـەوێت تـەواوی شارستانیەتی مۆدێرن ئافەرۆز بکەن؟!

ئێمە دەتوانین ڕەخنە لە ئایدیۆلۆژیای زانستی بگـرین و لـە هـەمان کاتیشـدا، لایەنـە پـۆزەتیڤ و دەسکەوتە گرنگەکانی زانست بپارێزین کە مرۆڤیان گەیاندە ئەو ئاستە بەرزەی پێشکەوتن.

"ژاك بـۆڤریٚ" دەیـــەوێت بـــە فەیلەســـوفانی پۆســـت مـــۆدێرن بڵێـــت: (دەکرێـــت ڕەخنـــە لـــە کەموکوڕیـــەکانی مۆدێرنـە بگـرین، بـەڵام ناکرێـت زانســـــــت و شارســـــــتانیەتی تـــــــەکنۆلۆژی سەرلەبەر ڕەتکەینەوە).

ئـەوەی جێـی سـەرنجە ئەوەیـە، ڕەخنـەگرانی مۆدێرنـــە لەســـەنگەری چـــەپڕەوەکان و تەنانـــەت چـەپڕەوە تونـدڕەوەکانی فەرەنسـادان، بـەڵام ئەمـە شـــتێکی زۆر ســـەیر نییـــە و بـــە تاقیکردنـــەوە دەرکەوتووە کە لە دواجاردا چەپی توندڕەو ڕاستی تونـــدڕەو یەکـــدەگرن و دەبـــن بـــە یـــەك، چـــونکە هـــەردووکیان دوژمـــنی دانـــایی و میـــانڕەویی و سەنگینین.

"ژاك بـۆڤریٚ" جـارێکی تـر دەگەڕێتـەوە سـەر ئیدانـەکردنی "نیچـە" و بەرپرسـیارێتی ئـەم ئاقـارە نائەقڵانیـەی دژایـەتی مۆدێرنـە و دەسـکەوتەکانی دەکـات، دەخاتـە ئەسـتۆی ئـەو.. لەمبارەیـەوە "ژاك بـۆڤریٚ" دەڵێـت: (نیچـە بیـەوێت یـان نـا، ئـەوا تیوریاکـەی ئـەو کـە پەیوەنـدی بـە ئیرادەی هێـزەوە هەیە، ڕێی خۆشکرد بۆ ئـەوەی فاشـیزمی ئەڵـەمانی جارێکی تر بێتەوە مەیدان.. نیچە وتـەزای ئیرادەی هێزی کـردە بنـەمای بـوون و زینـدەگی و نـازیزمیش بڕوای بە تێزەکانی نیچە هێن و لـە هـەوڵی ئـەوەدا بـوو لـە واقیعـدا کـاری پێبکـات. سـەرەنجامیش بـەو ماڵوێرانیـە کۆتـایی هـات کـە هـەمووومان دەیـزانین. ڕاستە نیچە دەرەنجامێکی وەهای نەدەویست، بەڵام

بیروبۆچوونه توندڕەوەکانی ئەوەی لێکەوتەوە. هەندێك جار بیریار شتێکی دەوێت، کەچی بیروبۆچوونەکانی بۆ بەدەست هێنانی شتی تر بەکار دەهێنرێت).

خاڵێکی تر کە خەسڵەتی بیریارانی پۆست مۆدێرنە و "ژاك بۆڤریێ" ڕەخنەی لێدەگرێت، ئەوەیە کە: (ئەوان هەموو دەسەلاتێك ڕەتدەکەنەوەو لە هەموو دەسەلاتێکیش نارازین، وەك ئەوەی هەڵوێستێکی وا لە پۆخڵی دەسەلات بیانپارێزێت. چونکە ئەوان پێیان وایە دەسەلات خراپەکارە و هەر ڕۆشنبیرێکیش مامەڵەی لەگەڵدا بکات تاوانبارە. بێگومان ئەمە هەڵوێستێکی دروست نییە و ئاکامی باشیشی نابێت. ڕۆشنبیر دەبێت دەسگیرۆیی دەسەلات بکات گەرهاتوو پڕۆژەی باشی بۆ کۆمەڵگا ئەنجامدا، هەروەها پێویستە کاتێك هەڵە دەکات ئاگاداری بکاتەوە، بۆ ئەوەی هەڵوێستی خۆی ڕاست بکاتەوە و بڕیاری گونجاو دەربکات).

بەلام فەیلەسوفانی پۆست مۆدێرن شانازی بەوەوە دەکەن کە بە بەردەوامی دژایەتی دەسەلات دەکەن. لێرەدا "ژاك بۆڤریێ" بەراورد لە نێوان هەڵوێستی پۆست مۆدێرنەکان و ڕاستی توندڕەودا دەکات، کە دژایەتی بە بەهاکانی پێشکەوتن و دیموکراسی و مۆدێرنە دەکەن. هەندێك جار پۆست مۆدێرنەکان ئەگەنە شتێك کە پێچەوانەی خواستی ئەوانە. بۆ نمونە کاتێك "فۆکۆ" دەڵێت: (ئەقڵ ئامڕازێکی سەرکوتکەرە!)، ئەوا بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت بۆ خاتری بەرژەوەندی هێزە کۆنسێرڤاتیڤ و دواکەوتووەکان کاردەکات.

بەلام بۆچی "فۆکۆ" وا دەڵێت؟ لەبەرئەوەی ئەو پێی وایە ئەقڵ شتەکان لە چوارچێوەی سستەمێکی دیاریکراودا ڕێکدەخات، هەر ڕێکخستنێکیش بە مانای سڕینەوەی هەندێ شت و دەست لێنەدان و هێشتنەوەی هەندێکی تر. لێرەوە هەموو ڕێکخستن و دیسپلینێك، بە ناچاری پرۆسەی سەرکوتکردن لە خۆدەگرێت. کەواتە ئەقڵ هەرچییەك بکات سەرکوتکارە.

لێرەدا توندڕەوی "میشێل فۆکۆ" بە زەقی دیارە. ئەڵبەتە ئەو مافی خۆیەتی کاتێك ڕەخنە ئاراستەی ئەقڵی کلاسیکی خۆرئاوا یان ئیرۆسەنتەریزم دەکات، بە تایبەت لەو دۆخەی ئێستایدا کە بەسەرخۆیدا داخراوەو نایەوێت بەسەر جیهانی دەرەوەو کلتورەکانی تردا بکرێتەوە. ئەقڵی ئەوروپی لە قۆناغی کۆلۆنیالیزم و پۆزەتڤیزمداو بە درێژایی سەدەی نۆزدەهەم و تا ناوەڕاستی سەدەی بیست (واتە بەر لە دروست بوونی قوتابخانەی فرانکفۆرت کە پێش کتێبە بەناوبانگەکەی فۆکۆ — مێژووی دێوانەیی لە سەردەمی کلاسیکیدا — زۆر بە توندی کەوتنە سەرکۆنەکردنی ئەقڵ)، دووچاری ئەو حاڵەتە بوو.

بەلام نابێت پرۆسەیەکی ڕەخنەیی لەو جۆرە زیادەڕۆیی بکات و تەواوی دەسکەوتە پۆزەتیڤەکانی ئەقڵی لیبرالیزم وەلاوە بنێت، چونکە کارێکی لەو جۆرە ناهەقیە دەرهەق بە ئەقڵ و ئەو شارستانیەتە قەشەنگەی بەرهەمی ئەقڵە.

تایبەتمەندیەکی دیکەی بیریارانی پۆست مۆدێرن نارەزایی دەربڕینی بەردەوامە و ڕەخنەکردنی هەموو ڕێسا و پێوادانگێکە، ئەمەش بە ناوی ئازادیەکەوە کە هیچ سنورێك ناناسێت. ئەمانە ئەلتەرناتیڤیان پێنیە و کاری سەرەکیان ڕەخنە و لێکشیتاڵکردن و وێرانکردنە بەشێوەی "نیچە".

"نیچە" پێیوابوو تەنانەت زمانیش بریتییە لە زینداندنێك، لەبەرئەوەی لە چوارچێوەی سستمی ڕێکخستنی وشەکان بەشێوەیەکی دیاریکراو، مانا

ئازادەکان کۆت و بەنددەکات. بەڵام هیچ زمانێك لە دنیادا هەیە بتوانێت بە بێ ڕێزمان دروست ببێ؟ "نیچە" وەڵامی ئەم پرسیارە ناداتەوە و تەنها ئەوە دەڵێت کە (زمان زیندانی مانایە). فەیلەسوفانی پۆست – مۆدێرنەش لە فەرەنسا لەسەر هەمان ڕێتمی ئەوە کە دەڵێن: (ئەقڵ زیندانە!). ئەوان لەوەدا ڕاستدەکەن، ئەگەر ئەقڵ بووە بەستەڵەك و لە زانست و کرانەوەی شارستانی دواکەوت، ئەوا دەبێت بە کۆت و بەند و زیندانێکی گەورە.

بەڵام خۆ هەر ئەقڵە کە بنەما و بڕبڕەی پشتی شارستانیەتە و ناکرێت بەو ڕەهاییە سەرکۆنەی بکەین و ڕەتی بکەینەوە. مەترسیەکەش لێرەدایە. ئەقڵ خاوەنی مێژووە و لەگەڵ تازەبوونەوەی زانست و داهێنانی مەعریفی و ئەزمونی مێژوویی و پێشهاتە میتۆدیەکاندا، تازە دەبێتەوە. ئەقڵ وەکو ئەوەی ئێمە مەزەندەی دەکەین شتێکی نەبزۆك و پێدراوێکی نەگۆڕ نییە، بەڵکو وەکو تەواوی شتەکانی تر مێژووی خۆی هەیە. لەبەر ئەم هۆیەشە کە باس لە (ئەقڵی دیکارتی و ئەقڵی کانتی و ئەقڵی دیالەکتیکی هیگڵی و.. هتد) دەکەین. ئەقڵ بە بەردەوامی پەرەدەستێنێ و دەگۆڕێ و خۆی نوێ دەکاتەوە.

دواجار "ژاك بۆڤرێ" دەیەوێت حوکمێکی توند بەسەر "فۆکۆ" و "دۆلۆز"دا نەدات و نایەوێت خواستی ڕاستگۆیانەی ئەوان، بە مەرامی توندڕەوو پڕ لە بوغزی ڕاستی فەرەنسی تێکەڵ بکات کە بەرامبەر بە مۆدێرنە و سەردەمی مۆدێرن هەیانە.

چونکە "بۆڤرێ" لە هەوڵ و کۆششی "فۆکۆ" و "دۆلۆز" لە پێناو مەسەلە ئینسانییەکاندا ئاگادارە، بەتایبەت ئەو خۆپیشاندانانەی لە پێناو مافی کرێکارە بیانیەکانی ناو فەرەنسادا پێی هەستان.. هەروەها داکۆکی کردنیان لە مافی کەمایەتیە چەوساوەکانی ناو کۆمەڵگەی فەرەنسی. بەڵام پەرگیری ئەوان لەسەر ئاستی تیۆری دژ بە ژیاری خۆرئاوایی کەلەسەر بنەمای مافی مرۆڤ و ڕێزگرتنی فرەڕەنگی و گەمەی دیموکراسی دامەزراوە، ناکۆکە لەگەڵ ئەو پرۆسەیەی ئەوان دەستیان داوەتێ و لە بەرژەوەندی کێشەی مرۆڤە زۆر لێکراوەکاندایە، واتە لە بەرژەوەندی مافەکانی مرۆڤدایە بەگشتی. کەواتە چۆن دەبێت ئەوان لە ڕووی تیوریەوە گاڵتەیان بە جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ بێت و بە عەمەلیش بەرگری لێبکەن؟ ئەم ناکۆکیە زەق و دژوارە بێ سەرنجی بیرمەند گەلێکی دیکەی وەك "لۆك ڤێری و ئالان ڕینۆ" بووە.

هەموو ئەوەی لەسەرەتاوە باسمان لێکرد، دەریدەخات کە ئەقلانیەت مەرج نییە تەنها خواستی هەژمونخوازی و سەرکوتکردن و شەڕانگێزی و وێرانکردن بێت، وەك ئەوەی ڕەخنەگرانی مۆدێرنە باسی دەکەن. هەروەها مەرج نییە نائەقلانییەت لێبوردەو لیبرالی و بێوەی بێت یاخود ڕێزی سروشت و ژینگە و ژیان بگرێت، وەکو ئەوەی ئەوان پێیان وایە.

"ژاك بۆڤرێ" لە درێژەی قسەکانیدا لەسەر "میشێل فۆکۆ" و هەڵوێستی ئەو لە مۆدێرنە، کۆڵەوەناکات باس لە گرنگی ئەو بکات وەك بیریارێك کە ڕۆڵی لە دەست نیشانکردنی کەموکوڕییەکانی شارستانیەتی خۆرئاواو کۆمەڵگە لیبرالییەکاندا هەبووە. بەڵام سەری لەوە دەسوڕمێت کە چۆن بیریارێکی بلیمەتی وەکو ئەو لە ڕووی میکانیزمەکانی سەرکوتکردن و کۆنترۆڵ و سزاوە، بەیەك چاو سەیری سستمە کۆمۆنیستیەکان و سستمە لیبرالییەکان دەکات. لە نێوانی ئەم دوو سیستمەدا جیاوازیەکی جەوهەری هەیە. ئەگەر چی کەموکوڕی لە کۆمەڵگە لیبرالیە دیموکراسیەکاندا

هەیە، بەڵام ناکرێت بەو سستمە دیکتاتۆریانە بەراورد بکرێت کە ئازادی بیرکردنەوەو ڕادەبڕین و ڕۆژنامەوانی و.. هتد، تێدا نییە. لەم ڕووە وە "فۆکۆ" و بەر لەویش "ژان پۆڵ سارتەر"، کەوتنە هەمان هەڵەوە.

هەندێك پێیان وایە پەیوەندی کردنی "فۆکۆ" و "سارتەر" بەڕیزەکانی چەپی توندڕەوەوە لەشەست و حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا، فەرەنسای لە دەست ئەو شەپۆلی تیرۆرە قوتار کرد کە ڕووی تێکردبوو. گەرهەوڵی ئەوان نەبوایە و جڵەوگیری ئەو هێزە ڕادیکالە توندڕەوانەیان نەکردایە لە ڕێی پەیوەندی کردن پێیانەوە، ئەوا فەرەنسا ڕووبەڕووی چارەنوسێکی دژواردەبووەوە. بە سەلماندنی ڕاستی ئەم قسانەش، دەتوانین نمونەی ئەڵەمانیا بهێنینەوە کە لە هەمان سەردەم و زەماندا توند وتیژی تێیدا تاویسەند، هۆکەشی ئەوە بوو بیریارانی ئەڵمانیا نەیانتوانی ئەو هێزە ڕادیکالانەی ناو کۆمەڵگەی خۆیان کۆنترۆڵ بکەن و ڕێ لە توندڕەوییان بگرن. ئەم مەسەلەیە گرنگە و ئەوە دەهێنێت قسە و باسی لەسەر بکرێت. تەواوی کۆمەڵگا ئینسانیەکان هێزی نا ئەقلانی تێدایە و گەرهاتوو ئەم هێزە نەیتوانی لە ڕێگای کەناڵە سروشتیەکانەوە گوزارشت لە خۆی بکات، ئەوادەست دەداتە توندوتیژی و غافڵکوژی و هاوسەنگی کۆمەڵگا دەکەوێتە بەر هەڕەشە و مەترسی تێکچوون.

ئەمە مانای ئەوە دەگەیەنێ کە بیریاری ڕەخنەیی – وەکو سارتەر و فۆکۆ –، یارمەتی کۆمەڵگا دەدات بۆ ئەوەی خۆی لە هەموو توندڕەوییەك خاڵی بکاتەوە،. ئیتر ئەمە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بێت یان ناڕاستەوخۆ_. هەرچەندە ڕۆشنبیری – ڕەخنەیی دەوڵەت پەست وبێزار دەکات، بەڵام زیاد لە ڕۆشنبیری ملکەچ و گوێ لەمشت خزمەت بە دەوڵەت و کۆمەڵگا دەکات. بەڵام کێشەکە لێرەدا ئەوەیە کە "فۆکۆ" لە ڕەخنەکردنی دامودەزگاکانی کۆمەڵگەی لیبرالیدا، هەموو سنورێکی بەزاندووە و تەنانەت کار گەشتۆتە ئەوەی بنەماکانی دیموکراسی خۆشی بخاتە مەترسیەوە و سستمی دیموکراسی و سستمە سەرکوتکارە کۆمۆنیسیتیەکانیش وەك یەك سەیر بکات. ئەمەش شتێکی نا دروستە و خاڵی لاوازی سەرەکیش لە فیکر ئەودا لێرەدایە.

ئەگەر "ژاك بۆڤریێ" زیاتر جەختی لەسەر لایەنی نائەقلانی فەلسەفەی "میشێل فۆکۆ" کردبێت، ئەوا "لۆك ڤێری و ئالان ڕینۆ" بایەخیان بەولایەنەداوە کە چۆن "فۆکۆ" دژایەتی هیومانیزمی خۆرئاوایی کردووە، ئەمەشیان لەو کتێبەدا باسکردووە کەساڵێك پاش مردنی "فۆکۆ" واتە ساڵی 1985 بڵاوبووەوە.

ئەم کتێبە لەگەڵ بڵاوبوونەوەیدا، بوو بە ئینجیلی هەموو ئەوانەی دژایەتی "فۆکۆ و دۆلۆز و دێریدا" یان دەکرد. مەبەستی هەر دوو نوسەر لەم کتێبەیاندا ئەوە بوو، ئەفسانەی "میشێل فۆکۆ" لە کایەی فەلسەفەی فەرەنسیدا تێکوپێك بشکێنن.

وەکو ئاشکرایە "فۆکۆ" بە درێژایی چارەکە سەدەیەك دیارترین ناوی فەلسەفەی فەرەنسی بوو، تەنانەت گرنگترین ناوی ناو فەلسەفەی جیهانیش بوو، چونکە شۆرەت و نێوبانگی گەیشتبووە وڵاتانی دیکەی دنیاو بە تایبەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

"لۆك ڤێری و ئالان ڕینۆ" لە کتێبەکەیاندا: (فیکری 68، دەیانەوێت ئاستێك بۆ فیکر و بیرو بۆچوونەکانی "فۆکۆ" دابنێن. فیکری 68، واتە ئەو فیکرە کۆمەڵایەتیە تورەیەی هاوشانی شۆڕشی

ئایاری 68 بوو لە فەرەنسا و ویستی وابوو سستمی سەرمایەداری ژێرەو ژوور بکات. نوێنەرانی فیکری 68 سەر بە چەندین ئاقاری جیاجیا بوون:

–ئاقاری مارکسیزم، لوی ئەلتۆسێر.

–ئاقاری نیچەوی: میشێل فۆکۆ.

–ئاقاری هایدگەری: ژاك دێریدا.

لەگەڵ "ژێل دۆلۆز" و "پییربۆردیۆ"و.. هتد. سەرەڕای ئەوەی ئەو بیرمەندانە لەگەڵ یەکتریدا ناکۆکن، بەلاّم هەموویان لە سەریەك شت کۆك و تەبان، ئەویش ئیدانەکردنی ئەو فەلسەفە هیومانستیەیە کە لە سەدەی نۆزدەهەمەوە تا ئەمڕۆ لە خۆرئاوادا بالاّ دەستە. بەهێزترین گوزارشت لەم ئیدانەکردنە ئەوەیە کە "فۆکۆ" لە کۆتایی کتێبی (وشەکان و شتەکان)دا باس لە مەرگی مرۆڤ دەکات. مەبەستی لەوەش کۆتایی فەلسەفەی هیومانستی خۆرئاوایی بوو.

لێرەدا جێی خۆیەتی بپرسین، ئایا فەلسەفەی هیومانیزم ڕاستگۆیی خۆی لە دەستداوە؟

ڕەنگە ئێمە لە هەڵسەنگاندنی فیکری ئەورووپیدا بە هەڵەدا بچین. بەداخەوە ئەوەی لە ئێستادا ڕوودەدات بەو جۆرەیە، لەبەرئەوەی زۆربەی ئەوانەی فیکری خۆرئاوامان بۆ دەگوازنەوە، بە باشی تێینەگەیشتون و بەشێوەیەکی دروست بۆمانی ناگوازنەوە، ئەمەش وا دەکات پەیوەندی فیکری لەگەڵ خۆرئاوادا کارێکی مەحاڵ بێت.

"فۆکۆ" کاتێك دەڵێت: (مرۆڤ لە کلتوری خۆرئاوایدا داهێنانێکی تازە وەختە و تەمەنی لەسەدە و نیوێك تێناپەڕێت)، ئێمە توشی شۆك و سەرسوڕمانێکی گەورە دەکات، لەبەرئەوەی مرۆڤ لە دێرزەمانەوە لەسەر گۆی زەوی نیشتەجێیە.. بەلاّم "فۆکۆ" مەبەستی ئەوەیە مرۆڤ تەنها لە کۆتایی سەدەی هەژدە و سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا (ساتەوەختی کانت و دابڕانی ئەبستمۆلۆژی کانتیزم)، بوو بە بابەتی مەعریفەی زانستی. ئیتر لەو کاتەوە بۆ یەکەمین جار زانستە مرۆڤایەتییەکانی وەك: (مێژووناسی و کۆمەڵناسی و دەروونناسی و دەرونشیکاری و زمانناسی و ئابووری ناسی و.. هتد)، هاتنە ئاراو فیکر کەوتە گرنگیدان بە مرۆڤ لە هەموو ڕوویەکەوە، وەك بوونەوەرێکی زمانەوانی و ئابووری و بایەلۆژی. لێرەوە ئیتر مرۆڤ بووە چەقی گەردون نەك غەیب، بەمجۆرە هەڵسوکەوتی مرۆڤ بوو بە بابەتێك بۆ چاودێری زانستی. ئەمە وایکرد فەلسەفەی هیومانستی دروست بێت کەبووە هاوشانی شۆڕشی لیبرالیزمی بۆرژوازی و پێکهاتنی کۆمەڵگا پیشەسازیە مۆدێرنەکان. ئەم گۆڕانکاریانە وایکرد مرۆڤی ئەورووپی لە قۆناغی تیۆلۆژی مەسیحیەوە پاشان قۆناغی میتافیزیکیەوە، بگوازێتەوە و داخڵ بە قۆناغی زانستی – پۆزەتڤستی ببێت (وەکو ئۆگست کۆنت باسی دەکات). لێرەوە قۆناغی مۆدێرنە دەست پێدەکات.

بەو پێیەی "فۆکۆ" لەم مۆدێرنەیە چارسە و تەنها لایەنی نێگەتیڤانەی مۆدێرنە دەبینیت، ئەوا پێشبینی مەرگی مرۆڤی کرد، واتە پێشبینی کۆتایهاتنی سەردەمی زانستە مرۆڤایەتیەکان و فەلسەفەی هیومانستی بۆرژوازی کرد بۆ ماوەی دوو سەدە لە خۆرئاوادا بالاّ دەست بوو. بەلاّم "فۆکۆ" لەم مەسەلەیەدا پەلەی کرد و کارێکی سەرەڕۆیانەی کرد. نەیارەکانی ئەم پەرگیریە نیچەوییەیان بە هەل زانی و دەستیانکرد بە پەلاماردانی "فۆکۆ" و داکۆکیکردن لە فەلسەفەی هیومانستی و دەستکەوتەکانی شارستانیەتی لیبرالی خۆرئاوایی. ئەوانەی سەرمەشقی ئەم

هەڵمەتەن "لۆك ڤێری و ئالاڕینۆ"ن. هەرچەندە ئەوان ناهەقی دەرهەق بە "فۆکۆ" دەکەن، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا بۆچونەکانیان شایەنی ئەوەیە بە هێند وەربگیرێت. چونکە ئەوان دەیانەوێت داکۆکی لە فەلسەفەی هیومانستی ئەورووپایی بکەن و بەهاسەرەکیەکانی بپارێزن کە بریتییە لە (جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ و هاولاّتی). بە کورتیەکەی "لۆك ڤێری و ئالان ڕینۆ" دەیانەوێت ئیختیبار بۆ بەهاکانی ژیاری خۆرئاوا بگێڕنەوە، ئەو بەهایانەی لەسەر دەستی فەیلەسوفانی پۆست – مۆدێرن ڕووبەڕووی لێك شیتاڵکردن و ڕەخنەی توند بوونەوە.

لێرەدا پرسیارێك دێتە ئارا کە ئایا چۆن دەبێت فەیلەسوفە مەزنەکان، دژی مرۆڤ بن یاخود دژی فەلسەفەی مرۆڤگەرابن؟ بۆ ئەمە پێویستە بگەڕێینەوە ناو سیاقی مێژووی خۆرئاوا، بۆ ئەوەی لە هەلومەرجەکە تێبگەین و بەهەڵەدا نەچین.

لە سایەی فەلسەفەی هیومانیزمدا تاوانکاری گەورەی دژ بە مرۆڤایەتی ئەنجامدراوە. هەردوو جەنگی دووەمی جیهانی و جەنگە کۆلۆنیالیەکان، لە سایەی سیستمە دیموکراسیە بۆرژوازیەکاندا ڕوویانداوە! ئەی کەواتە بۆچی فەلسەفەی هیومانستی ڕێگای لەمانە نەگرت؟

لێرەوە مرۆڤی ئەورووپی متمانەی بەم فەلسەفە هیومانستیە نەما، کە شتێك دەڵێت و بە عەمەلیش شتێکی تر دەکات. هەر بۆیە لە دوای جەنگی دووەمی جیهانیەوە ڕووبەڕووی ڕەخنەیەکی توند بووەوە.

یەکەمین کەسێکیش کە کەوتە ڕەخنە لێگرتنی "میشێل فۆکۆ" نەبوو، بەڵکو قوتابخانەی فرانکفۆرت بوو. "لۆك ڤێری و ئالان ڕینو" دان بەوەدا دەنێن کە ڕەخنەگرانی فەلسەفەی هیومانیزم، لە هەندێك شوێندا ڕەخنەکانیان بەجێیە، لەبەرئەوەی کاتێك ئەوەی "فۆکۆ و دۆڵۆز" لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوودا گەیشتنە زانکۆ، فەلسەفەی هیومانیزم بڕێکی زۆر لە ڕاستگۆیی خۆی لە دەست دابوو. لەم هەلومەرجەشدا فیکری ڕەخنەیی "فۆکۆ" و فەیلەسوفانی دیکەی پۆست مۆدێرن هاتە ئارا. کێشەکە لەوەدایە ئەمانە ڕەخنەکانیان هەموو سنورێکی بەزاند و لەبری ئەوەی هەوڵی چاککردنی دامودەزگاکان بدەن، خەریك بوو بە تەواوەتی وێرانیان بکەن!.. لەبری ئەوەی هەوڵی ڕاستکردنەوەی ئاڕاستەی مۆدێرنە بدەن، هەوڵی ئەوەیان دەدا لە ناوی بەرن، مەترسی گەورەی ئەم ئاقارەش بە بۆچونی "لۆك ڤێری" لێرەدایە.

بەلاّم ئەوەی جێی سەرنجە لەم مەسەلەیەدا، ئەوەیە "لۆك ڤێری" ڕەخنەی ئەوە لە فەیلەسوفانی پۆست مۆدێرن دەگرێت کە بونەتە پاشکۆ و پاشبەندی فەلسەفەی ئەڵمانی، کەچی ئەو بۆ خۆشی پشت بە فەیلەسوفێکی گەورەی ئەڵمانییا دەبەستێت بۆ ڕەخنەگرتن لە پۆست مۆدێرنەکان! بۆ ئەم مەبەستە "لۆك ڤێری" دەگەڕێتەوە بۆ لای "هاپرماس" و تیۆریا بەناوبانگەکەی دەربارەی ئەقلاّنیەتی کۆمنیکاشیۆنی، لە پێناو ڕەتکردنەوەی تێزە و تیورەکانی "میشێل فۆکۆ"دا.

**سەرچاوە**

ڕۆژنامەی (الشرق الاوسط)، 2004/9/1.

# گۆڕان وەک مەرجێک بۆ ژیانی مۆدێرن

کریل ئێدوین بلاك

لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد

(1)

لە سەردەمی نوێدا، گەلێك گۆڕانکاری بنەڕەتی لــە شــێوازەکانی ژیــان و گــوزەرانی مرۆڤــدا روویانــداوە. بــۆ مــاوەی شــەش حــەوت ســەدە، گۆڕانکــاریی لــەم جــۆرە تایبــەت بــوو بــە گەلــە خۆراواییــەکان. وەلــێ لــە ســەردەمی ئێمــەدا وای لێهــاتووە کاریگــەریی لەســەر هــەموو مرۆڤایــەتی هەبێت. ئەمە یەکەمینجارە لە مێژوودا، کە تەرزێکی گەردونییانــەی مــۆدێرنیزم لــە سەرانســەری بــەها کەلەپوورییـــــەکان و دامودەزگـــــا هەمـــــەجۆر و جیاجیاکانــدا ســەرهەڵدەدات، هــەموو نەتــەوەکان ناچــارن بەرامبــەری گۆڕانکارییــە بنەڕەتییــەکانی سەراپای جیهان، هەڵوێستی خۆیان دیاریی بکەن. دەســکەوتەکانی مــرۆڤ لــە ســەردەمی مۆدیرنــەدا، دەرفەتی بێوێنەیان بۆ خۆشگوزەرانی مرۆڤ دابین کــردووە و وەڵامــی پێداویســتییەکانی دەدەنــەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، جۆرەها ئامێری وێرانکاریی گەردونییانەیان داوەتە دەستیشی. ئەگەر مرۆڤ بۆ خزمــەتی چــاکەی خــۆی بــە دوای تێگەیشــتنی دروســتی ســەردەمی مــۆدێرن و پشــتیوانیکردن لــە باشــترین حاڵــەتی بــەهاکان و دامودەزگاکانــدا بگــەڕێت، ئــەوا دەشــێت خزمــەتی ئاســودەیی و خۆشگوزەرانی مرۆڤایەتی بکات، پێچەوانەکەشی راستە.

دەشــێت رەگ و ریشــەی چــاخی مــۆدێرن لــە دیاردەی گەشەکردنی زانیاریدا ببینرێت، ئەوەی کە دەشێت لە گەشەکردنی زانستەکانی یۆنانەوە بۆ ئــەوروپای خــۆراوا لــە ســەدەی بیســتەمدا، بــۆی بگــەڕێین. لــە ســەرەتادا بــە خــاویی و پاشــان بــە خێراییــەکی زیــاتر و زیــاتر لــە دوای ســەدەی پازدەیەمەوە. مرۆڤ سەرکەوتنی زیاتری بەدەستهێنا لــە تێگەیشــتنی نهێنییــەکانی سروشــتدا، ئــەم زانیارییەشــی بــۆ خزمــەتی خــۆی بــەکارهێنا. لــە ســەدەی بیســتەمدا، ئــەم بەرینبوونەوەیــە ئەوەنــدە خێرا بوو کە سیستمە پەسەندکراوەکانی زانین لە بوارە تایبەتییەکاندا، لە ماوەی یەك تاکە (نەوە) دا

هەرەسیان هێنا, ئەم پرۆسەی گەشەکردنە هزرییە بێپسانەوە بەردەوامەو لەوانەیە ئەو گۆڕانکارییانەی لە ساڵی ئایندەدا دەیانبینین و لێیان تێدەگەین, زیاتر بن لەوەی لە هەموو ژیانماندا تێی گەیشتووین.

یەکێك لە گرنگترین بەرەنجامەکانی پیادەکردنی ئەم زانینە لە کاروبارە مرۆییەکاندا, کامڵبوون و بەرەوپێشچوونی زیاتر و زیاتری سیاسەت و سیاسەتکردنە. لە جیهانی تایبەتیدا, سیستمەکانی گواستنەوە, پەیوەندیکردن, کاروبار, هەروەها پەروەردەش, بەرینتر بوونەتەوە و زیاتر سێنتەریی بوون. لەسەر ئاستی نەتەوەیی, زۆرینەی پەیوەندییەکان یەکخراون و ئیستا زۆرن ئەوانەی بە پێی بنکە رێکخراوەکان, لەسەرانسەری جیهاندا هەڵدەسوڕێن. هەمان شێوەش لە جیهانی گشتیدا, حکومەتەکان زیاتر و زیاتر ملیان ناوە بەرەو کۆکردنەوەی ئەو وەزیفانەی پێشتر لە دەستی هەرێمەکان, ناوچەکان, هۆزەکان, یان خێزانەکاندا بوون. تەنانەت ستەمکارترین حکومەتی سەردەمەکانی رابردوو, ئەو پلەیەی کۆنترۆڵکردنی تاکەکانیان نەبوو, کە ئێستا حکومەتەکانی کۆمەڵگا پیشکەوتووەکان بە شێوەیەکی ئاسایی لەسەر تاکەکان پیادەی دەکەن. هەتا ژیان ئاڵۆزتر بێت, سیستمی یاساییش زیاتر گەشە دەکات تا ئەو خاڵەی کە تییدا نزیکەی هەموو چالاکییەکانی مرۆڤ بە شێوەیەك لە شیوەکان پەیوەندییان بە یاساوە هەبێت. ئەم ئاوێتەبوونەی سیاسەت, خەڵکی ناو دەوڵەتی خستۆتە ناو پەیوەندی نزیکترەوەو گەیشتۆتە رێکخستنێکی کۆمەڵایەتی یەکجار ئاڵۆز.

کاریگەرییەکانی زانستی نوێ بەشێوەیەکی بەرچاو لە بواری ئابوریدا دەبینرێت. پیشکەوتنی تەکنیکی وای کردووە میکانیزەکردنی کار شیاوتر بێت و سەرنجامەکەشی گەیشتۆتە بەرهەمهێنانی دەستەجەمی و گەشەکردنی بەردەوام لە بەرهەمگوزارێتی تاکدا, لەگەڵ فراوانبوونی دابەشکردنی کاردا. لە ماوەی سەدەی رابردوودا, لە چاو سەراپای مێژووی مرۆڤایەتیدا, بڕێکی زۆرتری کەل و پەل بەرهەمهێنراوە. بە راستی, ناکۆکی ئیمڕۆ لە نێوانی ئاستی ژیان لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکان و کۆمەڵگاکانی رابردوودا زۆر بەرچاوە. لە ولاتە پێشکەوتووەکاندا, داهاتی تاك, لەوانەیە بگاتە 2500 تا 3000 دۆلار, لە کاتێکدا لەو ولاتانەدا کە هێشتاش شێوازە کۆنینەکان بەکاردەهێنن, لەوانەیە بگاتە 50 تا 100 دۆلار.

گرنگیی ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە جیهانی کۆمەڵایەتیدا روویانداوە, هاوتای جیهانی ئابوورین. کۆمەڵگا کۆنینەکان بە تەواویی داخراون و نوساون بە بونیادی خۆیانەوە. ئەندامانی ئەو کۆمەڵگایانە بەشیوەیەکی سەرەتایی وەرزێرن و لە گوندە دوورە دەستەکاندا دەژین, هەژارو نەخوێندەوارن و پەیوەندییان بە دەسەڵاتدارە سیاسییەکانی سێنتەرەوە زۆر کەمە. لەوانەیە شێوازی ژیانی وەرزێرەکان بۆ ماوەی چەندان سەدە گۆڕانکاریی بەسەردا نەهاتبێت. زانین و تەکنەلۆجیای مۆدێرن کاریگەرییەکی زۆری لەسەر شێوازە کۆنینەکانی ژیان هەیە. لە کۆمەڵگای مۆدێرندا, دوو بەش لە سێ بەش یان زیاتری دانیشتوان لە شارەکاندا دەژین, خوێندەواری بووە بە شتێکی گشتی. تەندروستی زۆر بەرەو پێش چووە. شیوازی گەردونییانەی بەشداریکردنی تایبەتی جێگەی ئەو جیاکارییانەی گرتۆتەوە کە لە لایەنی رەگەز, ئایین, خێزان, چینەوە سەپێنرابوون. دابەشبوونی پیشوو لە نێوانی وەرزێرەکان و شارنشینەکان و ئەریستۆکراتەکاندا, جێگای خۆی

چۆڵ کردووه بۆ کۆمەڵگایەکی هاوشێوەتر کە تییدا پایەی تاك زیاتر بە دەسکەوتی تایبەتی خۆی دەپیورێت نەك ئەو حاڵەتەی کە بە میرات بۆی ماوەتەوە.

زنجیرەی ئاڵۆزو بەناویەکداچووی گۆڕانکارییەکان لە شێوازی ژیانی مرۆڤدا، بەشێوەیەکی گشتی پێی دەوترێت "مۆدێرنەکردن". نزیکەی پێنج سەدەیەك دەبێت کە گەلانی خۆراوا لەم پرۆسەیەدان، گەلانی کەمتر پیشکەوتووش کەمتر لە سەدەیەکە کەوتونەتە ناوی. مۆدیرنەکردن بەشێکە لە ئەزمونی جیهانی، لە زۆر رووشەوە یەکێکە لە هیوا مەزنەکان بۆ خۆشگوزەرانی مرۆڤ. بەڵام لە زۆر رووی تریشەوە پرۆسێسێکی وێرانکەرانەیە. تەرزە کۆنینەکانی ژیانی وێران کردووە، ئەو تەرز و شێوازانەی توێی سەدەکانەوە گەلێك بەهای مرۆییانەیان پێشخستووە. مۆدێرنە لە زنجیرەیەك جەنگی لۆکاڵ و جیهانیدا چەندان ئیمپراتۆرییەت و دەوڵەتی رماندووە، ئەو جەنگانە بە وێرانکەرترین و دژوارترین جەنگەکانی مێژوو دەناسرێن. ژیانی ناو خێزانی گوندنشینی تەفروتونا کردووە، ئەو ژیانەی جاران تاکەکان زۆر پێی خۆشحاڵ بوون، هەروەها بووەتە هۆی تەقینەوەی ژمارەی دانیشتوان، ئەوانەی خەریکن ئەو بەرهەمە خۆراکییە دەماشنەوە کە لە چەندان سەدەدا بەرهەمهێنراوە. جیهانی دیرینی گۆڕیوە و کۆمەڵگایەکی قەرەباڵەغ و سیخناخی خولقاندووە، کە تێیدا تایبەتمەندێتی، تاکگەرایی و توانا و لێوەشاوەیی بە هۆی ستانداردەکانی تاقیکردنەوەی ئیدارییەوە گەشەیان کرد و پێشکەوتن، لەوێشدا کاروبارە بەقازانج و سودپەرستەکان بوون بە فاکتەرێکی زاڵ.

(2)

سیمای سینتەریی چاخی مۆدێرن، بریتیە لە بڵاوبوونەوەو تەشەنەکردنی دامودەزگاکانی ئەورووپای خۆراوا بە هەموو جیهاندا. نیشتەجێ ئەورووپییەکانی سەرخاکەکانی باکور و باشوری ئەمریکاو ئۆشینیا چەندان فۆرمی نویی سیاسییان هێنا بۆ جیهان کە بەشێوەیەکی رێژەیی هەموویان مۆدێرنن و دەسیاوی سیستمە ئەورووپییەکانن لەمەڕ حکومەت. لە وڵاتانی وەك روسیاو یابان و تورکیاو چیندا، تەرزێکی جیاوازی رژێم دامەزرا. ئەو وڵاتانەی بە شیوەیەکی بەرچاو بەشدار نین لە پیشکەوتنی ئایدیا مۆدیرنەکاندا، نەریتی حکومەتی بەهێزیان لە رابردووەوە بۆ مابۆوە. کاتێك لە هەردوو سەدەی هەژدەو نۆزدەدا، رووبەڕووی بەراوردکردن بوونەوە لەگەڵ دەوڵەتەکانی خۆراوای مۆدێرندا، ئەو وڵاتانە لە سەرەتادا لەبەر چەند هۆیەکی خۆپاریزییانەی بەرایی، لە سەرەتادا ریفۆرمە مۆدێرنەکانیان پەسەند کرد، بەڵام تەنیا لە بەشی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا بە توندی باوەشیان کرد بە مۆدیرنەکردندا.

باقی کۆمەڵگاکانی تری جیهان، کە وەکو کۆڵۆنی سەر بە کۆمەڵگا مۆدیرنەکان هاتنە ناو سەردەمی مۆدێرنەوە، هێشتا لە قۆناغی سەرەتای پەرەسەندندان و هیشتا بەدوای فۆرمولەکردنی مۆدێرنەی سیاسی خۆیاندا دەگەڕێن.

لە شوێنانی وەك میسرو هیندستان، گەلانی خاوەن میراتێکی سیاسی باش دامەزراو، بوون بە بابەتی فەرمانڕەواییکردنی کۆمەڵگا زیاتر مۆدێرنەکان و سەرکەوتووانە کارلێکیان لەگەڵدا کردن. لە لایەکی تریشەوە، کۆمەڵگا کەمتر گەشەکردووەکانی ئەفریقیا، نەك تەنیا دامودەزگا سیاسییەکانیان لە کۆمەڵگا مۆدیرنەکان خواستەوە،

بەڵکو زمانەکانیشیان و چەند توخمێکی کەلتورەکانیشیان لێ وەرگرتن.

سەقامگیریی ڕێژەییانەی ئەو وڵاتانەی کە لەسەرەتادا مۆدیرنە کران، لەبەشی زۆریدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستییەی ئەوانە لە جیهانیکدا گەشەیان کردووە کە خۆی کێبەرکێکەری کەم بووەو سەرەنجامیش بوونەتە کاریگەرترین سێنتەرەکانی دەسەڵاتی سیاسی و لە زۆر ڕووەوە بوون بە مۆدێل بۆ کۆمەڵگاکانی تریش. بە پێچەوانەوە، ئەوانەی درەنگتر کەوتنە ژێر کاریگەریی ئایدیاو دامودەزگا مۆدێرنەکانەوە، نەك تەنیا لە بارودۆخێکی پڕ لە پشێویی و ناسەقامگیردا پرۆسێسەکەیان وەرگرتووە، بەڵکو لە ژێر فشاری ئەو مۆدیلانەشدا بوون کە زۆر ڕەگیان داکوتابوو بەجۆرێك لەق کردنیان ئاسان نەبوو. ڕیزبوونی کۆمەڵگاکان لە پلەی مۆدێرنەدا زۆر جیاجیایەو ناتوانرێت کاریگەرییەکی کەرت و پەرت بەسەر کۆمەڵگا کەمتر پێشکەوتووەکاندا پیادە بکرێت، گەرچی بەرینبوونەوەی ئەم پەرت و بڵاوییە پشت دەبەستێت بەو بارودۆخانەی دەشێت لە سایەیاندا مۆدێرنەکردن پێناسە بکرێت. لە شوێنێکدا کە فرۆکەی (میك) و عەرەبانەی (گا) پێکەوە بوونیان هەبێت، مۆدێرنەکردن زۆر ناڕەحەتە، لەچاو ئەو کۆمەڵگایانەی بەشێوەیەکی پلەپەلتر و هاوسەنگتر پێشکەوتنیان بەخۆیانەوە بینیوە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو وڵاتانەی درەنگ کەوتونەتە سەر ڕیگای مۆدیرنە سودێکی زۆریان وەرگرتووە. ئیمپریالیزم بە ڕاشکاویی وەکو سەرچاوەیەکی سەرکوتکردن ناسراوە، بەڵام لە ڕاستیدا، ئەگەر بەشێوەیەکی ڕێژەیی بدوێین، سودیشی هەبووە. وەکو سەرەنجامێکی ئیمپریالیزم، گەلێك لە دەسکەوتەکانی وڵاتە پێشکەوتووەکان، لە پێشکەوتووترین شێوەیاندا ئامادەکراون و کۆمەڵگا کەمتر مۆدێرنەکانی ڕزگارکردووە لە مەسرەفی بەدیهێنانیان کە زۆر گران مەسرەف بوون.

لە هەمانکاتیشدا، وڵاتە زۆر پێشکەوتووەکان زۆر خۆشحاڵ نەبوون بۆ دزەکردنی مۆدێرنە کە بەشێوەیەکی حاشاهەڵنەگر دەبێتە هۆی سەربەخۆبوونی کۆلۆنییەکان و لەدەستچوونی ئەو سودانەی لە پەیوەندی نایەکسانەوە دەستیان دەکەوت. لەوەش زیاتر دزەکردنی مۆدێرنە پرۆسێسێکی زۆر شێلگیرانەیە، وڵاتە پێشکەوتووەکانیش نە هۆکاری تایبەتی یان مادییان نیە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو جۆرە شۆڕشانە لە کۆکلۆنییەکاندا. بۆیە، قۆناغی مۆدێرنە بەشێوەیەکی گشتی لە کۆلۆنییەکاندا ڕێگریی لێکراوە، ئەوانیش ناچاربوون لە قۆناغە سەرەتاکانی مۆدێرنەدا بەدوای سەربەخۆییدا بگەڕێن. لەمەشدا لە لایەنی ئەو پانتاییەوە هاوکارییان کراوە کە هاوسەنگی هێزو کاریگەریی لە نێوانی کۆمەڵگا زۆر مۆدیرنەکاندا ڕەخساوە، سەربەستی هەڵسوڕانیان داوە بە هاتووە درەنگوەختەکان لە دەرەوەی جوغزی هێز و تینی ئەوان.

لە ماوەی درێژدا، بڵاوبوونەوەی دامودەزگاکان مۆدێرنەکان بە سەراپای جیهاندا کاریگەریی هەبووە لەسەر هاندانی ئاڕاستە پێچەوانەکان بەرەو هەریەکە لە ناسیونالیزم و سەربەخۆیی. لە لایەکەوە هانی پێشکەوتنی ژمارەیەکی زۆری وڵاتە سەربەخۆکانی داوە، ئەمەش بووەتە هۆی گەورەکردنەوەی گرفتەکانی ڕاگرتنی سیستمی نێودەوڵەتی. لەکاتێکدا کە دەوڵەتەکانی جیهان زیاتر و زیاتر ڕوویان کردۆتە ئەنجامدانی ئەرکە

باوەکـانی مۆدیرنــە — لــە وێنــەی پێشخســتنی زانیـاری، ئاوێتــەکردنی سیاســی، پەرەپێــدانی ئـابوریی، لەگـەڵ هـەرەوەزی کۆمەڵایەتیـدا — ئـەو هۆکارانەی بە هۆیانەوە ئەو ئەرکانە ئەنجام دەدرێن، تـا رادەیـەکی زۆر پشـت دەبەسـتن بـە دامودەزگـا باوەکـانی نـاو هـەر وڵاتێـك. بۆیـە ئـەو وڵاتانـەی لـە قۆنـــاغی کۆنینەیانـــدا، دامودەزگـــا فیۆدالییەکانیان پێشخستووە لە نمونەی ئەوروپای خـۆراوا، لــە مـاوەی مۆدێرنـدا، روویانکردۆتــە پەرەپێدانی دامودەزگا سیاسییە نوێنەرایەتییەکان. ئەوانـەی لـە کۆنـا دامودەزگـای ئۆتۆکراسـییانەیان هــەبووە، پییانــەوە دیـاربووە کــە لــە ســەردەمە مۆدیرنەکانـدا لەسـایەی کۆنترۆڵکردنـە سیاسـییە سێنتەرییەکاندا باشتر هەڵسوڕاون.

زۆربــەی وڵاتــەکان هیشــتا بــە باشــی پێشـنەکەوتوون بـۆ ئـەوەی رێگـە بـە هەڵسـەنگاندن بدەن، لە نمونەی ئەوەی دامودەزگا سیاسییەکانیان لە سایەی مەرجە مۆدێرنەکاندا چۆن پەرەدەسێنن. هەچۆنێك بێت وادیارە بۆ ئایندەی پێشبینیکراو، فۆرمـەکانی کۆمـەڵگای مـۆدێرن، کـە لـەو وەزیفەیـە جیادەبێتـەوە کە هەیانـە، بـە دەگمـەن کـەمتر جیـاواز دەبێـــت لـــە سیســـتمە کۆنینـــەکانیان. فۆرمـــە کۆنینەکانیکردەوەی سیاسی، ئـەوانیش توانیویانـە وەکو زمان چەندان شیوازی جیاجیایـان هـەبێت. بـە تـەنها هـەر نەتـەوە نوێیـەکان نـین کـە گـەلێك لـە جیاوازییــە تەقلیدییــەکانی خۆیانیــان دەپــارێزن، بـەڵکو ئـەوانیش لـە چـەند روویەکـەوە بەشـدارن لــەوگیرو گرفتــە خۆماڵییانــەدا کــە ســەر ئاســتی بەرژەوەنـــدیی نێـــو نەتـــەوەیی روودەدەن. پێداویســتییەکانی مۆدێرنــە بوونەتــە هــۆی ئــەوە بەشـێوەیەکی بـەرین کۆمـەڵگا کـۆنترۆڵ بکرێـت لـە بـوارە کۆمەڵایـەتی و ئابورییەکانـدا، بـە مەبەسـتی دامەزراندنی پلەیـەك لـە پلـەکانی ئـۆردەر و تـەبایی ویـــەکێتی دامـــەزراوەیی لـــە ماوەیەکـــدا کـــە گۆڕانکارییـــەکان زۆر خێـــران و ســـەرەکیترین نارەحەتترین بەشی ئەم بەرپرسیارێتییەش کەوتۆتـە سـەر ئەسـتۆی دەوڵـەتی نەتـەوەیی. بۆیـە دەوڵـەت زیاتر ترسی پەیدا کردووە لە ئیمتیازەکانی خۆی و بەنابەدڵی دەسبەرداری سەروەریی خۆی دەبێت لە مەسەلە نێودەوڵەتییەکاندا.

بـە پێچـەوانەی ئـەم مەیلـە ناسیونالیسـتەوە، شتێکی ئاشکرایە کە گـەلێك هێز بەرەوئەوە ملیـان نـاوە کۆمـەڵگاکان بە شێوەیەکی نێودەوڵـەتی پشت بـە یـەکتریی ببەسـتن — بـە هـۆی هێزگـەلێکی وەك پێشـــکەوتنی هۆیـــەکانی پەیوەنـــدیکردن، گـەردونیبوونی دام و دەزگـاو ئایـدیا مۆدێرنـەکان، بەرینبوونەوەی ئەو پانتاییەی کە لە تویێیدا کـەل و پـەل و خزمەتگوزارییـەکان ئـاڵوگۆڕ دەکـرێن، رەوی ملیۆنەها کەس لـە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایـەکی تر، سەرهەڵدانی رێکخراوە نێودەوڵەتییـەکانی سـەر بـــە گروپـــە وەزیفییـــەکان، تایبەتمەنـــدبوونی ئابورییانـــەی هەرێمـــەکان و تەنانـــەت هـــەموو کۆمـــەڵگاکانیش. پەرەســـەندنی تـــەواوی دەزگـــا و ئایـــدیا مۆدێرنـــەکان پێویســـتی بـــە ئاســـتێکی سەرچاوەو پسپۆڕیی هەیە کە بە دەگمەن لە ناو یەك تاقـە کۆمـەڵگای سیاسـیی رێکخـراودا هەیـە. کـەمن ئـەو کۆمەڵگایانـەی کـە دەتـوانن بـەهۆی چـاکی ناوچـــــەکانیان و فرەیـــــی سەرچـــــاوەو شـارەزاییەکانیانەوە، بـە جیـا لـە دراوسـێکانیان، خۆیـان مـۆدێرن بکـەن. ئەمـە شـتێکی ئاوارتەیـە، وەلـیٚ، هێـزە بـە دەسـەلاتەکان بـە شـێوەیەکی کـاتی بـــەکاردەهێنرێن بـــۆ بـــەهێزکردن و دەرخســـتنی دەسەڵاتیسیاســی، بووەتــە هــۆی بڵاوبوونــەوەی

هەستێکی بەرین بەو نائارامییەی کە لە ناو هەموو دەوڵەتەکاندا هەبووە.

(3)

مۆدێرنەکردن بە تەنها کارناکاتە سەر پەرەسەندنی ناوخۆی کۆمەڵگاکان, بەڵکو کاریگەریی لەسەر پەیوەندی نێوانیشیان هەیە. لە ئەنجامی فراوانبوونەوەی دەسەڵاتی هەندێکیاندا لەسەر حیسابی ئەوانیتر, بۆتە هۆی گۆڕانی پەیوەندی نێوانیشیان. مۆدێرنە هەر زوو کاری کردۆتە سەر کۆمەڵگاکان و پرۆسێسی بە مۆدێرن بوونیان.

لە هەمان کاتیشدا, کۆمەڵگاکان زیاتر سەربەخۆ بوون و شێوازیی پەیوەندیی نێوانیشیان گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە. لە کاتێکدا کە گەلێك لە شێوە کۆنینەکانی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان توانیویانە بمێننەوە – هاوپەیمانێتی و جەنگ, داگیرکردن و بەکۆلۆنیکردن, بڵاوکردنەوەی کەلتور و پرۆپاگەندە – هەموویان ماونەتەوەو مانای نوێیان وەرگرتووە. لەوەش زیاتر, پشتبەیەکبەستنی نێودەوڵەتییانە بووەتە هۆی پەرەسەندنی سیستمێکی زیاتر ڕێکخراو کە پەیوەندی نێوانیان ڕێکدەخات, لە نمونەی کاروباری دیپلۆماسی و کۆنگرە نێودەوڵەتییەکان و یاسای نێودەوڵەتی.

لە زۆر ڕووەوە, درامیترین سیمای ئەم پرۆسەیە کاریگەریی خۆی لەسەر هەڵوێستی ئاڵوگۆڕی ئەو کۆمەڵگایانە داناوە کە لە پێشەوە مۆدێرن بوون. ئەوانە لە ئیمپراتۆرییە دەسەڵاتدارەکانەوە گۆڕاون بۆ سێنتەرە گەورەکانی کاریگەریی, کە تا ئەم ساتە جیهان بە خۆیەوە بینیبێتی. ئەوانیش وەك خودانی مۆدێرنە دەستیان کردووە بە بڵاوکردنەوەی چەمکەکە و ڕێگای دەستدرێژیکردنیشیان گرتۆتە بەر, ئایدیاو دام و دەزگا مۆدێرنەکانیان گەیاندۆتە ئەوپەڕی جیهان. لەبەر ڕۆشنایی کاریگەرییاندا (1900–1920) کۆمەڵگاکانی ئەوروپای خۆراوا, زیاتر لە نیوملیار خەڵکی نائەوروپاییان خستبووە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە. پەیوەندی نێوان فەرمانڕەوایان بە فەرمانڕەواییکراوانەوە کێشمەکێشێکی بەردەوامی لێکەوتۆتەوە. هەمیشەش کاتێك دیدە مۆدێرنەکان بە زەبری شمشێر سەپێنرابن, ڕەتکراونەتەوە. هەروەها بووشەتە هۆی سەرهەڵدانی دیاردە دژایەتیکردنی مۆدێرنەی ئەوروپایی, ئەوانە دژی هێنەرانی مۆدێرنەی ئەوروپایی وەستاونەتەوە و دژی فەرمانڕەوایی ئەوروپایی جەنگاون. لەگەڵ ئەوەشدا, لە ماوەی درێژدا, کۆمەڵگا زیاتر مۆدێرنەکانیش خزمەتی کۆمەڵگا کەمتر مۆدێرنەکانیان کردووە, سوودەکانی مۆدێرنەیان بۆ هێناون, لەگەڵیشیاندا گیروگرفتە خۆ لێ لانەدراوەکانیشیان بۆ هێناون. دەشێت لەم ڕووەوە ئیمپریالیزم بە هێزێکی بە مۆدێرنکەر ناو ببرێت. کاتێك لە سەرەنجامی ئەم پرۆسێسەدا, کۆلۆنییەکان گەیشتنە قۆناغێك تێیدا توانایان هەبوو هەریەکە لە جڵەوگیریی سیاسی و ئاغایەتی کۆمەڵگا مۆدێرنەکان ڕەت بکەنەوە, کە دواتر وردە وردە کاریگەریی لەسەرانسەری جیهاندا دەرکەوت.

ئەم وەرچەرخانە لە پەیوەندی ئەو گەلانەدا هاوشانی پەرەسەندن و تەشەنەکردنی هەستێکیش بوو بە نائارامی و پشێویی, کە دەشێت لەو کرژییانەدا ببینرێت کە لە هاوکات لە پشتیوانیی نێودەوڵەتیی یەکترییدا دەردەکەوت. لە ڕاستیدا ئەم هەستی نائارامییە ببوو بە هێزێکی درکپێکراوی وەها کە ڕەنگە یەکێك بویرێت شێوە جیاجیاکانی

ئیمپریالیزم و هاوپەیمانێتی و جەنگەکان و ئەزمونی کامڵبوونی سیاسییانەی وەها لێك بداتەوە کە خەسڵەتی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانیان لە سەردەمە مۆدێرنەکاندا وەها دیاریی کردووە کە گەڕانێك بێت بۆ ئاسایش، کە ئێستاکە زۆر لە جاران زیاتر پێویستیمان پێیەتی. بۆ نمونە کە لە دەهەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا، ئیمپریالیزم گەیشتە ئەوپەڕی لوتکەی خۆی، دەشێت ئەوە وا لەقەڵەم بدرێت کە کۆمەڵگا زیاتر مۆدێرنەکان دەیانویست بە بەرینکردنەوەی قەڵەمڕەویی خۆیان بەسەر کۆمەڵگا کەمتر مۆدێرنەکاندا، هەوڵ بدەن ئاسایشی خۆیان بپارێزن، ئەویش بەوەی دەست بگرن بەسەر سەرچاوەو تواناکانیاندا.

ئاشکرایە نە وەبەرهێنانی سامان و نە بازرگانی و نە زیادبوونی دانیشتوان نەبوونە هۆی ئەوەی گروپە جیاجیاکانی ناو کۆمەڵگا ژێر دەستەکان بە ئیمپریالیزم و کۆمەڵگا مۆدێرنەکان سەرسام ببن. لە هەمان کاتیشدا، لە چەند حاڵەتێکی بەرچاودا، دەوڵەتە ئیمپریالیستە سودێکی وەهایان دەستکەوت کە نەیاندەتوانی لە دوورەوەو لە پشتی دەریاکانەوە بە دەستی بهێنن، بۆیە بەلایانەوە ئەمە هۆیەکی باش بوو بۆ ئەوەی ئمپراتۆرییەتەکان بە گرەنتی ماقووڵی ئاسایش لەقەڵەم بدەن. ئەوەشی لەگەڵدا بێت کە هەموو جارێك ناتوانرێت پێشوەخت حیسابی چۆنێتی و چەندێتی ئەو بەرژەوەندییانە بکرێت کە لە سەرچاوە دەرەکییەکانەوە دێن، بۆیە لە لایەنی دەوڵەتە ئیمپریالیستەکانەوە ویستێکی بەهێز هەبوو بۆ ئەوەی دەست بگرن بەسەر ناوچەکاندا بۆ ئەوەی بوار نەدەن نەیارەکانیان داگیریان بکەن بۆ خۆیان. لەپاڵ ئەوەشدا، ئیدامەکردنی ئیمپراتۆرییەت زۆرجار پێویستی بەوە هەبووە کە چەند هەڵوێستێکی سیاسی وەربگیرێت، بە مەبەستی پاراستنی مۆڵکە دوورە دەستەکانی. کەم بوون ئەو دەوڵەتە مۆدێرنانەی توانییان فەرمانڕەوایی خۆیان بەسەر گەلە کەمتر مۆدێرنەکاندا بسەپێنن، ئەوانەی لە هەرێمی یەك لە تەنیشتی یەکدا دەژیان، هەروەها لەناو کۆمەڵگایەکی میترۆپۆڵدا کۆیان بکەنەوە لە بری ئەوەی وەکو کۆڵۆنی فەرمانڕەواییان بکەن.

ئەم باڵکێشانە بەسەر کۆمەڵگا کەمتر مۆدێرنەکاندا لە دەوروبەری ساڵی 1900 دا، گەیشتە کۆتایی، نەك بەهۆی شۆڕشی ژێردەستەکان دژیان، کە هەتا دوای نەوەیەك یان دوو نەوە دوای ئەوەش سەری هەڵنەدا، بەڵکو لەبەر ئەوەی چیتر هیچ خاکێکی تر نەما تا داگیر بکرێت. ئێستا کۆمەڵگا مۆدێرنەکان لە گەڕانیاندا بە دوای ئاسایشدا، دەیانەوێت لە تویێی سیستمی هاوپەیمانێتییەوە، ئەوەی کە لە سەردەمی ئیمپریالیزمدا نەیانتوانی بیکەن، ئێستا بە دەستی بهێنن. پەیوەندیی هاوپەیمانێتی کە تا ئەو ساتە بە هۆیەکی سانەویی ئاسایش لەقەڵەم دەدرا، کە ئەگەر پێویستی بکردایەو جڵەوی کۆنترۆڵی ناوچەکان بکەوتایە مەترسییەوە، دەسبەرداری دەبوون، ئێستا بووە بە یەکەمین مەسەلەی گرنگ. ئیتر پەیوەندییەکان ئەوەندە بە گرنگی وەرگیران، کە هەڵگیرساندنی جەنگێکی گشتی بۆ پاراستنی هاوپەیمانێك بوو بە شتێکی پاساودراو، ئیتر ئەو هاوپەیمانە چەند بچووك بێت و بگرە ئەگەر لاوازترین ئەڵقەی سیستمی هاوپەیمانێتییەکەش بێت. ئیتر کێشمەکێشە نێودەوڵەتییەکان بە پێی ئەم ڕەوشە کەوتنە گەڕ. لە ڕاستیشدا جەنگی یەکەمی جیهان لە بەر قەیرانێکی لەم جۆرە هەڵگیرسا.

هۆی جەنگی یەکەمی جیهان ناتوانایی سیستمی سیاسی ئەوروپایی بوو لە مامەڵەکردن لەگەڵ فشاری ناسیونالیزم و سەربەخۆییدا. لەوەش زیاتر، چارەسەرە ئاشتییانەکەی ساڵی 1919، هیچ شتێکی نەکرد بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتە بنەڕەتییە. بە پێچەوانەوە، جەنگەکە بەشێوەیەکی بەرچاو بووە هۆی بەهێزکردنی ناسیونالیزم و بە دەوڵەتبوون و سەربەخۆیی ئابوریی و لاوازبوونی هەموو ئەو باوەڕ و دام و دەزگایانەی کاریان دەکرد بۆ کەمکردنەوەی جیاوازییەکانی نێوان کۆمەڵگاکان. بەمەش ناسیونالیزمی کەلتوریی و خودئیکتیفاکردنی ئابوریی بوون بە سیمای باوی رۆژ و خۆیان چەکدار کرد و دژی هەموو پێشنیارەکانی ناو کۆنفرانسەکان وەستانەوەو دواتریش رووبەڕووی ئەو ئامادەکارییانە وەستانەوە کە بۆ بەدەزگاییکردنی فشارە نێودەوڵەتییەکانی مۆدێرنە تەسمیم کرابوون. لە ئەنجامی خۆماڵیکردنی ئابوریدا، سەرکوتکردنی ئابوریش زیاتر بوو، هەروەها قۆرتیشی خستە بەردەمی چارەسەرکردنی قەیرانەکان لە توێی هەوڵە نێودەوڵەتییەکانەوە. وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا، سەرەنجامە دیارەکانی سەرکوتکردن، سێ بەرنامەی هەڵسوڕانی هێنایە پێشەوە، کە ئەوانیش هەر زوو لەگەڵ جەنگی دووهەمی جیهاندا تووشی کێشە بوون. ئامانجی یەکەمیان ئەوە بوو لە ژێر سایەی وڵاتانی میحوەردا، بەشە گەورەکانی جیهان کامڵ بکات، دووهەمیشیان دەیویست لە ژێر سێبەری سۆڤێتدا، جیهانێکی کۆمۆنیست بنیات بنێت. سێهەمیشیان جاری بۆ سیستمێکی پلورالیستییانەی نێودەوڵەتی دەدا، لە توێی ئامادەکاریکردندا بۆ چوارچێوەیەکی سیاسی و ئابوریی نێودەوڵەتی، لە ژێر سەرپەرشتی وڵاتە دیموکراسییەکانی خۆراوادا.

لەگەڵ بەزینی هێزی میحوەر لە جەنگی دووهەمی جیهاندا، بەرنامەکانی خۆراواو سۆڤێت لەمەڕ مۆدێرنە کردن بوونە کێباری یەکتریی لەسەر کاریگەربوون لە جیهاندا و ئەمەش زیاتر لە بیست ساڵی خایاند و تا دەهاتیش ئەو ململانێ و کیشمەکێشە توندتر دەبوو، سەرەنجامی ئەو جەنگەش، کە باڵی بەسەر نەوەیەك یان زیاتردا کێشابوو، پرۆسەکانی سەربەخۆیی نیشتمانی لە وڵاتانی کەمتر مۆدێرندا راگەیەندرا، ئەوانەی لە ژێر سێبەری فەرمانڕەوایی بیانیدا بوون. ئەو دوو جەنگە جیهانییە نەك هەر دەرفەتی بۆ ئەو کۆمەڵگایانە رەخساند تا نیری بێگانە لە ئەستۆی خۆیان دابڕنن، بەڵکو زیاتریش یاریدەی مۆدێرنەی دا و خێراتریشی کرد، هۆیەکەشی ئەوە بوو کە وڵاتە میترۆپۆڵییەکان لە توانایاندا نەبوو، هەمان ئەو خزمەتگوزارییان درێژە پێ بدەن کە لە کاتی ئاشتیدا پێشکەشیان دەکرد. لە ساڵانی دوای جەنگی دووهەمی جیهاندا، پێویستی چارەسەری بەپەلە بۆ گیروگرفتەکانی مۆدێرنە زیاتر بوو، ئینجا لەبەر ئەوەش کە باج و زیانەکانی جەنگی جیهانی سەر شانی هەمووانی قورس کردبوو، توانای هێزە مەزنەکان بۆ چەندهێندەکردنەوەی کاریگەرییان، کاری کردە سەر شۆڕشگێڕە خۆماڵییە مۆدێرنەکان بۆ ئەوەی زیاتر و زیاتر هۆکارە سەرەکییەکانی وەرچەرخاندنی هاوسەنگی نێودەوڵەتییانە هێزەکان لەپێشچاو بگرن. لە هەمانکاتیشدا، ئەو پۆڵبەندییە بە تین و تاوەی کە خەسڵەتی سیاسەتی جیهانی بوو لە یەك دەهە یان دوو دەهەی دوای جەنگی دووهەمدا، وردە وردە لەناو کۆمەڵێك

**پەیوەنـدی نـەرم و نیـاتردا توایـەوە. لـەو بـارو دۆخانـەدا، ولاتـە پەرەسـەندووەکان توانایـان هەبوو هانا بەرن بۆ یاریدەی چەند سەرچاوەیەك کە تـا دەهـات زیـاتر ئامـادە دەبـوون بـۆ هەڵگرتنـەوەو ئاوێتـەکردنی مۆدێلـە بیانییـە جۆراوجۆرەکـان، ئـەویش لـە گەڕانیانـدا بـە دوای دام و دەزگـای مۆدێرنی وەهادا کە لەگەڵ میراتییە تەقلیدییەکانی خۆیاندا بسازێت.**

**لە ناوەڕاستی هەزارو نۆسەد و شەستەکاندا، زیـاتر لـە پـازدە یـان بیسـت دانـە لـە ولاتـەکانی سـەر زەوی بـە پێشـکەوتوو لەقەڵـەم دەدران، بـە مانـای ئـەوەی رێگایـەکی درێـژیان بڕیـوە لـە بـواری بـەکارهێنانی زانیارییـەکانی بەردەسـتیاندا بـە باشـترین شـێوە بـۆ باشـترکردنی ژیان. بەشی هەرە زۆری خەڵکی سەر زەوی لە سەد یـان زیـاتری ولاتەکانـدا، هێشـتا ئـەرکێکی گـران و درێژخایـەنیان لەبەردەمدایـە بـۆ ئـەوەی دامودەزگاکـانی خۆیـان ئامـادە بکـەن بـۆ وەزیفـە مۆدێرنـەکان و هاوکـاریی بکـەن بـەرەو دامەزرانـدنی سیسـتمی جیهـانی بـە جۆرێـك ببێتـە هـۆی ئـەوەی جیهـان بـۆ مۆدێرنـە ئاسـایش بێـت. نەتـەوە یەکگرتووەکان لەم پێناوەدا رۆڵێکی سێنتەرییانەی هەیـەو لـە تـوێی ئەویشـەوە ئـەرك دەکەوێتـە سـەر شـانی دەوڵەتـە پێشـکەوتووەکان تـا رێنمـایی و هاریکاریی گەلانی جیهان بکەن.**

## کریل ئێدوین بلاك

کریـل ئێـدوین بـلاك پرۆفیسـۆری مێـژووی روسـیایە لـە زانکۆی پرینتۆن. منداڵی خۆی لە تورکیا سەرف کردووەو پێش ئـەوەی بگەڕێتـەوە بـۆ ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا بـۆ بەدەسـتهێنانی بڕوانامـەی بـەکالۆریۆس لـە زانکـۆی دەك و پاشـان، پەیوەنـدی کـردووە بـە زانکـۆی ئەمریکییـەوە لـە بولگاریا. پاشان لە زانکۆی هارڤارد هەردوو بڕوانامەی ماسـتەر و دکتۆراشـی لـە زانکـۆی هارڤـارد وەرگرتـووە. دواتـریش لـە زانکۆی پرینستۆن بووە بە وانە بێژو هەر لەوێ وەك یـەکێك لـە لێکۆڵـەرە دەرکـەوتووەکانی مێـژووی روسـیا و ئـەوروپای خـۆرەلات ناسـراوە. بەشـداریی کـردووە لـە لێکۆڵینـەوە ئەمریکییـەکان و لێکۆڵینـەوەکانی نەتـەوە یەکگرتووەکانـدا دەربـارەی ولاتـانی ئـەوروپای خـۆرەلات و باشـور. نوسـەر و سەرپەرشـتیاری زنجـیرە کـاری کۆمـۆنیزم و شـۆڕش، پێداچـوونەوەی مێـژووی روسـیا، وەرچـەرخانی کۆمـەڵگای روسـی، روسـیا لـە سـەرەتای جـەنگ و شۆڕشـدا، هـەروەها ئەوروپای سەدەی بیستەمیشە.

### سەرچاوە

***MODERNIZATION***

***The Dynamics of Growth***

***Edited by: Myron weiner***

***New York-London***

***pp. 17-28***

# وێستگەکانی سەردەم

## سڵاو ئەی خەم،
##ماڵئاوا فرانسواز ساگان

بە بۆنەی کۆچی دوایی (فرانسواز ساگان)ەوە

ئازاد بەرزنجی



لە 9/24ی ئەمساڵدا و لە نەخۆشخانەی هۆنفلۆر لە خۆرئاوای فەرەنسادا، ژنە ڕۆماننووسی ناوداری فەرەنسا "فرانسواز ساگان" لە ئەنجامی سەکتەی دڵەوە کۆچی دوایی کرد.

ساگان کە لە ساڵی 1935دا لە کجارك (لە باشووری فەرەنسادا) هاتە دونیاوە و لەو شەست و نۆ ساڵەی تەمەنیدا چەندەها ڕۆمان و شانۆنامەی نووسی و لەم ڕووەوە چ لە نووسین و چ لە ژیانیدا خاوەنی ڕۆحێکی دەوڵەمەند بوو.

فرانسواز ساگان یەکێکە لەو نووسەرانەی کە پاش ساڵانی دووەم جەنگی جیهانی هاتە مەیدانی ڕۆماننووسینەوە و یەکەم ڕۆمانی "سڵاو ئەی خەم" (1954) کە لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا بە چاپی گەیاند بووە مایەی ناوبانگێکی گەورە بۆی و بۆ چەندەها زمانی تر تەرجەمە کراو دەرهێنەری سینەمایی "ئۆتۆپریمنگەر" بۆ سینەما دەریهێنا و لەو سەردەمەدا بووە یەکێك لە ڕۆمانە درەوشاوەکان و ساگان چووە ڕیزی نووسەرە بوونگەراکانەوە.

تەوەری زۆربەی ڕۆمانەکانی ساگان بە دەوری تەنیایی و خۆشەویستیدا دەسووڕێتەوە لە کۆمەڵگای بۆرژوادا. یەکێك لە سیفەتەکانی ساگان لە ژیانیدا دەستبڵاویی بوو هەر ئەمەش وای لێکردبوو بەر لە چاپکردنی ڕۆمانەکانی، پێشتر پاداشتەکانیان وەربگرێت و خەرجی بکات. هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی لە کۆتاییەکانی ژیانیدا بکەوێتە ژێر باری قەرزەوە، تاوای لێهات کرێی ئاپارتمانەکەی شك نەدەبرد و چووە لای هاوڕێیەکی و هەر لە ماڵەکەی ئەویشدا کۆچی دوایی کرد.

ساگان (کە ئەم ناوەشی لە پاڵەوانێکی ڕۆمانەکەی مارسیل پرۆست "گەڕان بە دوای زەمەنی لە دەستچوودا"وە وەرگرتووە) هەر لە سەرەتای لاوێتییەوە کیژێکی یاخی بوو، لە ژیانیدا و لە نووسینەکانیشیدا ڕاستگۆیی و جۆش و خرۆشێك هەبوو بۆ ژیان. یەکێك بوو لەو سەد ژنە فەرەنسیەش کە داوایەکیان ئیمزا کرد بۆ دانانی یاسایەك کە ڕێ لە "لەباربردن" نەگرێت و بەشێوەیەکی یاسایی ڕێی پێبدات. ئەوەبوو دواتر ئەمە بە هەند وەرگیراو لەو بارەیەوە یاسایەك دەرکرا.

دەشێ ساگان لە ڕیزی گەورە نووسەرانی ڕۆمان و پێشڕەوانی ڕۆمانی نوێی فەرەنسیدا نەبێت، بەڵام نکووڵی لەوە ناکرێ کە ئەو خۆی بۆ خۆی لە نێوەندی ڕۆشنبیریی فەرەنسیدا حاڵەت و دیاردەیەکی تایبەتی بوو. ئەو هەر لە سەرەتاوە خۆی لە کۆتی دەسەڵاتی پەتریارکیەت ڕزگار کردو لە قوتابخانەیەکی ئایینی دەرکراو، تەنانەت کاتێکیش چووە زانکۆی سۆربۆن بۆ خوێندنی ئەدەب، ئەوەندەی پێ نەچوو لەو فەزا ئەکادیمییەش ڕای کرد. بەڵام هەر لەو ڕۆژانەدا خوێنەرێکی جیددیی ئەندرێ

ژید و ئەلبێر کامۆ و سارتەر و ڕامبۆ و پرۆست بوو.

ئەمە جگە لەوەی کە بە قووڵی کەوتبووە ژێر کاریگەریی "دەروشانەوەکان - اشراقات"ی ڕامبۆوە، کە ناوی نابوو "جوانیی سەر زەوی". هەروەها بەکارەکانی مارسیل پرۆست سەرسام بوو و دەیوت کە ئەو "هەمووشتێکی فێرکرد"، هەر لەمەشەوە بوو کە ناوی پاڵەوانێکی ئەوی "ساگان"ی بۆ خۆی هەڵبژاردو لە بری ناوی بنەماڵەکەی واتە (کوارێز) داینا.

بەمجۆرە ساگان گەرچی هیچ زانکۆیەکی تەواو نەکرد، بەڵام هەر زوو پێگەی خۆی لەناو ئەدەبی فەرەنسیدا دۆزییەوە و ڕۆمانی "سڵاو ئەی خەم"ی بە ملیۆنەها دانەی لێ فرۆشراو بووە نوێنەری خەمەکانی نەوەکەی، ئەوەی نوێی فەرەنسای پاش دووەم جەنگی جیهانی. گەرچی ساگان لە ڕووی هونەری ڕۆمانەوە ناگاتە ناتالی ساروت و مارگریت یۆرسنار و مارگرێت دۆراس، بەڵام ئەمانە هیچیان نەیانتوانی هێندەی ساگان گوزارشت لە ڕۆحی نەوەکەیان بکەن و ئەو خوێنەرە زۆرەی ئەویان هەبێت.

نووسین لای ساگان هاوتای ژیانە، ساگان هیچ لافێکی بە نووسینەوە لێ نەئەدا و بانگەشەی بۆ هیچ تیۆرەیەك نەدەکرد. لە ساڵی 1960دا ئەو بەیانەی ئیمزاکرد کە دژ بە جەنگی جەزائیر بوو، لە ئایاری 1968یشدا وەکو زۆربەی ئەدیبەکانی هاوڕێی چووە سەر شەقامەکان و بەشداریی خۆپیشاندانەکانی کرد.

بەمجۆرە ژیانی فرانسواز ساگان نموونەی ژیانێکی پڕ چالاکی و یاخیبوون و جموجووڵ بوو، ژیانێکی دەوڵەمەندانە، بەڵام لە هەشتاکانەوە کە وردە وردە ئەستێرەی ناوی بەرەو ئاوابوون دەچوو و خوێنەرەکانی ڕوو لە کەمبوون بوون، ژیانیشی بەرەو قەیران و تەڵەزگە و هەژاری چوو. بەڵام هەموو ئەمانەش ڕێیان لەوە نەگرت کە سەرۆکی فەرەنسا "ژاك شیراك" بەوپەڕی خەمگینییەوە بڵێت کە بە مردنی فرانسواز ساگان، فەرەنسا یەکێك لە ڕوخسارە دیارەکانی و لە نووسەرە دەروشاوەکانی و هەستیارترینیانی لە دەستدا.

# چیخۆف..
# 100 ساڵ لە نەمریدا

ڕەووف بێگەرد



ئەمساڵ یادی سەدساڵەی دوا کۆچی نووسەری داهێنەری ڕووسی ئەنتۆن پاڤلۆڤیچ چیخۆف (1860-1904)ە، بەداخەوە ئێمەی نووسەرانی کورد، چ وەك خۆمان یان وەك دەزگاکانی ڕووناکبیریی و ئەدەبی، یان لەسەر ئاستی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی تایبەتن بە ئەدەب و کلتوورەوە، لە ئاست ئەم جۆرە بۆنانەدا خەم سارد و بێ هەڵوێستین. نەوەك خەڵکانی دی دەتوانین یاد لە خودی ئەو مرۆڤە مەزنانە و پەیامی پیرۆزیان بکەین و کۆڕ و میهرەجانی چەند ڕۆژەیان بۆ ساز بدەین. نەوەك تاکە کەسیش کتێب و لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکەین و کارە ناوازەکانیان وەربگێڕینە

سەر زمانەکەمان و نەوەی نوێیان پێ بناسێنین. لای ئێمە ئەو مامۆستا و پسپۆڕ و زمانزانانەی چەند ساڵێك لە سۆڤیەت ژیان و بڕوانامەی ئەدەبییان لە زانکۆکانی ئەوێ وەرگرتووە و خۆیشیان نووسەر و ئەدیب بوون کەم نین، ڕەنگە زۆر جار سەردانی ماڵ و مەزار و کتێبخانەی چەندانی وەك چیخۆف و پۆشکین و دیستوفسکی و گۆرکی و تولستوی و تورژنێفیان کردبێت و یادوەری ئەودیدەنیانەیان لای خۆیان تۆمار کردبێت، یان ئاگاداری ئەو سمینار و کۆنگرانە بن کە هەر لە خودی سوڤیەتدا بۆ ئەو بۆنانە سازدراون و ئەو چاپەمەنیانەی خۆیان بۆ ئەو مەبەستە بە جوانترین بەرنامەی کار و داهێنان و زانیاری تازە و لێکۆڵینەوەی نوێوە تەیار کردووە، نابێت لێرەدا ناوی قەڵەمێکی ڕەسەنی وەك جوانەمەرگ (جەلال تەقی) نەبەم کە دوور لە پسپۆڕیەکەی خۆی وەك ئەندازیاری بیناسازی چەند بەرهەمێکی شیاوی چیخۆف و دیستوفسکی و گۆگۆڵ و پوشکینی لە رووسیەوە بۆ کردوینەتە کوردی.

زۆرن ئەو نووسەرانەی سۆڤیەت کە تا ئێستا ئامادەگیەکی زیندووی ناو کلتووره جیاوازەکانی دنیان و بەردەوام خوێندنەوەی تازەیان بۆ دەکرێت و کارەکانیان چاپ دەبێتەوە و شانۆکانیان بە زۆر شێوازی جیا نمایش دەکرێتەوە. کەچی لای ئێمە کارو بەرهەمی هەندێك لەو نووسەرانە تا ئێستایش ڕێگای نمایشکردنی نەکەوتۆتە کتێبخانەی کوردییەوەو گەلێك خوێنەرمان هەیە کە زمانی تر نازانێت چاوەڕێی قەڵەمی وەرگێڕ و زمانزانەکانە. من لە ساڵی (1980)دا بە بۆنەی یادی سەدوبیست ساڵەی لەدایکبوونی ئەم نووسەرە داهێنەرەوە کتێبێکی 139 لاپەڕەییم هەر بە ناوی (ئەنتۆن چیخۆف)ەوە بڵاوکردەوە کە بریتی بوو لە پێشەکیەکی درێژ لەسەر ژیاننامە و کارنامەکانی نووسەر و ڕێبازی نووسین و ئەو هەل و مەرجە سیاسی و ئابووری و فیکریانەی کاریگەریان لەسەر کارو داهێنانی بووە، ئەو پێشەکیە تا ڕادەیەك ناساندنی چیخۆف بوو بە خوێنەری کورد و دەربڕینی خۆشەویستی و ڕێزی زۆری خۆیشم بوو بۆ ئەو ناوە پرشنگدارەی کە هونەری کورتە چیرۆك قەرزاریەتی و مرۆڤایەتیش دەستی ستایش بۆ بیر و بۆچوونەکانی بەرز دەکاتەوە، هەر لەو کتێبەدا شەش چیرۆکی دەگمەنی چیخۆفم لە فارسییەوە کردبووە کوردی کە تا ئەو کاتە زوربەیانم بە عەرەبی نەخوێندبووەوە، ئەمەیشیان لەو هەستەوە کە خوێنەری ئێمە زیاتر بە زمانی عەرەبی شارەزایە وەك فارسی. کتێبەکە دەبوو ساڵی 1980 بەو بۆنەیەوە بڵاو بکرایەتەوە، بەڵام دەستی ڕەقیب و خەم ساردیی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی ئەوسا تا ساڵی (1984) گیریداو لەو ساڵەدا بڵاوکرایەوە.

ئەم ساڵ لەم بۆنەیەدا لە زوربەی پایتەختەکانی دنیا و گەلێ شاری تردا یادی دوا کۆچی چیخۆف بەرزو پیرۆز ڕاگیرا. یونسکۆ ساڵی (2004)ی بە ساڵی چیخۆف ناوزەد کرد، چونکە تا ئێستا بەرهەمەکانی بە هەموو زمانی دنیا دەخوێنرێتەوە و شانۆگەریەکانی نمایش دەکرێن و وەرگێڕانی کارەکانی بەردەوامە. لە وڵاتەکەی خۆیدا ئەم بۆنەیە بە ئاهەنگ و ڕێوڕەسمی جیاجیا بەڕێکرا، لە

ئۆکرانیا کە خودی چیخۆف ماوەیەك لە شاری یالْتا ژیاوە ئاهەنگ سازکرا، لە ئەڵمانیادا کە چیخۆف دوا ڕۆژەکانی تەمەنی بە نەخۆشی لەگەڵ (ئۆڵگاکنیبەر)ی هاوسەریدا لە شاری (بادن ڤایلەر) بەسەر برد، ئەو ئوتێلەی لێی دابەزیبوو جارێکی دی چاککرایەوە و کارە وەرگێڕاوەکانی بۆ زمانی ئەڵمانی پیشاندرا، لە شاری (تاگانرۆگ) کە شوێنی لەدایکبوونیەتی، لە ڕۆژی چواردەی یولیودا هەر لە بەیانیەوە لە کڵێسەکانی ئەو شارەدا دروود بۆ گیانی نەمری ئەو گەورە نووسەرە نێردراو، دانیشتوانی گوندەکەی چەپکە گوڵیان لەبەر پەیکەرەکەیدا دانا، لە ماڵەکەی چیخۆفدا کە کراوەتە مۆزەخانە ئاهەنگێك کراو. هەندێك لە نامەکانی و یاداشتی لەگەڵ ئۆڵگا کنیبەردا پیشاندرا، شانۆگەریی (خانم و سەگەکەی) کە لە چیرۆکێکی کورتی خۆیەوە ئامادە کرابوو نمایشکرا. لە مۆسکۆی پایتەختدا ڕۆژنامە ئەدەبی و سیاسیەکان وتاری بەنرخیان لەسەری بڵاوکردەوە، گەورە پسپۆڕانی ئەندازیاریش نەخشەیەکیان بۆ ماڵی شانۆی مۆسکۆ لەسەر (65) هەزار مەتری چوار گۆشە لەسەر شەرەڤی چیخۆف دامەزراند کە گەلێك هۆڵی نمایش و مۆسیقای تیایە، لە گۆڕستانی (نوڤ دیڤتیش) کە گۆڕی چیخۆڤ لێیە خەڵکانێکی زۆر بە چەپکە گوڵەوە سەری مەزارەکەیاندا. هەر لەسەر شەرەڤی چیخۆف لە گوندی (میلیکوفا) کە نزیکە لە مۆسکۆ و حەوت ساڵ نووسەری تیا ژیاوە و چاکترین بەرهەمی شانۆیی خۆی وەك "مەلی دەریا" و چیرۆکی "راهیبی رەش"ی تیانووسیوە. بەردی بناغەی پەیمانگایەکی نوێی شانۆ دانرا. هەر لە مۆسکۆ زوربەی شانۆگەریەکانی نمایشکرانەوە، لە شاری "ساماری"یش پەیکەرێکی نوێی بۆ دروست کرا، ئەگەرچی چیخۆف لەم شارەدا نەژیاوە و نەیشی بینیوە، بەڵام ساڵی 1898 کە نەهاتی و قات و قڕی ڕوو لە شارەکە دەکات، چیخۆف هەوڵێکی بێ وێنە بۆ ڕزگارکردنی منداڵە برسیەکانی دەدات و سەدان منداڵە جووتیار لە چنگی مەرگ دەسێنێتەوە.

چیخۆف لە ئەدەبی ڕووسیدا ناوێکی هەرە درەوشاوەی دنیای کورتە چیرۆك و شانۆیە. یەکێکە لەو سێ ڕابەرەی کە بناغەی چیرۆکی کورتی هونەریان دامەزراند (ئەدگار ئالان پۆ، جی دی مۆباسان، ئەنتۆن چیخۆف) بەڵام جیاوازیی چیخۆف لە دوانەکەی تر ئەوەیە کە ئەم مەبەستی چیرۆکی لە دنیای خەیاڵی ڕووت و ڕووداوی پڕ لە سەمەرە و هونەری بایەخدان بە گرێ و لووتکەوە گوێزایەوە بۆ ناو هەقیقەتی ژیان و واقیعی کۆمەڵگەکەی کە لێوان لێو بوو لە تراژیدیا و کارەساتی هەرە تاڵ و دەگمەن. نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە کە زۆربەی نووسەرە گەورەکانی ڕووسی بەبەرهێنا، سەدەی چەوسانەوەی جوتیار و کرێکار و مامۆستا و پزیشك و مووچە خۆر و ڕووناکبیرانە. جوتیار کۆیلەی زەوی و نۆکەری دەرەبەگ و کۆنەپەرست، لە ناو سستمێکی دواکەوتوی تزاریدا چ خەونێکی مرۆڤایەتیانەی نەدەهاتە دی، مامۆستاکانی گوند پێش بڕکێی مەرگی ناوەختیان لەگەڵ نەخۆشیی سیل و نەبوونی و کەم مووچەییدا دەکرد، وەك خۆدی چیخۆف لەم بارەیەوە بە مەکسیم گۆرکی دەڵێت: ".. مامۆستاکانی لای ئێمە کرێکارن، ڕووناکبیریان کەمە، کە مامۆستا دەنێرن بۆ فێرکردنی منداڵانی گوند وەك بۆ تاراوگەی بنێرن وایە، مامۆستا

برسیە، غەمبارە، لە تیکەنانەکەی دەترسێت.. پۆلیس و فرۆشیاری دەوڵەمەند، کوێخا و بەڕێوەبەری قوتابخانە و بەڕێوەبەری ناحیە، هەموو ئەمانە سووکایەتی بە مامۆستا دەکەن.. ئەو کەسەی پەروەردەکردنی گەلی پێسپێراوە گەمژەییە مووچەی کەمی بدەیتێ، نابێت بەوە قایلبین مامۆستا بەرگی دڕاو بێت، لە قوتابخانە سارد و رووخاوەکەیدا لەسەرما هەڵبلەرزێت و دووکەڵی زۆپا خراپەکان هەڵمژێت. لە تەمەنی سی ساڵیدا نەخۆشی سنگ و روماتیزم و سیل بگرێت. ئەمە ئابڕوو چوونە..) پاشان چیخۆف زۆر بە سۆزەوە بە گۆرکی دەڵێت: "کە مامۆستایەك بەو جۆرە دەبینم من تەریق دەبمەوە".

نووسەر و رووناکبیران لەناو شپرزەیی ئەو جیاوازی چینایەتی و تەوژمی چەوسانەوە و نا سەقامگیری باری سیاسی و ئابووریەداو لە ئەنجامی تێکشکانی هەندێك لە بزوتنەوە چاکەخوازەکانی ئەو سەدەیەدا، نا ئومێد ببوون و سەریان کردبووە سەر بێهودەیی و کات بەفیڕۆدان و پشتگوێ خستنی دەوری کاریگەری خۆیان، بەرجەستەکردنی ئەو دۆخە سیاسی و هەلومەرجە نا سروشتییە لە گەلێك کاری گۆگۆل و تورژینیف و چیخۆف و دیستۆفسکی و تۆلستویدا رەنگیان داوەتەوە.

چیخۆف لەناوجەرگەی ئەو گەرداوە پڕ لە تەوژمەدا، لە 17ی کانوونی دووی ساڵی 1860دا لە شاری (تاگانرۆگ)ی سەر دەریای ئازۆف لەدایك بوو، باپیری کۆیلە بوو، باوکی چیخۆف لەگەڵ هەر پێنج منداڵەکەیدا دڵرەق و ستەمکار بوو، باشترین نموونەی منداڵی چیخۆف و خوشك و براکانی لەم دیمەنەدا دەردەکەوێت کە خۆی وێنەی کێشاوە: "کوڕی بەندەیەك کە لە دووکانی باوکیدا وردە فرۆشی دەکات، هەمیشە بە ڕێی کلێساوەیە، بە پێی پەتی گەڕاوە، لەناو دوو ڕوویی گەورەکاندا پێگەیشتوە، دەستی قەشەی ماچ کردوە و ئازاری بە گیانداران گەیاندوە، زۆر جار دارکاری کراوە، بێ لێکدانەوە بیروڕای خەڵکی وەرگرتوە، دوو ڕوویی بەرانبەر بە خواو خەڵکی کردوە".

لای چیخۆف مرۆڤ بە هەموو ڕەهەندەکانی ژیان و گوزەران و بیروباوەڕیەوە تەوەریی گشتی مەبەست و بەدیهێنەری چالاکیەکانە، وەك خۆی دەڵێت: "پیرۆزترین شت لای من مرۆڤە، ئەوەی مەبەستمە بۆ مرۆڤ بێتە دی: زرنگی، تەندروستی، بەهرە، خۆشەویستی، ئازادی و رزگار بوونیەتی لە زۆر و ستەم".

چیخۆف وەك مرۆڤ و وەك پزیشك بەردەوام لە هاوکاری کردنی کەسانی هەژار و گوندنشینانی بێ دەرامەت و جوتیاراندا بووە، ڕۆژانە دەیان نەخۆشی بینیوە و چارەسەری کردوون و پارەی لێنەسەندوون، هەر لە گوندی میلیکوفا بە پارەی خۆی قوتابخانە و خەستەخانەیەك دروست دەکات. وەك لە هەندێك چیرۆکیدا ژیانی تایبەتی خۆی و هاوپیشەکانی دەردەکەوێت پزیشك ڕێزی گەورەی نە لە ناو کۆمەڵداو نەلای فەرمانڕەواکانی ئەوسا نەگیراوە و وەك کرێکارێك لێیان ڕوانیوە کە دەبێت هەمیشە خۆپڕوکێن بێت و لە ناوەختا حەسانەوە و خەو و ژیانی تایبەتی خۆی بکاتە قوربانی ئەوانی دی. بە تایبەتی دەرەبەگ و ئەرستوکراتیەکان.

تێکەڵی چیخۆف لەگەڵ جوتیار و مامۆستا و نەدارەکانی تردا تاڕادەیەك بووە کە هەمیشە چووەتە لایان و ئەوانیش

دیدەنیان لێکردووە. گوێی لێگرتوون و لە بارەی ژیانی تایبەتی و گەلێك باس و خواسی روناکبیری و سیاسیەوە لەگەڵ مامۆستایاندا دواوەو باری سەرنجی خۆی پێ وتوون (لە دیدەنیەکدا کە مەکسیم گۆرکی بۆ گوندی "کۆشکوك کوی" کردوویەتی کە ئەوسا چیخۆف لەوێ بووە بە درێژی گۆرکی باس لەو جۆرە دانیشتنانە دەکات کە چیخۆف لەگەڵ دانیشتواندا کردوویەتی و ئەویش بەشداری تیا کردووە) چیخۆف پێش مردنی بەسێ ساڵ ئەم راسپێریانەی بۆ ماشای خوشکی کردووە کە نموونەیەکی زیندوە لە گیانی خۆشەویستی و مرۆڤ دۆستی و بەتەنگەوە هاتنی بەرژەوەندیی گشتی.

"ماشای ئازیزم، تۆ هەتا ماویت بۆت هەیە سوود لە ماڵەکەی یاڵتام و لەو دەرامەت و پارانە وەربگرێت کە دەستکەوتی دراماکانمە. ماڵەکەی گورتسوف و پێنج هەزار رۆبل بۆ ئۆڵگای هاوسەرم. ئەگەر ویستت خانوبەرەکانیش بفرۆشە، سێ هەزار بدەرە ئەلەکسەندەری برامان، ئیڤان پێنج هەزار، میخائیل سێ هەزار، ئەلیکسی دوتشینکو هەزار و ئەلیناتشیکوف کە شووی کرد هەزار روبڵ، دوای مردنی خۆت و دایکم هەموو موڵکەکان بێجگە لە دەرامەتی شانۆ دەدرێتە بەڕێوەبەری شارەوانی لە شاری تاگانروگ بۆ راژەی فێرکردنی گشتی، بەڵام دەستکەوتی شانۆگەریەکان دەدرێتە ئیڤانی برامان، دوای مردنی ئەویش دەدرێتە بەڕێوەبەریەتی شارەوانی لە تاگانرۆگ بۆ هەمان مەبەستی پێشوو، بەڵێنم بە جووتیارەکانی گوندی میلکوفا داوە کە سەد رۆبڵیان بدەمێ بۆ چاککردنی رێگای گشتی، بەڵێنم بە جافریل ئەلیکسیفتش کرتشنخو داوە کە خەرجیی کچە گەورەکەی تا دواناوەندی تەواو دەکات لەسەر من بێت، یارمەتی هەژاران بدە و چاوت لە دایکم بێت و بەخۆشی بژی.

ئەنتون چیخۆف

3ی ئابی 1901

دەربارەی چیخۆف گەلێك نووسەری گەورە دواون و پلەی ئەدەبی ئەویان هەڵسەنگاندووە و دەورو کاریگەریان لەسەر رەوتی ئەدەبی، بە تایبەتی کورتە چیرۆك و شانۆ نامەکانی بەرز نرخاندووە، تولستۆی یەکێك بووە لە دۆستە خۆشەویستەکانی و زۆر جار یەکیان دیوە و بە چیرۆکەکانی چیخۆف سەر سام بووە، لە بارەیەوە دەڵێت: "چیخۆف هونەرمەندێکی بێ وێنەیە، هونەرمەندی ژیانە، نرخی داهێنانی لەوەدایە کە تێیدەگەیت و پەسەندی دەکەیت، ئەمە نەك تەنیا یەکێکی رووسی، بەڵکو لای سەرجەم مرۆڤایەتی"

هەروەها دوای مەرگی چیخۆف تولستوی دەڵێت: "چیخۆف شێوازێکی نوێی هونەری نووسینی بۆ گشت جیهان دروست کرد، من ئەو جۆرە نووسینەم لە هیچ شوێنێکی تردا نەبینیوە، دوور لە هەر خاکیەکی ساختە، بە دڵنیاییەوە دەڵێم کە چیخۆف زۆر لە من پلە و پایەی بەرزترە"

بەرناردشۆی نووسەری دیاری ئینگلیزیش لە بارەی شانۆگەریەکانییەوە دەڵێت: "چیخۆف وەك ئەستێرەیەکی پرشنگدار لە ناوەڕاستی گەورە شانۆ نووسانی ئەوروپادا دەدرەوشێتەوە"

مەکسیم گۆرکیش لە نامەیەکیدا کە بۆ چیخۆڤ نووسیوە دەڵێت: "گەلێك کاتی خۆشم لەگەڵ بەرهەمەکانتا بەسەر بردووە، زۆرم فرمێسك بە

دیاریانـــەوە ڕشـــتوە" کـــە شـــانۆگەریی "خـــاڵ ڤانیـــا" دەبینێـت دەڵێـت: "دوێـنێ خـاڵ ڤانیـام بـینی، کـە بینـیم وەك ژن گریــام، هەرچـــەندە مــن لــە سۆزیشــەوە دوورم" ئەگەرچــی چـیخۆف لـە نووسـینی هـەموو بابەتە ئەدەبیەکانیدا سەرکەوتوو بـــووەو زۆر نووســـەر گوێیـــان لێگرتــووە و لێــوەی فێربــوون و لەگەڵ بەهرەمەندترین نووسەری ئـەو سـەردەمەدا نـاوی هـاتووە، کەچی ئـەو هـەرگیز پیاهەڵـدان و ناو هێنانەکانی خۆی لا مەبەست نــەبووە و خـــۆی بـــە داهێنـــەر نـــەزانیوە و ئـــارەزووی لـــە خۆدەرخســـتن نـــەبووە. لـــەو بارەیـەوە دەڵێـت: "مـن لـە چـاو نووســـەرە ســـەرکەوتوەکانی روســـیادا زۆر بـــێ بایـــەخم، کۆمیدیایـــــەکم نووســـــی، تاڵەموویـەکی لەسـەرم نەبزواند" کـە پێـی دەڵـێن ئـەو لـە ریـزی پێشـــەوەی نووســـەرانی ئـــەو ســـــەردەمەیە. ئامـــاژە بـــۆ (چایکوفسکی) دەکات و دەڵێت: "لــە پوترســبورگ و مۆســکۆدا، دوای تۆڵســـتۆی نـــاودارترین نووسەر چایکۆفسکیە، بەڵام من لە ناوبانگا بە پلەی 877 دێم)

ژیـــانی تایبـــەتی چـــیخۆف تراجیدیایەکە فرمێسك لـە چاودا ڕادەگرێـــت، بـــەڵام بەرهەمـــە ناوازەکانی بەرەو ڕووی ژیانێکی خۆشــترت دەبــەن. لەگــەڵ ئــەو تەمەنـــە کورتەیـــدا (44) ســـاڵ دەزگایـەکی بڵاوکردنـەوە بـوو بـۆ خـۆی، ویسـتوویەتی ئـەوەی لـە دەسـتی دێـت و لـە بەرژەوەنـدی خەڵکانی تردایە زوو بیگەیەنێت، وەك لەوە بێگومان بێت کە مـەرگ زوو بەرۆکی دەگرێت و ئەوەی بە نەمریی دەیهێڵێتـەوە تـەنیا ژیانە هـەرە جوانەکـەی خۆیـەتی کـە بـۆ بەختەوەری مرۆڤایـەتی تـەرخانی کردووەو، بەرهەمە ناوازەکانیەتی کە بۆ هـەموو سـەردەم و نـەوەکان خـۆ تـازە دەکەنـەوە و خـەون و ئارەزووەکـــانی مرۆڤیـــان تیـــا بەرجەستە دەبێت.

ســـــاڵی 1904 کـــــە نەخۆشیەکەی تـەواو برسـتی لـێ دەبرێت ئۆڵگا کنیبـەر دەیبـات بـۆ ئەڵمانیا و لە شاری (بادن ڤێڵـەر) ماوەیــەکی کــەم دەمێننــەوە، تــا لەبەرەبەیانێکـــدا کـــە تـــازە سروشـــت چـــاوی ڕوونـــاکیی دەکاتـــــەوە، مەلـــــەکان گۆرانیی ماڵئاوایی دەڵێن، زەنگی کڵێسە دوورەکە بەدەم شەماڵەوە شــەپۆل دەدات، مــرۆڤ هێــورە. جـوانی و بێـدەنگی و مـەرگێکی نــاوازە بــاڵی بەســەر هــەموو شــتێکدا کێشـــاوە، چـــیخۆف مـەزنیش بـۆ دوا جـار چـاولێك دەنێت.

**سەرنج:**

بــۆ ئــەم نووســینە بێجگــە لــە زانیــاری و ســەرنجی خــۆم کــە لــە ئــەنجامی خوێندنـــەوەی زۆری بەرهــــەمی چــــیخۆف لام ماونەتەوە:

1–کتێبی ئەنتۆن چیخۆف. ڕەووف بێگەرد .1984

2–اخبـــار الادب. پاشـــکۆی ڕۆژنامـەی الاخبـاری میسـری ژمارە 583 ســـبتمبەری 2004 کـــە ژمارەیـەکی تایبەتـە بـە چـیخۆف و یادەکەی.

## هونەر سەلیم لە "چەکی باوکم"دا

شۆڕش و چیاو منداڵیەکی وێڵ

خالد سلێمان

لە عەرەبییەوە: سەردەم



کارەســـــــــات و ڕووداوە خێراکـانی سـەدەی بیسـتەم لـە کوردستاندا بواری بۆ نووسەری کـورد نەهێشـتەوە تـا ئاوڕێـك لـە دواوە بداتـــەوە و، لەســـەر ئـــەو مۆڵگە خەمانەی کورد بنووسێت کە نە ئەدەب و ڕووناکبیری و نە سیاسەتیش نەیاندەتوانی پیێ بە پێـی هــەنگاو بنـێین. هەرەسـی شۆڕشــەکانی شـــێخ ســـەعیدی پـــیران و شـــێخ مـــەحموودی حەفیـد و کۆمـاری مـەهاباد و لـە سـێدارەدانی قـازی محەمـەد لـە نیوەی یەکەمی ئەو سەدەیەدا و، ڕێککەوتن نامەی جەزایری ساڵی 1975 و پرۆســەی قڕانکردنـــی "ئەنفال"ی ساڵی 1986 یەك بە دوای یەکدا هاتن.

بـــە دووی یەکـــدا هـــاتنی کارەسـاتە جگـەر بڕەکـانی دوای شـۆڕش و خەونـەکان، هـەر لـە سـەرەتای سـەدەکەوە بیگـرە تـا کۆتایی پێوانەیەکی بۆ پەیوەندی و پێکـەو گونجـانی نووســەر و واقیـع دانـا، بـارودۆخێکی هێنـد ئازاد لـە گۆڕێـدا نـەما بـۆ بەرهـەم هێنانی زێدی خـەون و ئازادیـە – چــاوەڕوانکراوەکان– و وێنــەی منـدالآنی شـۆڕش ئەوانـەی بـەو هۆیـەوە منداڵیـەتی خۆیانیـان لـە دەستدا، بەوەیش هـەموو وێنـە و تراجیـدیاکانی ژیـانی ڕۆژانـەی خــەڵکیی کەڵەکـەبوون و بوونــە ڕەگــەزی ســەرەکیی خەونــەکان، دوای ئـــەوەی ســـتەم و زوڵمـــی ســـــتەمکاران گەیاندبوویانـــــە ســــــنووری پێشـــــێلکردن و لەناوچوون.

دەرهێنەری سینەمایی هونەر سەلیمی کورد، لە فەرەنسا دەژی و لـــە میهرەجـــانی ســـینەمایی ڤینیســـــیای ســـــاڵی 2003دا خـــەلاّتی ســـان مـــار مـــارکوی وەرگرتـووە، ئـەم هونەرمەنـدە لـە ســـالآنی شەســـت و حـــەفتای ســـەدەی پێشـــودا بەشـــداریی شۆڕشی کوردی بە سەرۆکایەتی خوا لێخۆشبوو مستەفا بارزانی کـردووە. پـێش شـەڕی عێـراق ئێـران لـە وڵات دەرچـوە، خـەونی بـەوەوە دیـوە تەلـەفزیونێك بـە زمــــانی کـــــوردی بـــــدوێت و مامۆستایەك ئـەلفبای ئـەو زمانـە بڵێتـــەوە. هـــەموو ئازارەکـــانی منداڵیی خۆی داوەتە کوڵی و لە دەست دەنگی تۆپ و فڕۆکە و بە تەنگ هێنانی ڕۆژانەی سیخوڕ لە شـارە چـکۆڵەکەی "ئـاکرێ"وە دەرباز بووە.

### ڕۆمانی کوردی بە فەرەنسی

لە ڕۆمانی "چەکی باوکم" کە لە بنکەی بڵاوکردنـەوەی Seuil ی فەرەنســی لــە پــاریس و لــە ســەرەتای ئەمســاڵدا چــاپکراوە، هونــەر ســـەلیم چـیرۆکی خـــۆی لەگەڵ چەکەکەی باوکی و چیا و ئەو خۆشەویستیانە دەگێڕێتەوە کە هەر لە سەرەتاوە لەبار براون. نووســەر لــە ســەرەتاوە بــاس لــە نامۆییەکی مێژوویی و گەشتێکی ئاشنابوون دەکات لەگەڵ چەك و ئـەلفباو نـاو و وێنــەدا. بـاپیری کـورد بـوەو لـە خـاکی کـوردا لـە دایـك بـوەو کـە عوسمانیـەکان هـــاتوون پێیـــان وتـــووە تـــۆ عوسمانیـــــت، پاشـــــان کــــە ئیمپراتۆریـــــەتی عوسمــــــانی ڕووخـــاوە بـــە تـــورك بوونیـــان بەسەردا سەپاندوە.

کـــە تورکـــەکان ڕۆیشـــتوون "سەلیم مەلایی" باپیری هونەر لە ژێر سایەی مەملەکەتەکەی شێخ مــەحمودا کوردایەتیەکــەی بــۆ گەڕاوەتـەوە. بـەلاّم ئینگلیزەکـان هــاتوون و بـــووە بـــە ئینگلیـــز. هەنـدێك وشـەیان فێـر بـووە، کـە ئینگلیزەکـــان چـــوونەتە دەرێ "مەلایی" بوەتە عێراقی بێئەوەی بزانێت مانای ئەم "عیراق"ە چییە و وەك مەتـــەڵێك بـــووە لای، بـــەم ناوەوە نەنازیوە هەروەها "شێرو مەلایی" کوڕی و ئازاد کە هێشتا منداڵ بووە.

قۆنـاغی لـە دنیـا گەیشـتن لـە ئـــازادی بچـــووکەوە دەســـت

پێـــدەکات لــــە چــــیاو نـــاو پێشـــــمەرگە و مــــاڵ و بنکــــە قوڕینەکاندا، ئەوسا رادیو تەنیا هۆیەکی گەیاندن بووە، خەونی گەورەی باوکی ئەوەبووە چەك و کیسە تووتنەکەی هەڵبگرێت و چاوەڕێی ڕزگاری کوردستان بێت. بە تایبەتی لەو کاتانەدا کە گـــوێی لــــە رادیـــوی دەنگـــی ئـــەمریکا بـــووە کــــە نـــاوی "شۆڕشگێرانی کورد"ی هێناوە، زۆریش لەوە بەداخ بووە کە ڕادیۆی موسکو پێی وتوون "یاخیەکان"

کەسایەتی ئازاد لەناو ژووری شێداردا گەلاڵە بوە کە پڕ بووە لە خەون و چاوەڕوانی و سروودی شۆڕشــگێڕی. لـــە دەرگایـــەکی والاوە چــــوەتە نــــاو دنیــــای گەورەکانەوە و هەموو وێنە و وشەکانی کۆکردۆتەوە کە لە بـــارەی شــــۆڕش و ئـــــازادی ئایندەیـــــــەکی نزیکــــــــەوە بیستوویەتی وەك ئەنجام شیرۆی گچـــــکە دەبێتــــــە پـــــڕۆژەی زیندوکردنەوەی یادوەریی ئەو کەسانەی کە لە چاوەڕوانیی ژیاندا مانەوە. چونکە جەنگاوەر لە ژیان نامەی خۆیدا ئەوە نابینێـــت کــــە یــــەکێکی تــــر دەبیبینێـــــــت، شۆڕشـــــــەکانی کـــــوردیش کــــە نەهامـــــەتی جوگرافیـــاو نـــەفرەتی مێـــژوو ســــەپاندونی بـــواری ئـــەوەی نەداونــەتێ لــە خــودی خۆیــان رابمێـــنن، بۆیـــە جـــەنگاوەرە چـکۆڵەکە لە هەولێی ئەوەدایە وردەکاریـــەکانی ئـــەو ڕۆژانـــە بقۆزێتـــــەوە کــــە لــــە نێـــوان تفـەنگ و شـەوانی بـە بـارانی رۆمانسـیدان. ئەمـە لـە دیـدی منداڵێکـــــەوە کــــــە شــــــۆڕش نـــــــەیتوانیوە کەرەســـــــەکانی بەرهەم بێنێت.

ئەم کێشەیەی ژیانی نووسەر لە قۆناغێکدا دەست پێدەکات کە لـە نێـوان حکوومـەتی عێـراق و بزوتنـەوەی کـوردا رێکـەوتنێك دروست دەبێت. ئەو کاتەی بۆ ماوەیــــەك ئاشــــتی دەســـــت پێـدەکات و "بـەعس" دەیـەوێت هــــەموو خــــەڵك بخەڵــــەتێنێت، لــــەو ماوەیــــەدا –ســــــەرەتای حـەفتاکانی سـەدەی رابـوردو– ئــــازاد دەچــــێتە قوتابخانــــە و تەلـەفزیون دەبینێـت، بـەڵام لـە هەردووکیانـدا هەسـتی نـامۆیی دای دەگرێت، چونکە ئەو عەرەبی نــازانێ و لــە ئــەلفبای کتــێبی ســــــەرەتایی و بەرنامـــــــەکانی تەلەفزیون تێناگات، بۆیە خەون بە شتێکەوە دەبینێت بە کوردی بپەیڤێت. بەڵام هەرەس هێنانی ئۆتۆنۆمی و گەڕانەوەی بەعس بۆ لـەناوبردنی هـەموان خەونـەکان دوور دەخەنـەوە و جـارێکی دی پێشمەرگە بچووکەکە روو لە چیا دەکا و تفەنگەکەی باوکیشی لە ژیانیـا ئامادەیـە. ئـەمجارەیان شـتێك لـە مێـژوو جوگرافیـای کوردستانی دابەشکراو و داما و فێـر دەبێـت، پاشـان نەگبەتیـە گەورەکـە دێت و "رزگارکەرەکە" هینـری کیسـنجەر لـە وادەکـانی پەشـیمان دەبێتـەوە و، سـەرۆك مەلا مستەفای بارزانی لە نێوان دوو هەڵوێستدایە یەك لەوی دی تـاڵترە. یـان خۆکوژیـــەکی بــە کۆمــەڵ لـــە بــەردەم ماشـــینە ســـــەربازیەکەی عێراقـــدا یـــان راکردن بەرەو تاراوگە.

هونەر سەلیم ئەم وێزگانە لە سـیاقی زمانێکـدا وێنـا دەکـات نزیـك بـە گێڕانـەوەی سینەمایی، خــەیاڵی منالیــەتی خــۆی وەك سەرچـــاوەیەکی وەســـــفکردنی رووداوەکان بەکار دەهێنێت. ئەو دەچێتە نێو دەقی شتەکانەوە لە رێــی نزیکــی چــیرۆکەکان بــە چوارچـێوەی ژیـانێکی خـەیاڵی کەسە ڕاستەقینەکانەوە کە بوون بە قوربـانیی خـەونی ئـازادیی و زگاربوون.

**سەرچاوە**

الحیاه 2004/8/11.

# کارل پۆپەر

لە عەرەبییەوە: سارا ئەحمەد

Karl Popper
Hacohen malachi haim
Cambridge Unversity, Press.
2003
P. 624



نوسەری ئەم کتێبە توێژەر "هاکوهین ملاشی هایم"ە، کە پسپۆڕە لە بواری فەلسەفەی زانستەکان یاخود ئەوەی لە زمانی ئەوروپیدا پێی دەوترێت ئەبستمۆلۆژیا. لێرەدا باس لە یەکێك لە گەورەترین فەیلەسوفەکانی زانست لە سەدەی بیستدا دەکات کە "کارل پۆپەر"ە.

ئاشکرایە ئەم بیرمەندە ساڵی 1902 لە ڤیەننا لە دایك بووە و ساڵی 1994 لە لەندەن کۆچی دوایی کردووە.

"پۆپەر" لە سەرەتای تەمەنی لاوییەتیدا لە زانکۆی ڤیەننا خوێندوویەتی زانیاری لە بواری فەلسەفەو فیزیا تەنانەت مۆسیقاشدا پەیدا کردووە. هەر لەو کاتەدا وەك دارتاش و کارمەندی کۆمەڵایەتی کاری کردووە، ئەمەش بۆ بە دەست هێنانی بژێوی ژیان و تەواوکردنی خوێندن بووە. دواتر لە ساڵی 1928 بڕوانامەی دکتۆرای لە بواری فەلسەفەدا وەرگرت، پاشان لە نێوان ساڵانی 1937–1945 لە زانکۆکانی نیوزلاندە وانەی وتۆتەوە. دوایی ئەوە بۆتە مامۆستا لە زانکۆی لەندەن لە نێوان ساڵانی 1945–1969، وانەی لۆژیکناسی و میتۆدی زانستەکانی وتۆتەوە. هەر لە هەمان کاتدا زنجیرەیەك لێکچەری لە زانکۆ گەورەکانی ئەمریکادا پێشکەشکردووە.

"کارل پۆپەر" لە ژیاننامەکەی خۆیدا دەڵێت: (وەك فەردێك لەسەر ئاستی خێزانیی ژیانێکی بەختەوەر ژیاوە و لەسەر ئاستی پیشەیش ژیانێکی بێ کێشەو بە بڕشتی گوزەراندووە، بەڵام بەردەوام ترسی هەڕەشەی سیاسی هەبووە و لەسەردەمێکی دژواردا ژیاوە کە دوو جەنگی جیهانی تیا ڕوویداو هەروەها سەرهەڵدانی فاشیزم و نازیزم و کۆمۆنیزمیش لەو قۆناغەدا بوو. شارەزایان پێیان وایە مەزنترین فەیلەسوفی زانستە لە سەدەی بیستەمدا، هەروەها بە فەیلەسوفێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی مەزنی دەدەنە قەڵەم.

"پۆپەر" لە بواری زانست و ئاکاردا زۆر بە توندی دژایەتی ئاقارە گومانکار و ڕێژەگەراو تەقلیدیەکانی دەکرد، وەك چۆن ڕەخنەی لە ئایدۆلۆژیا ستەمکار و تۆتالیتاریەکان گرتووە و داکۆکی لەوەش کردووە کە خۆی بە کۆمەڵگەی کراوە ناوی دەبرد.

سەرەتای خوێندنی لە زانکۆدا "پۆپەر" بۆ ماوەیەکی کورت بوو بە مارکسی، بەڵام هێندەی نەبرد بە هۆی کەشفکردنی دۆگمابوونی ئایدۆلۆژیای کۆمۆنیزمەوە، بیروڕای گۆڕی و وازی لە مارکسیزم هێنا. تەنها شتێك لە مارکسیزمدا دەست بەرداری نەبوو، ئەو بیرۆکە سەرەکیە بوو کە گرنگی بە پێدراوە ئابوریەکان و ململانێی چینایەتی و مێژوو دەدا. سەروەختێکیش "هتلەر" پەلاماری نەمسای داو خستیە سەر ئەڵمانیا، "پۆپەر" ناچار بوو ئەو وڵاتە جێبهێڵێت و ڕوو

لە شوێنێکی تر بکات، چونکە بەرەگەز جولەکە بوو.

لەبەرئەوە بەرگری لە سیستمی لیبرالی دیموکراسی دەکرد، دژی هەموو شێوەکانی سیستمی توتالیتاری بوو، ئیتر ئەو سیستمە کۆمۆنستی بێت یاخود فاشیزم و نازیزم بێت. "پۆپەر" دەڵێت: (تێروانینی مارکسیزم بۆ مێژوو تێروانێکی زانستی نییە و پێشبینیەکانی مارکس بۆ داهاتوو نەهاتنە دی.

تیۆریاکەشی کە وەك تیۆریایەکی زانستی نیشان دەدرا، هەرەسی هێناو وە گۆڕا بۆ تیۆریایەکی (درۆزنە زانستی). تەنانەت شیکردنەوەی دەروونیش کە "فروید" هێنایە ئارا، "پۆپەر" لای پەسەند نەبوو، بەڵکو وەکو مارکسیزم بە تیوریایەکی نازانستی دەیدایە قەڵەم.

یەکەمین کتێب کە "پۆپەر" بڵاوی کردەوە، بەم ناونیشانە بوو: (لۆژیکی دۆزینەوەی زانستی) کە بە زمانی ئەڵمانی نوسیبووی، ئەمەش زمانی خۆرسکی خۆیی بوو. ناونیشانی ئەم کتێبە لە وەرگێڕانە فەرەنسییەکەیدا جیاوازە و بەم شێوەیەیە: (لۆژیکی توێژینەوە). لەم کتێبەدا "پۆپەر" فۆرمەلەی تیۆریا بەناوبانگەکەی خۆی کرد، کە دەڵێت: (تیۆریایەك بۆ ئەوەی بەڕاستی زانستی بێت، پێویستە قبوڵی ئەوە بکات کە رەخنە بکرێت و بۆچوونەکانی رەتبکرێتەوە).

رەنگە لە سەرەتادا ئەم تیوریایەی "پۆپەر" ناکۆك بەرچاو بکەوێت، بەلاّم لە واقیعدا وانییە. تەنها تیوریا گشتگیر و نا دروستەکانن، کە ناکرێت رەتبکرێنەوە و رەخنەیان لێبگیرێت، لەبەرئەوەی لەسەر بەڵگەی دیار و بەرچاو دانەمەزراون. بۆ نمونە تیۆریاکەی "نیوتن" کە بۆ ماوەی دوو سەدە وەك تیۆریایەکی زانستی مایەوە، پاش ئەوە تیۆریای "ئەنشتاین" هاتە ئارا تا رەتی بکاتەوە، ئەمە چاکترین بەڵگەیە کە لەو بارەیەوە.

تیۆریای "نیوتن" تەفسیرێکی کۆنکرێتی سەبارەت بە گەردون پێشکەش کردوو، یاسا زانستیەکانی دەست نیشانکرد. دوای ئەوە بلیمەتێکی تر هات و تیوریایەکی دیکەی دۆزیەوە، ئەم تیۆریا نوێیەش جێگای تیۆریاکەی "نیوتن"ی گرتەوە، بێ ئەوەی بە تەواوەتی رەتی بکاتەوە. رەنگە دوای "ئەنشتاین" یەکێکی تر بێت و تیۆریاکەی رەتبکاتەوەو هەندێك کەلێن و کەم و کوڕی تیا بدۆزێتەوە و لە بەرامبەردا تەفسیرێکی وردوو تۆکمەتر دەربارەی جیهان بەردەست بخات، چونکە نە ژیان کۆتایی دێت و نەتیورەش دەوەستێت.

لێرەوە بە بۆچوونی "پۆپەر"، رەتکردنەوە و رەخنەگرتن لە تیۆریایەك بەڵگەی ئەوە نییە ئەو تیۆریایە هەڵەیە، بەڵکو بەڵگەی ئەوەیە تیۆریایەکی راست و دروستە، بەلاّم ئەگەر وا خۆی نیشاندا کە تیۆریایەکە سەر لە بەر راستە و تا ئەبەد وا دەمێنێتەوە، ئەوا مانای وایە ئەو تیوریایە لە خۆی دڵنیا نییە و بریتییە لە ئایدۆلۆژیایەکی یوتۆپی کە پەیوەندیەکی کەمی بە زانستەوە هەیە.

ئەمە ئەو تیوریا ئەبستمۆلۆژیەیە کە "کارل پۆپەر" نێوبانگی پێ پەیدا کردبوو، بەلاّم ئەوەی فەیلەسوفە فەرەنسیەکانی جاڕس کردبوو ئەم تیوریایە نەبوو، بەڵکو ئەو هێرشە توندە بوو کە "پۆپەر" کردبوویە سەر "هیگڵ و مارکس و ئۆگست کۆنت" و زۆربەشیان لە فەیلەسوفەکانی مێژوون.

ئەوان بڕوایان وابوو مێژوو لەسەر کۆمەڵێك رێسا و یاسای

دیاریکراو ڕێدەکات، ئەوەندەش بەسە کە ئەو ڕێسایانە بدۆزینەوە بۆ ئەوەی بتوانین پێشبینی جوڵە و داهاتووی مێژوو بکەین.

بەم شێوەیە "ئۆگست کۆنت" پێی وا بوو مرۆڤایەتی بە سێ قۆناغی یەك بە دوای یەکدا تێپەڕبووە:

–قۆناغی ئەفسانەیی یان غەیبی.

–قۆناغی میتافیزیکی.

–قۆناغی پۆزەتیڤی یان زانستی. ئەمەش بەرزترین و بالاًترین قۆناغی مرۆڤایەتییە.

بەلاًم "مارکس" پێیوایە سەرمایەداری دوای ئەوەی دەگاتە دوا قۆناغی گەشەسەندن و چەوساندنەوە، ئیتر هەرەس دەهێنێ و دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا جێگای دەگرێتەوە. بەمجۆرە هێزە دادپەروەر و ڕاستەقینەکانی مێژوو بەسەر هێزی چەوسێنەر و ستەمکاردا سەردەکەون.

هەرچی "هیگڵ"ە، ئەوا بڕوای وایە مێژوو بەرەو سەرکەوتنی ئەقڵ و مەعریفەی ڕەها دەچێت. لەناو هەموو ئەوانەدا "کارل پۆپەر" دێت بۆ ئەوەی بڵێت: (مەحاڵە بتوانین پێشبینی ئاراستەی مێژوو بکەین یان داهاتووی مێژوو بزانین. هۆکەشی ئاسانە، لەبەرئەوەی مێژوو بەسەر هەموو ئەگەرەکاندا کراوەیە. بۆیە ناتوانین لە تەنها ئەگەرێکدا دیلی بکەین. چەند کەس پێشبینی داهاتووی مێژوویانکردوو، کەچی مێژوو بە ئاراستەی تردا ڕۆیشت و پێشبینیەکەی درۆ دەرچوو).

بەلاًم ئایا "کارل پۆپەر" لە بە سوك سەیرکردنی فەلسەفەی "هیگڵ" و گەورە فەیلەسوفانی مێژوودا زیادەڕۆیی نەکردووە؟

ئایا "هیگڵ" نەیتوانی پێشبینی هەندێك ڕووداوی سەرەکی بکات، یان پێشبینی ئاراستەی گشتی بزاوتی مێژوو بکات؟ ئایا هێڵە پان و بەرینەکانی پێشبینیەکانی ڕاست دەرنەچوون؟

ئەی فەیلەسوف گەورە مانای چی، ئەگەر توانای ئەوەی نەبێت ئەو شتانە ببینێت کە خەڵکانی تر لەو سەردەمەدا نایبینن.

لە ڕاستیدا جیاوازی فەیلەسوف لە مرۆڤی ئاسایی ئەوەیە دەتوانێت پێشبینی ئاراستەی مێژوو بکات، دەتوانێت ئەوپەڕی شتەکان ببینێ بە هۆی ئەو هەستە ناوەکیانەوە کە هەیەتی. ئەمەش ئەو شتەیە کە "پۆپەر" تێی ناگات یان نایەوێت بە هێند وەریبگرێت. سەرەڕای گەورەیی تێزە و تیورەکانی "پۆپەر"، بەلاًم زوڵمی زۆری لە "هیگڵ" و هەروەها لە "مارکس و ئۆگست کۆنت"یش کردووە.

**سەرچاوە**

بیان الکتب، 2004/6/7.

**شانتال تۆماس**

کە هەموو شتێك باشبوو بارودۆخم تێکدەچێ

ژاك دوسانت ڤیکتۆر

لە فەرەنسییەوە: جەلال حەمید



"ئای هاوڕێی ئازیز! من ئازار دەچێژم و مەترسیەکی گەورەم لەو بارەیەوە هەیە" غوبێغ دولاشیسنای ئەم ووتەیە لە توێی

– یاسای گەمەی غێنواغ، Le – Regle dujeude Renoir رادەیەگەیەنیٚ کە لەمیانیەوە عەقلٚ و هەزری سەردەم کورتدەکاتەوە. ئێمە لە کۆمەڵێکی – چیژاوی، hedoniste –دا خووڕەوشتی ئازار چەشتنمان لە دەستداوە. ئازار مۆدیل و باوی نەماوەو خۆی حەشارداوە بەمجۆرە ئیتی هیلیسام لەم ڕووەوە ڕوونکردنەوەی زیاترمان دەداتیٚ کاتێکە کە دەڵیٚ: گەر خوازیاری لێکۆڵینەوەی زیاترین لەمەڕ مەسەلەی ماڤ ئازار چیژتن ئەوا دەبیٚ خۆمان بخەینە ژێر ڕکێفی و سەری بۆ دانەوێنین. سەرجەم سوودمەندان لە خراپەکاری سەردەم گەواهی بۆ ئەوە دەدەن و هەروەها شادی فرۆشان یاخود شێخە رۆحیە پەڕگیر و بیرتەسکەکان لایەنی مرۆڤدۆستی ئازار و ماڤ بەزەیی پیاهاتنەوەی چارەنووسی ڕەتدەکەنەوە. هەروەها دووایین وتاری شانتال تۆماس سەرنجی هەموو ئەو کەسانە ڕادەکێشیٚ کە خوازیاری قبووڵکردنی ئەشکەنجە و ئازارەکانیانن. وەك دەڵیٚ ئێوە دەزانن کە سکوت ڤێتزجیڕاڵد لەمبارەیەوە گووتویە: "گومانی تیادانیە کە تەواوی ژیان بریتیە لە پرۆسەی داڕووخان" نووسەر جەخت لەوە دەکات کە ئازار چەشتن مانای جۆرێك لە نامیلکەی بەراوردکار بە – ئارسمۆریەندی، arsmoriendi – دەبەخشیٚ کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا خزمەتی بە سۆفیە شکستخواردووەکان دەگەیاند. مێژوونووسی بەناوبانگ شانتال تۆماس تایبەتمەندێکی بواری سادیزمە و هەروەها ڕۆمانێکی لە بارەی دووایین ڕۆژەکانی ماری ئەنتوانێت لە ڤێرسای بەناونیشانی – ماڵئاواییەکان لە شاژن، Les adieux alareine– و وتارێکی گەلیٚ ڕۆشنبیرانەی بەسوود و لە یادەوەچووی مەدام دوژێنلیز نووسیووە کە تیا باس لە نەریت و ئەتیکێتی سەیر و نامۆی نێو کۆشکی شاهانە دەکات بۆ نموونە یەکێك لە پادشاکان لە کاتی پرسە ماتەمینەکاندا لە بری ڕەش پۆشاکی وەنەوشەیی لەبەردەکرد!

لە دووتوێی یەکەمین کاری پێشوویدا کە لە بارەی چۆنیەتی هەڵکردنە لەگەڵ ئازادییەکەی ووتارێکی نیمچە فەلسەفی و ئەدەبی دەنووسیٚ کە لە سۆنگەیەوە گەشتێکی تایبەتی کورت بە نێو جیهانی سەرسامکەری ئازارچێژتن دەکات. دوستۆڤسکی دەپرسیٚ. چی شتێك چاکترە ئاسوودەیی هەرزان بەها یاخود ئەو ئازارانەی کە نرخیان گران بەهایە؟ مەدام تۆماس وەلآمی ئەم پرسیارەی لە بیست و هەشت لاپەڕەی قەبارە بچووکدا دایەوەو سەرکەوتوو بوو تیایدا و هەروەها توانی قایلمان کات بەوەی کە ئازار چێژتن لەمەر ڕۆشنایی باسکردنی مەدام دوستاییێلی هاوڕێی کڵۆڵی ناغبۆن و دوکوسنانت و ژمارەیەکی زۆری دی بریتییە لە – وولآتێك کە بەردەوام دۆزینکاری تیادا ئەنجام دەدرێت – نووسەر سەدەی هەژدەیەمی ئازیز دەکاتە فریادڕەس و پەنا دەباتە بەر ساد و ژولی دولسپیناسی شەیدای پووچگەرایی و چەند نووسەرێکی هەرە تازەی وەك بارۆن ساشێغ ماسۆش و توونـد و تیژی ئازارە چێژراوەکانی و هەروەها بڕێکی زۆر لە کتێبی منالآنی وەك مەدام دۆسیگیوغ و هایدی و شوبنهاوەر و فریتز. وەك خۆی دەڵیٚ شانبەشانی ئەم خشتە زۆرەی باسمان کرد پەی بە شێوازەکانی ئازارچەشتن دەبەین یاخود بەشێوەیەکی

ڕوونتر پەردە لە ڕووی – خۆشیەکانی ئازار – هەڵدەدەین "بەڵێ، ژولی دولێسپیناس ڕایگەیاند مەدام تۆماس پێدەچێ ئەوەی لەبەر چاوگرتبێ کە جۆرە ئازارێك هەیە سیحراوی و شێوەیەکی هێمنی بە گیان دەبەخشێ و تەواوی ئامادەیی دەردەبڕێ لەوەی کە ئەم ناخۆشیە بە چاکتر بزانێ لەوەی کە بە خۆشی ناوزەد دەکرێ" لە وەلامی ئەوەدا پێمان ڕادەگەیەنێ ماسۆش (بەو پێیەی شانتال تۆماس بۆمان دەخاتە ڕوو لە ساد گەلێ کەمتر ئازار دەچێژێ. ساد توانی ژیانی بەشێوەیەکی ئەوتۆ ڕێکبخات کە نەیهێشت بچووکترین بڕی ناخۆشی لە دەسبدات): چی خۆشیەکە! خۆشەویستی بکەیت یاخود خۆشبویسترێی و هەروەها ئەم تروسکاییە چەند تار و ڕەشبینە لە خۆشیەکی لێوانلێو لەو ئەشکەنجانەی کە هەستیان پێدەکرێ لە کاتی ئالوودەبوون بە ئافرەتێك کە دەتوانێ پیاو بکاتە گەمە و بوکەڵەی نێو دەستەکانی. لە ڕاستیدا کاتێکە مەدام تۆماس باسی ئازار چێژتن دەکات. بە تایبەتی ئاماژە بۆ ئەو ئازارانە دەکات کە لە ناخەوە هەڵدەقوڵێن. ئەوانە ئازاری تەنیایی و یاخود دابڕانە لە خۆشەویستی و لە باسکردنی ئازارە هاتووەکانی دەرەوە خۆی دوور ڕادەگرێت چونکە ئەوە ئازاری ئەو پاڤیسەیە کە لە بواری خۆشەویستیدادووچاری نائومێدییەکی گەورە و گران دەبێت. ئەوە ئازاری پیاوێکی دەسلێبەردراو فریودراوە کە ڕۆلان پارت بە دادپەروەرییەکی بەرفراوانەوە باسی دەکات و مەسەلەکە لە بۆتەی چوار نموونەی سووکایەتیکارییەوە تاوتوێ دەکات: "وەك لە ئیرەکاریدا دەڵێ من چوار کەڕەت هەست بە ئازار دەکەم: لەبەرئەوەی ئیرەیی دەبەم، لەبەرئەوەی سەرزەنشتی بوونم دەکەم، لەبەرئەوەی ئەترسم کە ئیرەییەکەم کەسانی دی بریندار بکات و لەبەرئەوەی ڕێگە بە خۆم بەم ملکەچی پڕوپوچیەکانم بم: ئازار لە بێ بەریبوون دەژیم، ئازار لە بوونم بە دووژمنکار و بوونە شێت و بێ بەهابوون دەچێژم" لە ڕاستیدا ئەوەی بە ئەزمونی ئەم تەنگژانە تێنەپەڕێت ئەوە بەڕاستی ئازار بە بێبەهایبوونی خۆی دەچێژێ.. بەلام شانتال تۆماس بانگهێشتمان دەکات بۆ ئەوەی کەوا بە چاوی سووك سەیری ئەم ئازار چێژییە نەکەین و ئاماژە بۆ هێز و تینی ئەم ئازارانە دەکات کە لە لاوازی دوورمان دەخاتەوە و وەك ئەم خەمو خەفەتانەی کە پرۆست لە بارەیانەوە دەبێژێ: "ئێوە بۆ ماوەیەکی تەواو درێژخایەن هەڵوەستە بە ژیان دەکەن و هەندێ جار بۆ هەتا هەتایی". بەڵام وەك دڵنەواییکەرە بۆ هەموو لێکدابڕانێك و بۆ ئەوانەی "کە لەگەڵ یادەوەرییەکی بێهوودەدا دەژین" (کامۆ).

مەدام تۆماس – ڕاڕابوون، angoisse[*] – لە دەستەواژەی – بۆ هەتا هەتایی، pourtoujours – دەهێنێتەوە یاد کە مەترسیداری کەمترە لە دەستەواژەی – لە هەر کاتێکی دی، jamais plus – .پووچیە دوابەدوا هاتووەکانی ڕۆژگارەکان لە بۆتەی کارە ڕووخێنەرەکانیەوە هەڕەشە لە بوونی مرۆیی دەکات و کاتێکە خۆشەویستی لەناو دەچێ وەکو سەگێکی هار دەردەکەوێ. ئەم مەترسیە ئەشێ لە خودی ئازارچێژتن ترسناکتر بێت و لە شێوەی بێزارییەك خۆی بنوێنێ کە بریتی بێت لە نائامادەیی خۆشنوودی.

ئایـــا گۆشـــەگیر گـــەلێکی هاوشـان یەکدی هـاتوو بـەمجۆرە بەشـێوەیەکی بنـبڕ نابنـە هـۆی حەشاردانی بێ هیوایی؟ بە بیر و بۆچوونی بێهودە و نائومێدەکان: لەوانەیە ئازار و ئەشکەنجەکانیان مانـــای هـــەبێ. گـــەورەیی و شایســتەیی ئـەوەش بـۆ مـەدام تۆماس دەگەڕێتەوە کە لە ڕێگەی کورتکردنـــەوەی ئـــەم چـــەند ووشـەیە و پێشکەشـکردنی بـە پـــاڤێس ئـــەم پرەنســـیپەمان دێنێتـەوە یـاد: کاتێکـە ئـازار دەچـێژین بەهـەرحاڵ هەسـتی بێزاری دامانناگرێت!

### پەراوێز

*(angoisse، ڕاڕابوون): هەستێکی ئەو دیوکاری – ماورائی-یە کە بە گوێرەی فەلسەفەی هاوچەرخ و بە تایبەتی فەلسەفەی بوونگەرایی لە کاتی بیرکردنەوە لە بوون و نەبوون (عەدەم) سەر هەڵدەدات.

وەرگێـــر، فەرهـــەنگی مەنهـــەل، فەرەنسی – عەرەبی.

### سەرچاوە

Je vais mal, tout va bien
Le Figaro litteraire, Jeudi 12 Feurier, 2004.
لۆفیگـارۆی ئـەدەبی بـەرواری 12ی شووباتی 2004.

## سارتەر

لیفی نیل
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا



دانـەری ئـەم کتێبـە توێـژەر و فەیلەسـوف "لیفـی نیـل"ە کـە تێیـدا بەشـێوەیەکی زۆر کـورت سەرگوزشـتەی ژیـانی جـان پـۆل سارتەر دەگێڕێتـەوە، هاوکات لـە پاڵ ئەوەشدا هێڵـە گشـتییەکانی فەلسـەفەکەی دەخاتـــە ڕوو، ئاشـکرایە سـارتەر سـاڵی 1980 کۆچـی دوایـی کـرد و زیـاد لـە پـــەنجا هـــەزار کـــەس لـــە شـەقامەکانی پاریسـدا بەشـوێن تەرمەکەیـــەوە بـــوون و تـــاکو ئێســـتاش ناوەنـــدە ئەدەبییـــەکانی بەخۆیـــەوە سەرقاڵ کردووە.

سـارتەر سـاڵی 1905 لـە ژینگەیەکی بۆرجوازی بچوکی پڕ لـە ڕۆشـنبیر لـە دایـك بـووە. هـەر لەو دەمەوە کە کوڕی ئەفسەرێکی دەریاوان بووە، بەڵام ئەم هێشتا بچـوك دەبـێ بـاوکی دەمـرێ. ساڵی 1924 دەچێتە پەیمانگای مامۆســـتایانی بـــاڵا. لـــەوێ چـاوی دەکـەوێ بـە ریمـۆن ئارۆن و پۆل نیزان و کلۆد لیڤی شـــتراوس و هەنـــدێکی تـــر. دواتـر بـۆ ماوەیـەك لـە شـاری هارفەر وەك مامۆستای فەلسەفە دەستەبەکار دەبێت.

ساڵی 1938 کتێبی "هێڵنج" بلاوەکاتـەوە کـە ناوبـانگی پێـــدەردەکات. دوای ئـــەوە کتێبـەکانی و شـانۆکانی یـەك لـە دوای یـەك بلاوەکاتـەوە تـاکو ساڵی 1943 دەگاتـە سـەر کتێبـە بەناوبانگەکەی (الوجود و العدم). ســارتەر دوای ڕزگـــارکردنی فەرەنسـا لـە دەسـت داگیرکـەری نـازی دەرکـی بـەوە کـرد چـۆن فەلسـەفەیەکی گونجـاو گەڵاڵـە بکات کە بۆ ئەو سەردەمە بشێ. هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو دوای ســـاڵی 1945 فەلســـەفەی (بوونخـوازی – الوجودیـە) وەك ئـەوەی ئـاگر لـە پـوش بـەربێت بلاوبـووەوەو کتـێبی الوجـود و العـــدم بـــووە یـــەکێك لـــە بـــەناوبانگترین و گـــرنگترین کتێبێك کـە کتێبخانـەی فەرەنسا

بە چاپی گەیاندبێت. ئەو کات سارتەر وازی لە مامۆستایەتی هێناو خۆی تەرخانکرد بۆ نوسین و کتێب دانان. پاشان لەگەڵ سیمۆن دی بۆڤوار و مۆریس میرلۆبۆنتی گۆڤاری "قەیرانی تازەگەری"یان دامەزراند کە دواتر ناوبانگێکی گەورەی بەدەستهێناو بووە گۆڤاری رۆشنبیران لە فەرەنسا. ساڵی 1947 کتێبێکی بەناونیشانی "ئەدەب چییە" دەرکرد، تێیدا تیۆری ئەدەبی مولتەزیم گەلاڵە دەکات کە تەنها شیعر ناگرێتەوە.

لە سەرەتایی ساڵی 1950 تاکو 1956 سارتەر لە پارتی کۆمۆنیستی فەرەنسی نزیک بووەوە و لەگەڵ بزوتنەوەی ئاشتی کە نزیک بوو لە پارتی کۆمۆنیستەوە تێدەکۆشا و سەردانی یەکێتی سۆڤیەتی کرد و دوژمنایەتی خۆی بۆ بەرەی رۆژئاوا راگەیاند کە ئەمریکا سەرۆکایەتی دەکرد. بەلام رووداوەکانی هەنگاریای ساڵی 1956 وایکرد سارتەر لە پارتی کۆمۆنیست دوورکەوێتەوە بێ ئەوەی بەیەکجارەکی پەیوەندی خۆی لەگەڵ مارکسیەتدا بپچڕێنێت. بە پێچەوانەوە لە بیرکردنەوەیدا سەبارەت بە تیۆرەی مارکس زیاتر قوڵبووەوە و هەوڵیدا هاوکێشەیەکی ناوکۆیی لە نێوان وجودیەت و مارکسیەتدا بدۆزێتەوە، یاخود لە نێوان تاکگەرایی و کۆمەڵگەرایدا.

ساڵی 1960 بەشی یەکەمی لە کتێبە فەلسەفیە بەناوبانگەکەی "رەخنە لە عەقڵی جەدەلی" بلاوکردەوە، هەر لەو کاتەدا سارتەر چووە پاڵ تێکۆشان دژ بە ئیمپریالیزمی فەرەنسی لە جەزائیر و یارمەتی بەرەی رزگاریخوازی نیشتمانی جەزائیری دەدا و ئەو بلاوکراوانەی واژۆ دەکرد کە رۆشنبیران دژ بە ئیمپریالیزم بلاویان دەکردەوە.

بە کورتیەکەی ئەم پیاوە بە تەواوی پیاوی سەردەمەکەی خۆی بوو، هەروەها لەسەر هەموو ئاستەکان کەسێکی چالاک بوو، بەرادەیەك ناوبانگێکی وایدەرکرد کە هیچ نوسەرێ چ لە سەردەمەکەی خۆیدا و چ لە دوای خۆشی نەگەشتونەتە ئەو ناوبانگە.

**سەرچاوە**

بیان الكتب – 2004/8/5

## ئەوین یەکەمین پردی پەیوەندی نێوان جیهانی بینراو و جیهانی نەبینراو بوو

لە فارسییەوە: یاسین عومەر



(پاولۆ کۆیلۆ, یەکێکە لە پرخوێنەرترین و کاریگەرترین نوسەرانی ئەمرۆ)

لیژنەی داوەریی

خەلاتی بامبی ئەلمان, ساڵی 2001

هەندێ کەس بە کیمیاگەری وشەکانی دەزانن, هەندێکی تریش بە دیاردەیەکی جێگەپەسەندی زۆرینەی خەلك. بەلام هەر چی چۆنێ بێت, کۆیلۆ یەکێکە لە کاریگەرترین نووسەرانی ئەم سەدەیە. خوێنەرانی بێ ئەژماری ئەو لە 150 ولات, سەرباری کلتوورو بیروباوەڕەکانی خۆیان, ئەویان کردۆتە نووسەرێکی وەك

سەرچاوەی سەردەمەکەی ئێمە. کتێبەکانی بۆ 56 زمان وەرگێڕدراون, ئەمە جگە لەوەی کە بەردەوام لە ڕیزی کتێبە زۆرلێفرۆشراوەکاندا بوون, بەدرێژایی دەرکەوتنی, جێگەی قسەوباس و مشتومڕی کۆمەڵایەتی و کلتووری بوون. ئەو بیرۆکەو فەلسەفەو بابەتانەی لە بەرهەمەکانی ئەودا خراونەتەڕوو, کاریگەریی لەسەر زەین و مێشکی ملیۆنەها کەس لەو خوێنەرانە داناوە کە بەدوای دۆزینەوەی ڕێگای خۆیان و, ڕێبازو شێوازێکی نوێوەن بۆ ئەوەی پەی بە جیهان بەرن.

پاولۆ کۆیلۆ ئەدیب نییە, نووسینەکانی ئەو ئاڵۆزو تەژی نیە لە خوازە ئەدەبی و پێکهاتە هونەرییەکان. کۆیلۆ ڕکەبەری هیچ نووسەرێك ناکات, ڕەخنە لە بەرهەمی کەسانی تر ناگرێت, لافی داهێنانی شێوازێکی ئەدەبی نوێش لێنادات. کۆیلۆ پێڕەوی قوتابخانەی ئەوینە, سوود لە هەموو زانست و زانیارییەکانی مرۆڤایەتی وەردەگرێت, و لافی وتنی گوتەی نوێ یان ئەفراندنی شێوازی نوێ لێنادات. بەڵام دیسان خوێنەرانی کۆیلۆ ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر دەبن و یەکتری ڕادەسپێرن کتێبەکانی بخوێننەوە.

کۆیلۆ عیرفانێکی تازە وەرووەدەخات, عیرفانی کۆیلۆ, عیرفانێکی جەماوەرییە. بەڕای ئەو, جوولآن بەرەو مەبەست و ئامانج گران نییە, حەز و ویست و ئیرادەی دەوێت. ئەو لەو پێناوەدا هەڵە بچوکەکان بە قابیلی بەخشین دەزانێت و, تەنانەت جاروبار ئەم هەڵانە وەك نیشانەکانی ڕێگا دەناسێنێت. کۆیلۆ خواوەند بە ئەوینی ڕەها دەزانێت, جا ئەگەر خواوەند ئەوین بێ, کەواتە مرۆڤیش پێڕەوی نەریتی ئەوینە.

لە بریدادا دەڵێت:

((گەوهەری ئەفراندن تاکە. و ئەم گەوهەرە, ناوی ئەوینە. ئەوین ئەو هێزەیە کە جارێکی تر بەیەکمانەوە دەبەستێتەوە بۆئەوەی جارێکی تر ئەو ئەزمونەی کە لە ژیانگەلێکی جۆراوجۆرو لە شوێن و جێگەی جۆراوجۆردا پەراگەندە و پەرشوبڵاو بووە, کۆبکاتەوە.)) هەروەها دەڵێت:

((لە ئەویندا هیچ مەترسییەك بوونی نییە, دوایی خۆت ئەمە فێردەبیت. هەزاران ساڵە مرۆڤەکان بەدوای یەکدا گەڕاون و یەکتریان دۆزیوەتەوە.))

لە شوێنێکی تردا دەڵێت:

((ئەوین یەکەمین پردی نێوان جیهانی نەبینراوو جیهانی بینراو بوو کە هەموو مرۆڤەکان دەیانناسی. تاکە زمانی کاریگەر بۆ وەرگێڕانی ئەو وانانە بوو کە ڕۆژانە گەردوون فێری مرۆڤەکانی دەکرد.))

بریدا, چیرۆکی کچەلاوێکی ئیرلەندییە کە هەوڵدەدات فێری جادو ببێت. جادو کرۆکی سەرەکیی ئەم چیرۆکەیە. لەسەرەتادا, بریدا تێگەیشتنێکی دروستی بۆ جادو نییە. بۆ فێربوونی جادو, دەچێتە سۆراخی مامۆستایەکی جادوگەر, مامۆستای تەریقەتی خۆر کە نیشتەجێی دارستانێکە. بەڵام سەرەتا دەبێت بە سونەتەکانی جادو ئاشنا ببێت. لەم کتێبەدا کۆیلۆ دوو نەریتی جادوگەریی دەخاتەڕوو: نەریتی مانگ, و نەریتی خۆر. نەریتی مانگ یان "ویکا" هەمان جادوگەریی ئایینی کۆنە. بۆ دەسڕاگەیشتن بە حیکمەتی ئەم نەریتە, دەبێت مەشق وڕاهێنانگەلێکی قورس و دەستورگەلێکی جۆراوجۆر بەکاربرێت. ئەم نەریتە قوتابخانەیەکی نهێنیە, و بۆ وەرگیران تێیدا, پێویستە

چەندین قۆناغی نهێنی ببڕێت.
بریدا بەرەو لای ئەم نەریتە دەکێشرێت و فێردەبێت, چونکە بەهرەکەی بۆ ئەم نەریتە گونجاوترە. بەلاّم نووسەر, لە کۆتایی چیرۆکەکەدا, تەریقەتی خۆر بە ڕێگایەکی جیهانگیر دەزانێت بۆ بەدەستهێنانی جیهانی سەرمەدی. لە نەریتی مانگدا, بۆ یەکبوون لەگەڵ ڕۆحی جیهاندا, سوود لە دەستورو مەراسیم و ئەفسون و ڕاهێنانەکان وەردەگیرێت, دەبێت نیوەی شەو لە خەو هەستێ, مۆمێک دابگیرسێنێت و لێی ڕابمێنێ, دەبێت کاغەزەکانی یاری پۆکەر لەسەر مێزەکە بلاّوبکاتەوە و تیاندا قوڵبێتەوە و, ڕێز لە گیانی دارستان بگرێت. بەلاّم نەریتی خۆر, نەریتی هەزاران ساڵەی مرۆڤە بۆ بەدەستهێنانی مەعریفە. لە نەریتی خۆردا, تەنها یەک بنەما فەرمانڕەوایە: "متمانەکردن بە شەوی تاریکی بڕوا." تەنها یەک ڕاهێنانیش هەیە: "پاڕانەوە لەبەر دەرگای خودا, پاڕانەوەی بەدڵ و گیان."

بەپێی نەریتی مانگ بۆ کەسانێکە کە دەیانەوێت واز لە هەموو شتێکی خۆیان بهێنن و سەرتاسەری ژیانی خۆیان بۆ تێکەڵبوون و یەکبوون لەگەڵ گیانی جیهان تەرخان بکەن, نەریتی خۆریش, نەریتی خەڵکە, هەرکەسێک, لە هەر کارو پیشەیەکدا, ئەگەر کارەکەی خۆشبوێت, پێڕەوی نەریتی خۆرە. لە بەشێکی چیرۆکەکەدا, ویکا مامۆستای نەریتی مانگ دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە دواجار نەریتی خۆر جیهان دەگرێتەوە:

"لەبەرئەوەی سەردەمی موعجیزەکان, خەریکبوو جارێکی تر دەگەڕایەوە, هیچ کەسێک نەیدەتوانی خۆی لەو گۆڕانکارییانە بەدووربگرێت کە ئێستاودوا جیهان دەستی دەکرد تاقیکردنەوەیان. لەماوەی چەند ساڵێکدا, هێزی نەریتی خۆر خۆی بە هەموو ڕوناکییەکەیەوە دەردەخست. هەموو ئەوانەی کە بە ڕێگای ئەودا نەدەڕۆیشتن, هەستیان بە ناخۆشیی دەکردو ناچاری هەڵبژاردن دەبوون.

جادوگەریش نەریتی خۆری زۆر بە قورستر لە نەریتی مانگ دەزانێت:

((زۆر سەختوگرانتر بوو, لەبەرئەوەی سادەتر بووو شتە سادەکان هەمیشە لەڕادەبەدەر ئاڵۆز دەردەکەون. مامۆستاکانی ئەو هەر لەم دنیایەدا بوون و هەرگیز مەزنیی ئەو شتانەیان نەیاندەزانی کە دەیانووتەوە, چونکە لەبەر هۆیەک دەیانوتەوە کە زۆرتر بە گاڵتەجاڕ دەچوو. ئەوانە دارتاش, شاعیر, ماتماتیکزان, و بەکورتییەکەی هەموو ئەو خاوەنپیشانەی کە لە سەرتاسەری زەویدا, بوون. خەڵکێ کە ساتێک هەستیاندەکرد پێویستیان بە قسەکردن لەگەڵ کەسانی تردا هەیە تا هەستێک بۆ ئەوان ڕوونبکەنەوە کە باش تێنەدەگەیشتن و بەلاّم نەیاندەتوانی نەیدرکێنن, ئەمەش شێوازێک بوو کە نەریتی خۆر بۆئەوەی حیکمەتەکەی لەدەستنەچێت, بەکاریدەهێنا: غەریزەی ئەفراندن.))

شتێک کە بەرهەمەکانی کۆیلۆ لە بەرهەمی سەرجەم نووسەرانی تر جیادەکاتەوە, دەربڕینی چەمکە ئاڵۆزەکانە بە زمانێکی یەکجار سادەی وا کە تێگەیشتنیان بۆ هەمووان ئاسان دەکات. جا لەبەرئەوەی کۆیلۆ وتەنی, ئەم چەمکانە لەپێشترەوە لە مێشکی ئێمەدا هەبوون و ئێمە تەنها "بیرمان دەکەونەوە", بەرەو لایان کێشدەبین و لەبیرکەوتنەوەی دوبارەی ئەم چەمکە بنەڕەتیانەی مرۆڤایەتی چێژوەردەگرین. لە بریدادا, دۆزینەوەی "بەشەکەی تری"

هـەر مرۆڤـە, تـەوەری سـەرەکی چیرۆکەکەیە" چەمکێك کە ڕەنگە بتوانرێت لەگەڵ گریمانەی کۆنی نمونـــــەکانی "ئـــــەنیما" و "ئـــــەنیمۆس" (مێینـــــەی دەرون و نێرینـــــەی دەرون)ی کارل گۆستاڤ یۆنگ بگونجێنی. لـە شـوێنێکی کتێبەکـەدا ئامـاژە بەوە دەدا:

((لەسەرەتادا گومانی دەکرد و لـــە حاڵـــەتی گەڕانـــەوە بـــۆ ســـەردەمانی پێگەیشـــتنیدایە, گەڕانـــەوە بـــۆ خەونـــەکانی شـازادەیەکی ئەفسانەیی, کـە بـە شـوێن خـاوەنی تاکـە پـێڵاوی بلورین یان ماچکردنی شاجوانی نووســـتوودا کێـــوو دەریاکـــان تەیـــدەکات. هەمیشـــە گاڵتـــەی لەگـەڵ خۆیـدا دەکـرد: "چیرۆکی پـــەرییان بـــەردەوام باســـی "بەشـەکەی تـر" دەکـەن." ئـەم چیرۆکانە یەکەمین ئەزمونی ئەو بـوون لـە جیهانی جادوییدا کە ئێســـتا ئـــیتر لـــە تاســـەی بەدەستهێنانیدا دەسوتا."

ڕوبەڕوبوونـــەوەش لەگـــەڵ "بەشەکەی تر" کە لەم چیرۆکەدا, چارەنووسی بێئەملاوئەولای هەر کەســـێك و ئازادکەریـــەتی لـــە کۆتوبەنـدەکان, ڕەنگـە هـەر ئـەو "ڕووبەڕوبوونەوە لەگەڵ نەست"ە بێـت کـە یـۆنگ بـە ئاوەڵدوانـەی خۆشـکۆفایی و دوایـن قۆنـاغی پێگەیشتنی دەروونی دەزانی. لە بریدادا دەڵێت:

"واوەتـر لـە هـەموو شـتێك, ئێمە لەوە بەرپرسین کە لە ژیانی خۆمانـدا بـەلای کەمـەوە جارێـك, لەگەڵ بەشەکەی تری خۆمان کە بۆمـان دەردەکـەوێت, ببینەیـەك. تەنانـــەت ئەگـــەر بـــۆ چـــەند ســـاتیکیش بێــت" لەبەرئـــەوەی عەشقێکی وەهـا مـەزنی بـەدواوە دەبێـت کـە لـەوە دوای ژیانمـان ڕووندەکاتەوە."

لە شوێنێکیشدا دەڵێت:

"سەرتاسەری ژیانی مرۆڤ لە ســـەر زەوی, لەمـــەدا کـــورت دەبێتەوە: دۆزینـەوەی بەشـەکەی تر. گرنگ نییە کـە وا دەنوێنێـت بـەدوای حیکمـەت یـان پـارەو دەسـەڵاتەوەیە. ئەگـەر نـەتوانێت بەشـەکەی تری خـۆی بدۆزێتـەوە هەرچـی بدۆزێتـەوە کـەموکورت دەبێت."

پـاولۆ کۆیلـۆ لـە سـەرجەمی بەرهەمەکانیـدا سـوود لـەم زمانـە ڕەمزییـە وەردەگرێـت و لە هـەمان کاتـدا, بـە چەشـنێك دەنووسـێت کـە هـەر کـەس بتوانێـت ڕا و تێگەیشـــتنی تایبـــەت بـــە خـــۆی هـــەبێت و هاوتـــەریب لەگـــەڵ ئـــەو تێگەیشـــتنەیدا کاربکات.

### سەرچاوە

بریدا, پائولو کوئلیو, ترجمە: آرش حجـازی, چـاپ: یـازدەهم, 1382 تهران, موئسسە انتشارات کاروان.

## خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی ساڵی 2004 ژنە نووسەری نەمساوی

## Elfriede Jelinek

سەردەم



خـــــــەڵاتی نـــــــۆبڵی ئەدەبی ئەمساڵ درایە ژنە ڕۆمان نووســـی نەمســـاوی (ئەلفریـــدە یلینیـــك) کـــە20ی ئۆکتۆبـــەری ســـاڵی 1946 لـــە شـــاری مـــورزو شـــلاغ لـــە باشـــووری نەمســـا لـــە دایـــك بـــووە. خەڵاتەکـە بـەو تایبەتمەندیـەوە دراوە کـــە لـــە ڕۆمانەکانیـــدا "هـەڵقوڵانێکی دەنگـی موسـیقا"

هەیـــە. یلنیـــك خۆیشـــی هـــەر لـــە منداڵیـــەوە وانـــەی مۆسـیقی لـە پـەیمانگای ڤیـەنا خوێنـدوە. لـــــە رۆمانـــــە گرنگـــــەکانی (ئەوینـــــــــــــــدارەکان 1975، چەوسـاوەکان 1980، پیـانۆژەن 1983) ئـەم رۆمانـەی دوایـی کراوەتـە فیلمـی سـینەمایی و ساڵی 2001 بڵاوبۆتەوە. شایانی وتنە کە ئەم نووسەرە لەسەر ئاستی ئێمە ناوێکی نادیارە و تەنانەت عەرەبەکانیش هاواری ئەوەیانە کە تا ئێستا نەیان ناسیوەو پێشتر هیچیان لەسەر نەخوێندۆتەوە.

## دوا کۆچی فەیلەسووفی فەرەنسی ژاک دێریدا

سەردەم



ســـەر لـــە بـــەیانی ڕۆژی 2004/10/8 لـــە یـــەکێك لـــە نەخۆشـخانەکانی پاریسـدا، ژاك دێریدا فەیلەسووفی فەرەنسی لە تەمـــەنی 74 ســـاڵیدا و پـــاش ململانێیـــەکی ســـەختی لەگـــەڵ شێرپەنجەی پەنکریاسدا کۆچی دوایی کرد.

دێریـدای فەیلەسـووف بـەو میتـــۆدە ناســـرا کـــە بـــە "بونیادشـــــــــــکێنی– دیکۆنستراکشـــن" ناســـرا لـــە بوارەکـــانی فیکـــر و ڕەخنـــەی ئەدەبیـــدا پراکتیکـــەکانی بـــە دەرکـەوت. بونیادشـکێنی ئـەو ئاکـارە بـوو کـە دابڕانـی خـۆی لەگـەڵ میتافیزیکـدا ڕاگەیانـدو چـەمکی حەقیقـەتی بـە مانـا میتافیزیکیەکـەی تێکشـکاند و پرسیاری هزری بەرەو بوارەکانی زمان و لێکدانەوە برد.

دێریـدا لـە سـاڵی 1950دا چـووە خانـەی مامۆسـتایان لـە پاریس و پاشتر لە 1965دا بووە مامۆسـتا تیایـدا. کـاتێکیش لـە زانکـــۆی جـــۆن هـــۆبکنز لەواشینگتۆن، لە ساڵی 1966دا موحازەرەیـــەکی بـــەناوبانگی ســـەبارەت بـــە "ڕەخنـــە لـــە بونیادگـەرایی" گوتـەوە، ئـەوە بـــووە نوقڵانـــەی میتـــۆدی بونیادشـــکێنی لـــە ویلایەتـــە یـــەکگرتووەکانی ئـــەمریکادا و دواتـریش ڕۆشـنبیران بایـەخێکی زۆریان بەو تێزە دا.

لە کتێبە بەناوبانگەکانی ژاك دێریـدا "نووسـین و جیـاوازی، پـــەراوێزەکانی فەلســـەفە، لـــە پێناوی پۆڵ تسیلان"دا.

بە مەرگی ژاك دێریدا یەکێك لـە فەیلەسـووفە گـەورەکانی ئـەم ســـەردەمە کـــۆچ دەکـــات کـــە کاریگەرییـەکی گـەورەی لەسـەر دونیـــای فیکـــر و فەلســـەفە و ڕەخنـــەی ئـــەدەبی هـــەبوو تـــا ئێستاش هەر هەیە.

فایلی ژمارەی داهاتووی گۆڤاری سەردەم تایبەتە بە

"پۆست مۆدێرن"

و

"پۆست مۆدێرنیزم"

